حیکمەت محەمەد کەریم (مەلابەختیار)

# شۆڕشی کوردستان و گۆڕانکاریەکانی سەردەم

## «خەباتی شاخەکان یان ڕاپەڕینی شارەکان؟»

سوید: ۱۹۹۳
چاپی سێیەم/ ۱۹۹٤ (هەولێر)

# شۆڕشی کوردستان و گۆڕانکاریەکانی سەردەم

## «خەباتی شاخەکان یان ڕاپەڕینی شارەکان؟»

حیکمەت محەمەد کەریم (مەلابەختیار)

سوێد: ١٩٩٣

شۆڕشی کوردستان و گۆڕانکاریەکانی سەردەم
« خەباتی شاخەکان یان ڕاپەڕینی شارەکان؟ »
نووسینی: حیکمەت محەمەد کەریم (مەلابەختیار)
سوێد: ١٩٩٣.
پۆستەری بەرگ: خالد محەمەد
ISBN: 91-630-1558-7



ژمارەی سپاردنی بەکتیبخانەی نیشتمانی هەرێمی
کوردستان (١٢)ی ١٩٩٤

چاپخانەی ڕۆشنبیری هەولێر ١٩٩٣

پێشکەشە بە:

## یەکەم شەهیدی ڕاپەڕینی گەلەکەمان،
## بەختیار وەرێوەیی

# پێرست

# ڕوونکردنەوەی چاپی دووەم

ئەم کتێبە ساڵی ١٩٩٠ پێش هەرەسی شوورەوی‌و پێش داگیرکردنی کوێت‌و ڕاپەڕینی پارساڵی گەلەکەمان بە مەبەستی بێهودەیی خەباتی چەکداری‌و نەشونما کردنی خەباتی ڕاپەڕینی بەردەوام، نووسراوە. ناوەڕۆکی کتێبەکە گەلێک بابەتی تێدایە، هەندێک لە بابەتەکانی پێشبینی ڕووداوەکان بوون: حەقیقەتی ڕاپەڕینی کوردستان‌و عێراق‌و ڕووخاندنی ڕژێمی فاشی لەوپەڕی دەسەڵاتیداو لە خراپترین ڕۆژگاری نا ئومێدی هێزە چەکدارەکانی دوای ئەنفالەکاندا؛ ڕاگەیاندی سەرمایەداری لە شوورەوی‌و تەپینی کامپی ڕۆژهەڵات، بەستنەوەی چارەنووسی شۆڕشی ئەرتیریا بە خرۆشانی خەڵکی سەراپای ئەسیوپیا... هتد. پێمان‌وایە دوای نزیکەی سێ ساڵ لە نووسینی ئەو بابەتانە ڕووداوەکان وا ساغ بوونەتەوە بواری بۆچوونی جیاوازی جارانیان نەهێشتۆتەوە.

کتێبەکە لە چاپی یەکەمدا دەست کەمترین خوێنەر کەوت، بۆیە پێویست بوو چاپ بکرێتەوە. ئەوا لە فۆرمێکی نوێدا دەیخەینەوە بەردەم خوێنەری هۆشیار، پێشەکیش دەبێ ڕوونی بکەینەوە کەوا:

- ڕشتەی باسەکان دەستکاری کراوون‌و سەرلەنوێ ڕێکخراونەوە.
- یەک دوو بابەتی چاپی یەکەم دوای ڕووداوەکانی سەردەم لەچاپدانەوەیان پێویست

نەبوو.
- لەزۆر شوێن ووشەو جار جارە پەرەگرافیشمان دەرهاوێشتووە.
- لەکۆتایی کتێبەکەدا دوو رشتەی نوێمان لەسەر شۆڕشی چەکداری کوردستانو راپەڕینو ئەزموونەکانو جیهانی دوای جەنگی سارد، بۆ چاپی دووەم زیاد کردووە.
کورتیەکەی... لەچاپی دووەمدا سۆزی زەرووەتی حیزبایەتیو ململانێی سیاسەتی مەیدانی فەرامۆشکرانو هەوڵدراوە کتێبەکە دوای دەرکەوتنی رووداوەکانی جیهان، پابەندی گەوهەری باسەکەی بێت، ئەگەر خوێنەریش هەست بە گۆڕینی لە هەندێک بۆچوونی چاپی دووەم لەگەڵ چاپی یەکەمدا بکات، پێشوەخت دەڵێین: بەڵێ... دەبوو بیانگۆڕینو... بگۆڕێین!

مەلابەختیار
سوید: ١٩٩٢/١٠/٢٨

# بەرایی

بابەتەکانی ئەم کتێبە، وەرگۆڕانێکە (تحول) لە شۆڕشی درێژخایەنی شاخەکانەوە، بۆ ڕاپەڕینی شارەکان، پێشەکی پێویستە بڵێم: لەو کەسانە بووم ساڵەها باوەڕم بە سەرکەوتنی تەواوی شۆڕشی درێژخایەن هەبوو. لە سەرەتای سەرلەنوێ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی ١٩٧٦ی کوردستانە داگیرکراوەکەماندا، لە کوردستانی بەشی عێراقدا، هەتا سەرەتای هەشتاکانیش پێشمەرگەیەکی پارتیزانی سەرخستنی ئەو پێناوە بووم. بەڵام دوای ئەوە، ڕووداوەکانی عێراق‌و کوردستانە پێوە لکێندراوەکەی، بەرە بەرە بوونە زەمینەی چەکەرەکردنی ئەندێشەی نوێ لەسەر شۆڕشی چەکداری‌و ئایندەکەی! ئەم چەکەرە نوێیە هەتا دەهات نەشونمای دەکردو چمکە چینایەتیەکەی ڕۆدەچووە ناخی تێکۆشەران.

ساڵی ١٩٨١ بە دواوە، پەیتا پەیتا بڕوای سەرکەوتن بە شۆڕشی درێژخایەن کزترو... باوەڕی ڕاپەڕاندنی خەڵک لەناو کادرە هۆشیارەکاندا پتەوتر دەبوو، ئاکام ئەم دیاردەیە کرایە سیاسەتێکی گرنگی ئەو کاتە. هاوزەمان لەناو شارەکانی کوردستانیشدا، بێزاری خەڵک دژی ڕژێم قووڵتر دەبوو. دوای جۆشدان‌و نەخشەکێشان، ڕاپەڕینی شارەکانی کوردستان لە زستانی ١٩٨٢وە تەقییەوە: لەو هەلومەرجەدا، زۆربەی شارە گرنگەکانی کوردستانی گرتەوە: سلێمانی، کەرکوک،

هەولێر، هەڵەبجە، کۆیە، رانیە، قەڵادزێ، سەید سادق، شەقلاوە، چوارقورنە، بستەستێن، بنگرد، ژاراوە و توەسووران...تاد. وەلێ مـــخـــابـــن، راپەڕین تەنها لە کوردستاندا مایەوەو لە کوردستانیشدا بە هۆی گرفت‌و نەبوونی پشتیوانی‌و شەڕوشۆڕی ناوخۆی چینایەتی لاوەکی چینایەتی هێزەکانی گۆڕەپانەکەوە، راپەڕینەکە شۆڕشگێڕانە ڕێبەرایەتی نەکراو نەگەیەندرایە تاجی سەرکەوتن لەسەر نانی شۆڕش، بەمەیش هەلێکی مێژوویی گەورە لەدەست درا.

ئیدی... دوای دامرکاندنی راپەرینەکە، لەناو جەنگەی جەنگی عێراق - ئێراندا، لە سوران نشینی کوردستاندا رووداوی سیاسی‌و عەسکەری قوڵتر زاڵبوون. کە دەتواندرێ بگوترێ گۆڕینی ستراتیژی سیاسی - عەسکەریشیان لێکەوتەوە: چوون بەگژ ئێران، قرناقاو پشت‌ئاشان‌و... مفاوەزات، بەرەنجامی ئەمانەو لە سنورێکی دیاریکراودا سوڕانەوەی رووداوەکانی جەنگی عێراق - ئێران. هەروەها پووندانی هیچ جۆرە گۆڕنکارییەکی سیاسی - کۆمەلایەتی قوڵ لەباقی ناوچەکانی عێراقدا، هاوشانی دەستکاری نەکردنی نەخشەی سیاسی نێو دەوڵەتان لە ناوچەکەدا، هەریەکە لەو ڕاستیانە بە نۆرەی خۆیان کاری کاریگەریان کردە سەر بۆچوونە جیاوازەکانی ناو بزووتنەوەی گەلەکەمان. بێگومان پاشەرۆژی خەباتی چەکدارانە وەکو مەسەلەی عەسکەری گرنگ لەژێر تەوژمی ئەو کاریگەرییەدا زۆرتر کەوتە ناو مشتومڕی کۆڕو کۆمەڵ، گەلاڵەی ئەو مشتومڕانە دوو ڕوانگەی لە بۆتەی خەباتدا دروست کرد:

یەکەمیان: داخۆ شۆڕشی درێژخایەنی شاخەکان تاقە ڕێبازی سەرەکی سەرکەوتنەو باقی شێوەکانی خەبات دەبێ لە خزمەتیدابن...؟

دووەمیان: یان ڕاپەڕینی شارەکان سەرکەوتن دابین دەکات‌و پێویستە جەنگی پارتیزانی بخرێتە خزمەتییەوە...؟

ئەزموونەکان بابەتیانە دووەمین خاڵیان کردە ڕێبازی سەرەکی، گەرچی پەیڕەوانی خاڵی یەکەمیش لە ڕووی دەسەلاتی سیاسییەوە بالادەست بوون، لەو کەسانە بووم باوەڕم وابوو کە دۆخی کوردستان گەیشتۆتە:

(بێ پێچ‌و پەنا، دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمی فاشی عێراق بەرز دەکەینەوەو بێ گوێدانە دووری ڕێو سەختی بەدیهێنانی لە پێناویدا درێژە بە خەبات دەدەین. ڕێگای شۆڕشگێڕانەی

رووخاندنەکەشی تەنها ڕاپەڕینی کرێکارانو زەحمەتکێشانە، ڕۆشنبیرە شۆڕشگێڕەکان سەربازو ئەفسەرو کاسبکارو مامۆستاو گشت ئازادیخوازێکی ئەم وڵاتەیە، کە لە هەلومەرجی ئێستاماندا لە هەموو ڕوویەکەوە کوردستانو بزووتنەوە دیموکراتیە ڕەواکەی گەلی کورد دەورێکی گەورەی کاریگەری هەیەو پێویستە مارکسیە شۆڕشگێڕەکان تیایدا شۆڕشگێڕانە خەبات بکەنو بەرنامەی لایەنی کەمی کرێکارانو زەحمەتکێشانی تێدا پیادە بکەنو دروشمە پێویستەکانی کێشەکانی بەرز بکەنەوە.*

ئەو بۆچوونە چینایەتیە جیاوازانە، جەنجاڵێکی گەورەیان لەسەر وروژان، ڕۆژگارێکی دژوار بەسەر بران، هەتا زەبری زەمانە دوای شکستێکی عەسکەری خویناوی دیکەی کەم هاوتا لە مێژووی نوێی گەلاندا هەموومانی گەیاندە زەلیلی مەنزڵی ئاوارەیی. بەڵام ئاوارەییەکی دانەبڕاو لە ئاواتی ئایندە. ئەم باسەش، خزمەتێکە لەپێناوی بەدیهێنانی ئەو ئاواتە: ڕاپەڕینی بەردەوامو... ڕووخاندنی ڕژێمی فاشی عێراقو مافی چارەیخۆنووسینی گەلەکەمان.

## ڕووخاندنی ڕژێم...!

بێگومان، پاش ئەوەی ئەم جارەش بزووتنەوەی چەکداری ڕەوای گەلەکەمان، لەسەر لوتکەی کێوی بەرەنگاری دیسان هەڵدێرا، بەم ئێسکو پرووسک شکاوییەی پاش هەڵدێران، کە سەیری لوتکەکە دەکەینەوە ڕووخاندنی ڕژێم وەکو تراویلکە دێتە پێش چاو، هەرچەند دوای بکەوین نایگەینێ. بەڵام هەقە بزاندرێ هەرکەسو هەموو لایەک تەنها دەتوانێ لە ڕوانگەی خۆیەوە بڕیار بداتو هیچ لایەک ناتوانێ لەبری مێژوو، حوکمی مێژوو بدات.

مێژوو لە کورەی بڕیاری ڕەوای خۆیدا، دوور لە ئارەزووی ئەملاو سیاسەتی ئەولا، ڕقی پیرۆزی نەوەی ئایندە جۆش دەدات. ئەو نەوەیەی هەستو هەڵوێستیان،

---

* ڕۆژەی ئاڵای شۆڕش . ١٩٨٥/٦/٢.

لە پێگەیشتن و تێگەیشتنی شۆڕشگێڕانەدایە. ئەگەر دووریش بخایەنێ پوورکانی تۆڵەی گەلیان هەر دەتەقێتەوە... تەقینەوەیەکی ئەوتۆ، هەم ڕژێم دادەڕوخێنێ و هەم پاشماوەی بیری ڕەشبینی دادەشۆرێ.

هەرگیز ناشێ ڕژێمی فاشی، ڕژێمی تاوانەکانی: هەڵەبجە، بازێ، شێخ وسانان و گۆپتەپە، ڕژێمی بێ سەروشوێنکەری هەزاران کوردی بێتاوان... خاپوورکەری هەزاران گوندو شارو شارۆچکە، ڕژێمی دوژمن بە دیموکراسی و ئازادی، ناکرێ ڕژێمی وا وەکو بەرزەکی بانان لە حوکمی دوور ئەنگێوی مێژوو بۆی دەربچێ.

ئەگەر ڕژێمی وەکو بەعس هەتا هەتایە بمێنێ، ئیدی دەبێ ئەوەکانی ئایندە بەتەواوی بە بڕیارەکانی مێژوودا بچنەوەو نەفرەت لەو درۆیانە بکەن کە هەزاران ساڵە بەناوی یاسای مێژووەوە میللەتانی پێ گۆش دەکرێن.

# ١- کوردۆ ـ قارەمان

کوردۆ وشەیەکی دێرینەی زمانی کوردە، کە لەسەرەتای دارشتنی بابەتیانەی ژیانی کوردەواری، ناوی کوردی لێنراوە. واتای لێکدراوی کوردۆ لە کۆنەوە لە لایەن نەژادناسو زمانەوانەکانەوە بە (قارەمان)، شیکراوەتەوە. قارەمانیش هەتا ئێستا نازناوێکە، پێناسەیەکە، تەنها بە شەڕکەری ئازاو خەڵکی بوێر دەگوترێ. دوورنییە چاوگی وشەکە، یان خۆی ناولێنانی کورد بە وشەی کوردۆ، دۆخی شەڕوشۆڕی کوردستان نەبووبێ. ئەو دەمە کوردستان بەردەوام کەوتۆتە بەرپەلاماردانی داگیرکەرانو (کوردۆ)کانیش جەربەزانە بەرسنگیان لە دوژمنان گرتووە، تەنانەت لەشکرە (١٠)هەزار سوارییەکەی پێش زایینی زەینەفۆنیشیان هەراسان کردووە. جا ئەم هەموو شەڕوشۆڕە، کوشتو کوشتارە پڕ لە ئازایەتییە، کێ دەڵێ ئەوسا ناو نەنراوە (کوردۆ)و کە گوتراوە کوردۆ، ئێدی میللەتێکی ئازاو نەبەز، چاپوکو چالاک، بۆتە مایەی باسی دەنگو باسەکانی ئەو سەردەمە.

هەر وشەیەک لەسەر ڕووداوێک، پێویستییەک، خواستێک، ڕۆنراوە. جاری وا هەیە بچووکترین پێویستیو پێوەندی، وشەی بۆ ڕۆنراوەو دەنرێ، بۆیە ئاساییە بە ئازایەتیو ئازادیخوازیەکی کەم وێنەش، (کوردۆ ـ قارەمانی) بۆ هەڵبژێردرابێ.

قارەمانییەتەکەیش، وەنەبێ لەسەر تاوێرە بەردی نەژادپەرستی میللەتەکە

هەڵکۆڵرابێ. هەرگیز وانییە. چونکە هەمیشە میللەتەکەو سەر زەمینەکەی، لە دادگای مێژوودا، شکاتی لە پەلاماردەران کردووەو کەم جار شکاتی لێکراوە. کوژراوەو کەمی کوشتووە*، بۆیە: شانازی پێوە کردنی (کورد) هەڵەیەکی کوشندەیە بخرێتە باری سوکایەتی پێوەکردنی نەتەوەکانی دیکە. با کەمێ لەسەر ئەم ڕاستییە بڕۆین و زوخاوێکی خەفەتی مێژوو هەڵڕێژین:

زانا مێژوویەکان، بە زۆری لەوەدا هاو ڕان کەوا لە ئۆروپاوە، کۆچی گەورەی ئاری نەژاد، بەرەو سەرزەمینی ناوچەکانی ئامێزی چیاکانی زاگرۆس کراوە. ئەم ئاری نەژادانە، وا دیارە زۆرو دەوڵەمەند، بەهێزو ژیرتریش بوون لە خەڵکی ڕەسەنی ناوچە کۆچ بۆ کراوەکان، بۆیە توانیویانە خەڵکەکەیان لە نەژادی خۆیاندا بتوێننەوەو لە بۆتەی پرۆسەی تواندنەکەشدا، بەپێی لەدەستەدانی ڕوخسارە هیندو ئۆروپییەکەیان، چەندین میللەتی جۆراو جۆریان لێ بۆتەوە، یەکێ لەو میللەتانە، کوردە. لەگەڵ کاروانی کۆچ و کۆچباری ئارییەکاندا، پیشەسازی فلز و دروستکردنی کەرستەی جەنگی سەرەتایی و پێویستییەکانی ئەو زەمانەیان لە تەکە خۆیاندا هێناوە.چونکە ئارییەکان پێش جیابوونەوەیان لە باکوری ئۆروپا، ئاشنای ئاسن و ئاسنگەری بوو بوون. هەر بۆیە وشەی (ئاسن) لە چەندین زمانی هیندۆ ئۆرووپی، وێکدەچن وەکو: (ئاسن ـ کوردی)، (آهن ـ فارسی)، (ئیزن ـ ئەڵمانی)، (ئیرن ـ ئینگلیزی). دۆزینەوەی ئاسن و زانینی ئاسنگەری و داهێنانی پیشەگەری، یارمەتیدەرێکی کاریگەر بووە بۆ زاڵبوون و سەرکەوتنیان.

ڕووداني کۆچ نەژادییەکەیش، لە سەردەمێکدا ڕوویداوە کەوا ژیانی ئاژەڵدارێتی بایەخی زۆری پەیدا کردووەو پاوان و لەوەڕگای مەڵبەندی کۆچکردووەکان، شەڕوشۆڕی گەرمیان لەسەر قەرماوە، واتە: کۆچکردووەکان، بەشەڕو کوشتار دەرکراون و بەشەڕوشۆڕیش لە مەڵبەندی تازەیاندا، نیشتەجێ بوون، هەر ئەو دەم و سەردەمەش، بەشێکی ئاری نەژادەکە گەیشتونەتە کوردستان و بۆ هەمیشە نیشتەجێ بوون. دیارە هەڵکەوتنی لەباری جوگرافیاو ئاوو هەوا، بژێوو لەوەڕگا، لێرەوار، کانیاو و زێ و ئاوی زۆری کوردستان، ڕۆڵێکی ئیجگار گرنگیان لەو نیشتەجێ

---

* لێدانی گاورەکان لەسەر (باج)، لەسەردەمی میری بۆتان و بەشداری کردنی (کامەران بەدرخان) لەگەڵ عوسمانیەکان بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی یۆنانیەکان و کوشتنی مارە شەمعون بەدەستی سمکۆ لەتاوانە دزێوەکانی مێژووی نەتەوەی کوردن.

بوون و لەو ئاوێتە بوونەی خەڵکی ڕەسەنی سەرزەمینەکەو میوانە کۆچەرییەکاندا، گێڕاوە.

کۆچ و کۆچباری و ژیانی ئاژەڵداریتی، نابێ تەنها لایەنە ئابوورییەکەی لە بەرچاو بگیرێ، بەڵکو لایەنی گرنگی دیکەیشی هەیە، پێویستی بە توێژینەوەی دوورو درێژە، کە کورتییەکەی ئەمەیە:

هەڵکەندی نەژادێک بە شەڕو نیشتەجێ بوونیشیان لەسەر زەمینی نوێدا، دیسان بەشەر لە پێناوی دابینی ئابووری بوویی، پرۆسەکە پرۆسەیەکی مێژوویی ئاسان نەبووە، بگرە تراژیدی سەردەمی سەرەتای سەقامگیر بوونی نەژادەکە لەسەر زەمینی نوێیاندا بووە. ئاژەڵداریتی بە پێی سەودای کالا بە کالا، پێش داهێنانی دراوی ئەو سەردەمە، ڕادەی بەرزی ژیان بووە. بەو بەرووبوومەی ئاژەڵداریتی، توانراوە پێویستی و پێداویستی خێڵە کۆچەرییەکان ئاسانتر لە هۆزە نیشتەجێ بووەکان، دابین بکرێ. بەبێ ئەوەی ئاژەڵدارەکان بە ئەندازەی نیشتەجێییەکان، پێویستیان بە ژمارەی هێزی کارو کارکردن بوویی، (تا ئێستایش وایە) هۆزە نیشتەجێکان زۆرتر پێویستیان بە جەنگاوەرو سوارچاک و چەک بووە. چونکە هەردەم کۆچەری مەترسی چەتەو جەردەو شەڕوشۆڕی هەبووەو هەیە.

ئەم دۆخە کۆمەڵایەتییە جیاوازو لەبارەی کۆچەرییەکان، فاکتەرێکی ئێجگار گرنگ بووە، خێڵە کۆچەرییەکان، هێزی مرۆیی زۆریان کە بێ ئیش یان کەم ئیش بوون، چەکدار بکەن و بۆ پاراستنی پاوان و ئاژەڵو زێڕو سامانیان بەکار بهێنن.

"شتێکی سروشتییە کە پەرەپێدانی پەروەردەی مەڕو مالات پاڵ بەو میللەتانەوە بنێ لەوەرگا بدۆزنەوە، واتە بگوێزنەوە. بەو شێوەیە ئەم میللەتانە لەگەڵ میللەتەکانی نیشتەجێدا کەوتنە ململانێ. بۆیە دەبینین میللەتانی شوانکارە هەمیشە میللەتی جەنگاوەر بوون"<١>

بێگومان، ئەم بارە سۆسیۆلۆژییە دێرینەی کوردەواری لە کوردستاندا، یارمەتیدەرو هاندەرێکی چارەنووس پارێزی نەتەوەی کوردو نیشتمانەکەی بووە بەرامبەر تێکڕا داگیرکەرە بێگانەکان. ئەگەر ئەم ڕاستییەش بە بەڵگەی وردترو زانستیتر، لە لایەن لێکۆڵەرانەوە بسەلمێندرێ، پێمانوایە ئیدی ڕاستییە زانستییە

---

<١> جان بابي ـ القوانين الاساسية للاقتصاد الرأسمالي، ترجمة لجنة من: شريف حتاتة، محمد خليل قاسم، سعد كامل، حليم طوسون. ص:١٤

گەلاڵە نەکراوەکەی مێژووش لەسەر ئەوەی کە:* چۆن چۆنی کورد، وێڕای نەبوونی قەوارەی سیاسی سەربەخۆی تایبەتی خۆی، توانیویەتی خۆی و خاکەکەی، زمان و نەریتەکەی، کەلەپوور و کلتوورەکەی، بەرامبەر ئەو هەموو کوێرەوەرییە، نەهامەتییە، قڕوقاتییە، کوشت و تالانکارییە، بپارێزێ و لە بەرامبەر لەشکرکێشی: دەوڵەتان، ناوداران، ئاینەکان و مەزهەبەکاندا، بوونی نەتەوایەتی و ناسنامەی نیشتمانەکەی لەدەست نەدا. ئەوانە هەموو کە پارێزراون هەروەها کارێکی ڕەوتەنی یان ڕێکەوت و بەبێ بناغەی ئابووری و کۆمەڵایەتی نەبووە کە بێگومان هەڵکەوتی جوگرافی و پێکهاتنی سروشتی میللەتی کوردیش هاوشانی ئەو هۆیە ئابوورییەی باسکرا، ڕۆڵی گرنگیان لەمان و پاراستنی نەتەوەی کورددا گێڕاوە.

گاڵتە نییە لەو مێژووە دوورو درێژەدا لە بەرامبەر ئەو هەموو دوژمنە جۆراوجۆرەدا کە چەندین نەتەوەی خاوەن قەوارەو شارستانیەتی گەورەو لەشکری زۆروزەبەندی وەکو: سۆمەرییەکان، ئەکەدییەکان، بابلییەکان و فرعەونەکان، ئارامی و فینیقیەکان، تواونەوەو ئاسەواری شارستانیەتیان تەنها لە مۆزەخانەدا مابێ، کەچی کورد لەوانیش زیاتر پەلامار درابێ و چەوسابێتەوەو کوژرابێ و دزرابێ، سووتێندرابێ و داگیرکرابێ. سەرەڕای ئەمانەش مابێ.

لێرەدا:

سەری گری کوێرەکەی مێژوو دەگرینە دەست و بە خەفەتەوە دەڵێین: میللەت و نیشتمانێک، شەڕو بەرگری بووبێتە بەشێکی گرنگی مانی و بەسەریەکەوە، چارەکە چەرخێکی ڕۆژگاری بێ شەڕوشۆڕی قورس نەبردبێتە سەر. چەند مایەی پەژارەیە ئەو هەموو ئەزموونە پڕ لە جەنگ و جەنگینەی بەرەنگاری بە فیڕۆ ڕۆیشتبێ و هەتا ئێستایش مێژوونووسانی، لێکۆڵەرانی، سیاسی و عەسکەرییەکانی، ڕۆشنگەرو ڕۆشنبیرەکانی، تەنانەت تاکە کتێبێکی عەسکەری تایبەتیان لەسەر ئەو ڕابردووە بە خوێن تۆمارەی نەنووسیبێ، ئەو هەموو ئەزموونە، هەزاران هەزار جەنگە، ڕاپەڕین و شۆڕش و بەرگرییە، پشتگوێی تەمەڵان خرابن و خۆرکەی بێ خاوەنی لێدابن.

ئەگەر سەیری کتێبە مێژووییەکانی کورد بکرێ لە چاو باقی بەشەکانی دیکەی ڕووی ژیانی میللەتان، زۆرتری لەسەر نووسراوە... بەڵام هیچ لەسەر مێژووە عەسکەرییەکەی نەنووسراوە. ئەوەی نووسراویشە بەرهەمی کەمبایەخی ئەوتۆیان تێدایە ئەگەر بەراوردیان لەگەڵ جەنگ و شەڕوشۆڕەکاندا بکرێ، دەبێ بڵێین: لە هەوارگەی مێژووی کورددا سەیرە! دەستنووسی کۆنە مەلاو مەشایخان لە گۆشەی

مزگەوتەکان‌و هی سۆفیەکان لە تەکیەو تاقی خانەقاکان، گەلێ دزرراونەتەوە، هەندێکی باشیشیان بە پێشەکی لەسەر نووسینی نووسەرو مێژوونووسی ناودار، چاپ‌و چاک کراون، (دیارە ئەمەش خزمەتێکی بەرچاوە) بەڵام خەفەتەکە لەوەدایە کەس ئاوڕی لە خوێنی ڕژاوی هەزاران هەزار خوێنەختکردوو بەختکراوی شەڕو شۆڕەکان، لە ڕووی عەسکەریەوە، بۆ کورد کە تا ئێستاش هۆگری ڕووداوی عەسکەری‌و چەک‌و تفەنگە، نەداوەتەوە.

لێرەدا، سەرزەنشتی ئەو زاناو دانایانەی کورد کە لە بەرەبەیانی سەپاندنی دەسەلاتی بە شەڕی ئیسلام‌و داگیرکردنی کوردستانەوە، لە خزمەتی ئاینەکەدا بوون، هەتا سەرهەڵدانی ڕۆشنگەری کورد، ناکرێ ئەوان بڕوایان بەوە بووە هەتا مزگەوت وستابێ، ماڵیان پێ حەرام بێ! تەنانەت ئەمانە هێندە لە خزمەتی ئیسلام‌و ئیسلامگەریدان بوون، هەزاران دڵسۆزی خەڵک‌و خاکی کوردستانیان بە کافری موتڵەق زانیوە، چونکە بەرگریان لە بڕواو بوونی ئەو کاتەی کوردەواری کردووەو خۆیان کردۆتە قوربانی، ئێستاش دەبێ گۆڕەپانەکانیان لە دۆڵ‌و دەشتەکانی کوردستاندا بەرد باران بکرێ‌و پەڕۆیەکی سەوز ببەسترێتە داری داروشەخسی ئەو فەرماندانەی فەرمانی داگیرکردنی کوردستانیان خراوەتە ئەستۆ! ئەمانە کە باوەڕیان وابوو ئیدی نابێ بڵێین (دینەوەری) و (ئامێدی) و (شارەزووری) و (ئیبنو خەلەکان) و (ئیبنو سیرین) و... تا. بۆ بە عەرەبی خەونامەو جۆرەها تەفسیری ئاینی‌و مەزهەبیان نووسیوە، ئەوانە هەر حاجی قادری کۆیی کە خۆیشی حاجیەکی موسڵمانی گەورە بووە، ناسیونی‌و کردونیەتە ئەو (مریشکەی جوجکەی مراویان هەڵهێناوە). کەواتە ئەوانە موبارەکی ئیسلامن‌و بڕاوەتەوە. بەڵام بە هیچ چەشنێ پاش دەرکەوتنی ڕۆشنگەری کورد، نووسەران‌و نوودارانی (هیچ نەبێ هەندێکیان) قەت لەم سەرزەنشتە ڕزگاریان نابێ بێ‌و زۆری ئەوانە، ئەگەرچی جاروبار لە دوو توێی کتێبەکانیاندا سەر گوزشتەی جەنگ‌و شەڕی خوێناویان گێڕاوەتەوە، بەڵام وەکو بابەتی تایبەتی، لێیان نەکۆڵیوەتە، شێوەی جەنگیان لە کوردستاندا لێکنەداوەتەوە.

هەندێ لەو ڕۆشنگەرانە، جگەلە دەستی باڵایان لە مێژوونووسیندا، خۆشیان عەسکەری پایە بڵند بوون‌و لەناو ئیمپراتۆرو دەوڵەتانی داگیرکەریشدا گەلێ شەڕیان لە جەنگی گەورەدا کردووەو دیوە. هەندێکیان ڕێبەری ڕاستەوخۆی بزووتنەوە چەکداریەکانیش بوون، یان لەتەک ڕووداوە خوێناویەکاندا ژیاون،

جەنگاون، تەزاون، شکاون. بۆ نموونە جەنەراڵ شەریف پاشا، ڕێبەری هارمانی ڕاپەڕینی گرنگی ساڵی ۱۹۲۰ی کوردستانی بەشی تورکیا بووە. ڕاستە یاداشتی خۆی نووسیوەو تازەگیش دەکەوێتە بەردەست خوێنەران، بەڵام بابەتی عەسکەریو لێکۆڵینەوەی عەسکەریو بگرە گوتارێکی عەسکەری تایبەتیشی لەسەر ئەو هەموو ڕووداوە عەسکەریانە کە لە ناویاندا ڕاستەوخۆ ژیاوە، نەنووسیوە. ئەمین زەکیو تۆفیق وەهبی بەگ دەستی نووسینی باڵاو خزمەتی مێژوویی‌و زمانەوانی گرنگیان هەیە بەڵام خۆیان عەسکەری گەورە بوونو ڕۆڵێکی گەورەشیان لە جەنگەکانو دامەزراندنی سوپای عێراقدا گێڕاوە، کەچی یەک بەرهەمی عەسکەریان لەسەر دۆخی عەسکەری کوردستان، چ هی دوژمنانو چ هی میللەتەکە، نەنووسیوە. لایان ئاسایی بووە لە دامەزراندنی سوپای عێراقدا بەشداریان بکەنو هەمان سوپاش، بێ پەروا چووبێ بە گژ ڕاپەڕینە چەکداریە ڕەواکانی کوردستاندا، بەڵام خۆیان لە قەرەی لێکدانەوەی باری عەسکەری ڕووداوەکانی کوردستان نەداوە. بۆ دوژمن سوپای سەرکوتکەر سەقامگیر دەکەن بەڵام لاپەرەیەکیش لەسەر ڕاپەڕینی چەکدارانە بۆ میللەتەکەیان وەکو بابەتی عەسکەری نانووسن.

ناتوانین بڵێین: ئەمانە بێتوانا بوون، ئاگایان لە زانیاری عەسکەری نەبووە. ئەمەیان مەحاڵە، چونکە دەوڵەتێکی ئیمپریالیستی بە خەڵکی بێتوانا سوپا بۆ وڵاتێکی ژێردەستەی پڕ لەکێشە وەکو عێراق دانامەزرێنێ. هیچ لێکدانەوەیەک بۆ نەنووسینی بابەتی عەسکەری لەسەر ڕاپەڕینو بزووتنەوە چەکداریەکانی کوردستانو دوژمنانی ، ڕاست نییە، جگەلەوە ئەوانە خەڵکانی ڕاستڕەوی پڕۆ ئینگلیزی بوون. ئەمەش لە ڕووی سیاسیو عەسکەریەوە ڕاستەوخۆ لە خزمەتی ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستاندا بووە.

دوا بە دوای ئەوانە، لەسەردەمی ڕاپەڕینە چەکداریەکەی ناوچەکانی بارزانو کۆماری مەهابادیشدا، هەمان دیاردەی بێ بابەتی عەسکەری دەبینینو لەوانیشدا دیسان کورد بەشێوەیەکی خۆڕسکی جەنگیوەو عەقڵیەتی خێڵخوازی لە ناوچەکانیاندا ڕۆڵی لە نەخشەی عەسکەریاندا گێڕاوە، زۆر کەم ڕێ بە ئەفسەرەکان دراوە ڕۆڵی عەسکەری باشیان بگێڕن، بەداخیشەوە چوار ئەفسەری قارەمانیان شەهید کرانو نەیانپەرژایە سەر خزمەت کردنی مێژوویی عەسکەری ئەزموونەکانی خۆیانو سەردەمەکەی کوردستان. (میرحاج ئەحمەد)یشیان هەتا ئێستاش ماوەو دەستی لەسەر کڵاوی کەلاکەوتن دانەگرتووە. ئیدی نازاندرێ باشە ڕۆژی چۆن

دەبێ؟
لەوانیش گەڕێین‌و زیاتر لە مێژووی نوێمان نزیک بکەوینەوە؛ شۆڕشی ئەیلولیش لەم بارەوە مەلولە. ئەم شۆڕشە لە بارێکی پێشکەوتوودا حیزبێکی بەتوانا ڕێبەرایەتی دەکرد. سەدان کەس‌و کسایەتی بەتوانای سیاسی‌و عەسکەری هەبووە، لەوانە: دەیان ئەفسەرو دەیان فەرماندەی قاڵبووی شۆڕشەکە؛ بە درێژایی چواردە ساڵ بەردەوام لەناو گەرمەی ڕووداوەکاندا ژیاون، جەنگاون، گەڕاون. جۆرەها شەڕیان دژی جۆرەها دوژمن کردووەو دیوە. داوودەزگای چاپ‌و چاپخانەیان لەبەردەستدا بووە. دەستیشیان بە ئاسانی گەیشتۆتە چاپخانەی دەوڵەت‌و هەندەرانیش، کەچی شۆڕشەکە کراو پەکیش خرا، ئەوساو ئێستاش، نەمانبینی کادرە عەسکەری‌و سیاسیە - عەسکەریە بەناوبانگەکانی شۆڕشی ئەیلول کە زۆربەشیان زیندوون، (تەنانەت پەنجەیەکیشیان سەقەت نەبووە) نامیلکەیەکی عەسکەری لەسەر ڕووداوە عەسکەریەکان، چۆنیەتی شەڕەکانی ئەو شۆڕشە بنووسن: هەندێکیان بازرگانی گەورەیان لێدەرچووەو هەندێکیان پەنایان بردۆتە وڵاتێکی خۆش‌و بە خۆشیش دەژین‌و ژمارەیەکی بەرچاویشیان لە سێبەری بەعسدا بەسەر شۆڕی‌و نیمچە سەرشۆڕی ژیان دەبەنەسەر، بەشێکیشیان لە سەنگەری بەرەنگاریدا ماوون، بەڵام هیچیان کارساتەکانی شۆڕشی ئەیلول‌و ئەزمونە زەنگینەکانی ویژدانی نەبزواندوون‌و نەبزووتن بۆ نووسینی کتێبێک!

سەیرتریش لەوانە، هی وایان هەبووە لێپرسراوی بەناوبانگ بووەو لە گەرمەی شۆڕشی ئەیلولدا فەرماندەی عەسکەری دیاری شۆڕشەکە بووە، کەچی (فێربوونا زمانا کوردی بە لاتین ـ . ۱۹۶۳/۹/۱)*دا لە خوێناویترین دۆخی کوردستاندا دەنووسێ بەڵام ئەرکە ڕاستەقینەکەی‌و پیشە عەسکەریەکەی فەرامۆش دەکات کە بێگومان ئەوسا شۆڕش پێویستی بە بابەتی عەسکەری بووە نەک فێربوونا زمانی لاتینی، کە لە بەیانی ئازاریشدا فێربوونی لاتینی بۆ قوتابخانە کوردییەکان نەچووەسەر. خەڵکی وا بە کردەوە بەرپرسیاری عەسکەری هێزو هەزاران پێشمەرگەیان قەبوڵە، دەیانبەن بۆ شەڕگەو شەڕ. نەخشەو پلانی هێرشیان بۆ دەکێشن، بەکوشت دەدەن‌و پێیان دەکوژن، دەبنە مایەی وێرانی‌و سووتان‌و

---

* نووسەری ئەو کتێبە، بەڕێز (عەزیز عەقراوی)یە. کە سەرکردەیەکی عەسکەری ناوداری شۆڕشی ئەیلولە.

کارەسات، یان سەرکەوتن‌و دەستکەوتیشیان دەبێ بەڵام ناتوانن یەک لاپەڕەش لەسەر زانستی جەنگ‌و زانیاری جەنگین‌و ئەزمونی شۆڕشی چەکداری گەلان بنووسن‌و توانایان نییە لە کۆڕو کۆبوونەوەیەکدا سەعاتێ بابەتی عەسکەری باس بکەن.

١/١- ئەم شۆڕشە

ئەزمونەکەی دەچەقێتە چاوی مێژوو... بە حیساب سەرلەنوێ هەڵگیرساندنی شۆڕشەکە لەسەر ڕێبازێکی نوێ بە دەرس‌و پەند وەرگرتن لە ڕابردوو (بەتایبەتی شۆڕشی ئەیلول) دەویستر باشتر بێ: هەڵەکانی پێشوو دووپات نەکرێنەوە ئەمجارەیان شۆڕشەکە نوێ بێ لە هەموو بارێکەوە، بۆیە:

هەق بوو نوێبا لە ڕووی عەسکەریشەوە، لە نووسین‌و پەروەردەو قاڵکردنی عەسکەری شۆڕشگێڕانەوە. بەڵام ئەمیش کورتی هێنا. ئەگەر هەلومەرجەکەش بابەتیانە گەلێ ڕووداوی عەسکەری سەپاندبێتە سەر ڕەوتی شەڕەکان‌و شێوەی پێکهێنانی شۆڕشەکەش، هەر ئەو هەلومەرجەش چەندین لێپرسراوی عەسکەری ناوداری دروست کردبێ‌و بە هۆی گەلێ هۆی جوگرافی‌و کۆمەڵایەتی‌و نەتەوایەتی‌و شەخسییەوە، دەرکەوتبن‌و دەرخرابن، ئازایەتی‌و ئامادەیی عەسکەری باشیشیان لێ سەلما بێ (بەتایبەتی لە مەیدانەکانی نەبەرد دا) ئەمە ئەوە ناگەیەنێ بەڕاستی توانراوە بابەتە تایبەتمەندییەکانی خەباتی چەکداری شۆڕشی کوردستان گەڵاڵە بکرێ‌و بکرێتە کەلەپورێکی پێشمەرگانەی میللەتێکی ژێردەستە، وەکو شۆڕشە درێژخایەنە خاوەن کەلەپورە عەسکەریە گەورەکانی جیهان کە هیچیان لە شۆڕشی کورد درێژتریان نەخایاند، کەچی ئەوان ڕزگار کران‌و ئێمەش لە شۆڕشی نوێدا سەرلەنوێ ژێرخراینەوە!

دیاردەی دیاری پێڕەو نەکردنی ئەم ڕاستیەش لە کەم بایەخدانەبە: لێکۆڵینەوەی عەسکەری، پەروەردەی عەسکەری، نووسینی عەسکەری‌و پێگەیاندنی ڕێبەری کارامەی عەسکەری. ئێستاش بنچینەکانی جەنگی بەرەیی‌و پارتیزانی، جەنگی بزۆز، جەنگی پەلامارو بەرەنگاری ستراتیژی، سەنگەر لێدانی تۆکمەو ژێرزەمین هەڵکەندنی پتەو... تاد. زۆر کەم دەزاندرێن‌و کەمیش پێڕەو دەکرێن. لەمەدا مەبەست ئەوە نییە عەقڵیەتی سیاسی زاڵبووەو بایەخ نەدراوە بە پەروەردەی عەسکەری. یان نامانەوێ ئەو هەموو ئازایەتی‌و سەرکەوتنە عەسکەرییە، فیداکارییە، جەزرەبەی کاریگەر لە دوژمن وەشاندە، لەبەرچاو نەگرین، نە ئەوبان‌و

نە ئەمیانە. مەبەست تەنها زاڵبوونی عەسکەرتاریەتیکی دواکەوتووانەیە، عەسکەرتاریەتیک بچووکترین زانستی عەسکەریشی تیا پێڕەو نەدەکرا.

لەسەرانسەری کوردستاندا پاش ئەو هەموو جەنگە بەرەییە بێوێنە خوێناوییە (ئەنفالەکان) بەسەر کوردستاندا سەرخران، بۆردومانی سەنگینو تۆپبارانی بێوێنە لە ڕابردوو ڕوویاندا، مخابن، ئێستاش لەسەر شاخە بڵندەکانو شوێنە بایەخدارەکان، تەنانەت لە دەوروبەری بارەگاکانیشدا سەنگەرو ژێرزەمینێکی پتەوی بەرگەگری تۆپی قەبارە قورس دروست نەکراوە (بەدەگمەن نەبێ). ئەمە بە لایەنی کەمەوە عەقڵیەتی پاشکەوتوانەی عەسکەری هێزە جڵەو لەدەستەکانی کورد دەردەخات، تەنانەت عەقڵیەتەکە لە هی سەردەمی سەرەتای چەرخی نۆزدەهەمی ڕاپەڕینە چەکداریەکانی کوردیش دواکەوتووتر بووە. لەو زەمانەدا، پاشای کۆرەو بەدرخانو ڕێبەرانی دوای ئەوانیش، بەپێی شارەزاییان لە تۆپو چەکی سنگینی دوژمن، قەڵای بەرزو سەختی وایان دروستکردووە دەیان ڕۆژ بگرە چەندین مانگ بەرگەی بۆردومانیان گرتووە. ئێستاش ئاسەواری قەڵاکانی میرەکان ماوون کە بۆ زەمانی خۆیان چەند قایم بوون. بەڵام لەم شۆڕشەدا، نەک حیساب بۆ تۆپی قورسو فڕۆکەی ڕوخێنەری هاوچەرخ نەدەکرا، بەڵکو گاڵتەش بەوانە دەکرا کە خۆیان لەبەر بۆردومان پەنا دەدا. هەمووشی بۆ نەبوونی پەروەردەی عەسکەریو سیاسی دەگەڕایەوە.

ئێستاش زەحمەتە زۆربەی زۆری کادرە عەسکەریەکانی کورد بزانن قورسایی ئەو تۆپو بۆمبو ڕۆکێتانەی بە زۆری لە کوردستاندا بەکاردێن چەندەو لەکاتی تەقینەوەدا چەند قات زیاد دەکاتو بارستایی سەنگەرو بارەگا دەبێ چەند ئەستوور بێ هەتا بەرگەیان بگرن. ئەم زانیاریانەش لە بەرامبەر دوژمنی قودرەتمەندا گەلێ گرنگن چ بۆ پاراستنی گیانی پێشمەرگەو خەڵکو چ بۆ ڕاگرتنی ورەی بەرزی خۆڕاگری. پەروەردەی عەسکەری ئەگەر هەبێو بە گیانی زانستو زانیاری عەسکەری زانستیانە خەڵک گۆش بکرێ، ئەوسا کردارو رەفتارو گفتاری ئەو خەڵکەش بەو پێیە دەبێ. دەزانن دوژمن چی بەکاردەهێنێو خۆیان چی بکەنو بۆچی عەیب نییە خۆیان لەکاتی بۆردوماندا وەشارن. هەموو یەکێک ئەگەر زانیاری عەسکەری نەبێو نەزانێ دوژمن چی بەکاردێنێ، ناشزانێ لە سەنگەرو بارەگاو ماڵو دەشتو دەرا چی بکات. بەڵام کە زانی هاندرا هەڵبەتە دەشزانێ چی دەکات، هەر بۆ نموونە:

بۆمبێکی پەنجا کیلۆ دینامیت، دەتوانێ ئەستوورایی یەک پێ کۆنکرێتو چوارده پێ پۆلاً هەڵتەکێنێ، ئەم بۆمبایانە چەند گەورەتربن، بارستایی سەختتر دەبڕنو دەڕوخێنن. شێوەی تەکنیکی دروستکردنی بۆمباکانیش لەم سەردەمەدا گەلێ کاریگەرترو بڕندەترن. ئێستا بۆمبێکی درێژکۆلەی مۆدێرنی (٨٠٠) کیلۆیی، بارستاییەکەی (٨٩) سانیمێتر بێو درێژیەکەی مەترێکو پۆلاًرێژ بێت، دەتوانێ (١٠) مەتر کۆنکرێت ببڕێو هەڵیشی تەکێنێ. فڕۆکەی باجەرو مێکو میراجە پێش خراوەکانی سەردەم ( کە عێراق هەموویانی هەیە) دەتوانن زۆر بفڕن، بەلاًم بە حوکمی بەرتەسکی سنووری پێشمەرگەو دەسەلاًتی تەواوی رژێم لە زۆربەی شارو شوێنە گرنگەکاندا، مەودای فڕینی فڕۆکەکان لەسەر کوردستاندا هەر زۆر کەمە، ئەوپەڕەکەی لە دوورترین فڕۆکەخانەی کوردستانەوە بە سەعاتێ دەگەنە دوورترین شەرگەی شۆڕشو قایمترین بارەگای سەرسنوور. بۆیە ئەم فڕۆکانە بە ئاسانی دەتوانن بۆمبی قەبەو قورسی شەشو حەوت هەزار کیلۆ سەنگین هەڵبگرن، ئەمە لە کاتێکدا بۆ مەودای دوور ناتوانن بۆمبی قورسی وا زۆر هەڵبگرن؛ بە حوکمی لاوازی دژە فڕۆکەی (فەدافەند) پێشمەرگەش بە تزمێش بۆردومانی سەرکەوتووانەیان بکەنو بپێکن. هەر فڕۆکەیەک دەتوانێ (١٦-٢٠) بۆمبی ڕوخێنەر بار بکاتو هەر بارەگاو سەنگەرێ (١٠) مەتریش کۆنکرێتی لەسەر بێ بیڕوخێنێ. دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین: گرنگترین بارەگاو سەنگەر، دەبۆ ژێرخان لەم بزووتنەوەیەدا کە دوژمنەکەی زیاتر لە (٥٠٠) فڕۆکەی جەنگینی هەیەو حەوت هەزار تۆپی قورسو سوکی پەیدا کردووە، هیچ لایەک بارەگای (پێنج، چوار، سێ)مەتر کۆنکرێتی دروست نەکردووەو نەبووە. دەشوێستر ا بە شۆڕشی درێژخایەن لەناو میللەتێکی دەیان جار لە ڕووی عەسکەرییەوە شکست خواردوودا، میللەت سەربخرێ!

کە مرۆ چۆنیەتی سەنگەرلێدانو ژێر ئەرز هەڵکەنینو تونێل لێدانی قوڵو گەورەی شۆڕشەکانی چینو ڤێتنامو کۆریا...تاد. دەخوێنێتەوە، ئەوسا دەزانێ ئەو میللەتانە چۆن لەژێر ملیۆنەها تەن تۆپو بۆمبادا ماوونو سەرکەوتوون. بە ژمارەی تۆپو بۆمباو ڕۆکێتو موشەکەکانو بە بست بە بست کێلاًنی خاکی ئەو میللەتانە بوایە، هەرگیز نەدەبوو خەڵکیشیان بمێنێ، نەخوازەلا سەریش بکەون.

بایەخ نەدان بە نووسینی عەسکەریو پەروەردەی زانستیانەی عەسکەری شۆڕشگێرانە، لەم شۆڕشەدا، ڕەنگی ناڵەباری دایەوەو خەریکە شۆڕشەکە تەمەنی دەگەیەنێتە تەمەنی شۆڕشی ئەیلولو دووریش نییە کە ئەو تەمەنە تەواو دەکات

(چوارده ساڵ) بە تەواوەتی بەرەنجامی نەزانری. کەچی لە چەند نامیلکەیەکی بچووکی عەسکەری بەولاوە لەسەر شەڕو شەڕگەی پێشمەرگە، کە ڕەنگە کۆی سەرجەم لاپەڕەکانیان، سەد قەبارەی ناوەنجی تێنەپەڕێ، لەتەک چەند وەرگێڕانێکی کەمیش، کتێبی دیکەو نووسینو لێکۆڵینەوەی دیکە، نەنووسراون. تاکتیکو ستراتیژی شۆڕشەکە، شەڕەکانیو شەڕەکانی دوژمن، سەرکەوتنو ژێرکەوتن، قۆناغەکانی دەست پێکردنو بوژاندنەوەو هەڵچوونو داچوونەوەی هیچی ئەوانە لێنەکۆڵراون. خەڵک هەتا هەنوکەش بە عەقڵیەتی ڕۆمانسیانە بیر لە چەکو کوشتنی دوژمنو شۆڕشی درێژخایەن دەکاتەوە، بە تایبەتی گەنجە چەپە خوێن گەرمەکان.

ئەو ڕاستیانە لەکاتێکدا لەم شۆڕشەدا ڕوویانداوەو زیانێکی کوشندەیان گەیاندۆتە پێشمەرگەو دانیشتوو (پێچەوانەی شۆڕشی ئەیلول) لە شۆڕشەکەدا چوار لای سەرەکی خاوەن دەزگای عەسکەریو هێزی ڕێکخراوەیی پێشمەرگەن (یەکێتی، پارتی، حسک، حشع) ئەوانە بە تایبەتی یەکێتیو پارتی، مەکتەبی عەسکەری تایبەتیو چەندین ئەندامی مەکتەبی عەسکەریان هەیە. فەرماندەی هێزو سەرتیپو فەرماندەی بەتالیۆنو فەرماندەی کەرتو سەرلقی زۆریان هەن. چەندین ئەفسەری کۆنو نوێیان هەن. هەزاران شەڕی گەورەو ناوەنجیو بچوک کراون، بەسەختترین قۆناغی پێشمەرگانە تێپەڕبوون، وێڕاش دەبێ بڵێین: مخابن، ئەمانیش سەرجەم نەیانتوانیوە لایەنی هەرە کەمی ئەرکی سەرشانیان لەبارەی نووسینی عەسکەریو لێکۆڵینەوەو پەروەردەی عەسکەرییەوە بهێننەدی. لایەنی چەکداری وا هەیە لە کوردستاندا وا خەریکە شۆڕشەکە لە ڕووی چەکدارییەوە دەگاتە دوا ئەنجامی، ئێستاش زۆربەی کادرو سەرکردەکانیشی نازانن جەنگی پارتیزانی بە چەند قۆناغدا تێدەپەڕێو لەهەر قۆناغێکدا دەبێ چی بکرێو چۆن شەڕ سەربخرێو هەلومەرجی عەسکەریو سیاسی گواستنەوەی قۆناغەکان چین؟

لێرەدا: ڕووی ڕەخنەمان لەوانە نییە لە کۆتایی چەرخی بیستەمدا، لەرپەری پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای جەنگو زانستی جەنگیندا، لەوپەری پێشکەوتنی شێوەی شۆڕشو شۆڕشی چەواشەدا (بەداخەوە نەخوێندەوارن) وەکو نەخوێندەواریشن، ویژدانیان قەبوڵێتی لە بەرامبەر دوژمنێکی درندەی پەرداختی چەکدا بە: "زانستی نەخوێندەواری عەسکەری" ببنە فەرماندەی سەدانو هەزاران ڕۆڵەی ئازاو خوێندەوار. ڕووی ڕەخنەمان لەمانە نییە، چونکە نەخوێندەوارن، هەروەها باسمان لەوەش نییە کە

زۆربەی خوێندەوارەکانیش تاقەتی خوێندنی کتێبیان لە بەرگەوە بۆ بەرگ نییەو ڕێبەرانی حیزبەکانیش زیاترن‌و بەستە بەو پاش‌کەوتووییە بیانهێڵێتەوە.

قسە لەگەڵ ئەفسەرەکانە، شارەزاکانە، کادر، کۆنەکانە، کە هەندێکیان بەراستی ماندوون، ئازان، شارەزای شەڕو قاڵی شەرگەکانن. کەچی ئەمانیش ئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانیان لە بابەت نووسینی عەسکەری نەبینیوەو هیچیان نەنووسیوە. بێگومان بێ بەرهەمی ئەم بەتوانایانە، چەندین هۆی هەیە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- نزمی ئاستی تیۆری عەسکەری‌و زانستی جەنگی خۆیان.
٢- شکستی گشتی عەسکەری بزووتنەوەی میللەتەکە.
٣- نەبوونی کۆلێژو داوو دەزگای عەسکەری تایبەتی شۆڕش.
٤- بێ‌بایەخ کردنی تیۆری شۆڕشگێرانە، لەلایەن ڕێبەرایەتی باڵادەستەوە.
٥- زاڵبوونی تاکایەتی‌و پێڕەو نەکردنی سیاسەتی ئازادی ڕا دەربڕین.

بێ پێچ‌و پەناش دەیڵێین: لێپرسراوە ناودارەکانی ئەم بەشە عەسکەری‌و سیاسییەی بزووتنەوەی میللەتەکە وێڕای پێزانینی ماندوویەتی‌و ئازایەتی‌و کۆنی تێکۆشانیان ئەگەر لە پاشەڕۆژدا ڕاستیەکی باشتر لە توانای خۆیان لەمەڕ ڕاستییە عەسکەرییەکان نەسەلمێنن‌و بۆ خەڵکی دەرنەخەن، سەرجەمی ئەزموونی عەسکەری بزووتنەوەکە بۆ نەوەی ئایندەو ئێستا لە هەموو بارێکەوە بابەتیانە نەنووسن. ئەوا دەبێ لە ئێستاوە بزانن کە لە پاشەڕۆژی نزیکدا ئەوەیان لەسەر تۆمار دەکرێ کەوا:

ئاستی عەسکەریان زۆر لەوە نزم‌و کزتر بووە کە لە سێبەری سەرکەوتن‌و بە زەبری زیندان‌و زەمانە، لەبەر حیزبایەتی گزشەگیرانەو هەلپەرستانە، پیایاندا هەڵدراوەو کراونەتە فەرماندەی لێهاتووی کەم هاوتا. کە بە تەواوەتی ئاستیان دەرکەوت کە چەند نزم بووە، ئەو حەلە دەبێ خۆیان ئامادە بکەن لەبەردەم دادگای مێژوودا داوەری بکرێن، چونکە دەردەکەوێ چۆن چۆنی بەرپرسیاری شکست‌و خوێنی هەزاران پێشمەرگەو خەڵکی زەحمەتکێش بوون.

ئەم هەوڵەی بەردەستیش باسێکی مێژوویی جەنگی پارتیزانی‌و پەرەسەندنێتی بۆ شۆڕشی درێژخایەن‌و گۆڕانێتی بۆ شۆڕشی ڕاپەڕین. زۆرتریش لایەنی تیۆری باسەکە بۆ تێگەیشتنی ئایندە نووسراوە. ئومێدەوارین لەم بارودۆخە جیهانیەدا، لەم هەلومەرجە نالەبارەدا، ئەمە دوا هەوڵی ئەو پێناوە نەبێ‌و بەپێی توانا لەم بارەوە

هەوڵی زۆرترو زانستیانەتر بدرێ. چیدیکە نەهێڵدرێ نووسەرانی بێگانە (بەتایبەتی خراپەکان) بە ئارەزوو باری عەسکەری کوردستان هەڵسەنگێنن. سەرکەوتن‌و ژێرکەوتن بەو پێیەی بۆی دەچن نەکەنە پێوانەی ڕەوایی‌و ناڕەوایی بزووتنەوەی چەکداری کورد.

مایەی دڵخۆشیشە، خەڵکی بەتواناتر، شارەزاو عەسکەریتر، باشتر ئەرکی ڕابەرێتی ئەم پێناوە ڕاپەڕێنن‌و دریغی نەکەن. دریغی نەکردن یارمەتیدانێکی بە نرخی خەباتی لەمەودوای میللەتەکەیە کە هێشتا ژێردەستەیە. هەتا هیچ نەبێ نەوەی ئایندە ڕاستیەکانی ئەم قۆناغەو قۆناغەکانی پێشوش باش بزانن‌و سودیان بۆ کاتی خۆی لێوەربگرن. نەشچووە بچی، ئێستاو ئایندە پێکەوە بەستراون‌و ڕەوڕەوەی ئازادیخوازیش نەوەستاوەو ناشوەستێ.

## ٢/١- گەوهەری باسەکە

گەوهەری ئەم باسە، کردنەوەی درزێکە لەو بازنە بەتاڵە چەکدارییەی کورد بێ گەیشتن بە ئامانجی سەرکەوتن، لەناویدا هەڵدەسوڕێندرێ. بەهیوا هەموو ئەوانەی بە دوای ڕێبازی ڕاستەقینەی سەرکەوتن‌دا دەگەڕێن، نەهێڵن فاشیستەکان ببنە قەڵەم هەڵگری دەیان ساڵی دیکەی خەباتی چەکداری کوردستان، ئەمەش پێش هەموو شتێ زاتی بەخۆداچوونەوەی دەوێ. هێمنتر، هەمەلایەنتر، دوور لە بەرژەوەندی تەسکی حیزبایەتی‌و سۆزی ڕووتی نەتەوایەتی، ڕابردوو وەکو هەیە، نەک وەکو حەزمان لێیە، هەڵسەنگێنین. ئێستامان بناسین‌و ئایندەشمان بە ئایندە ئەندازەی تیۆری (نەک بەخۆ بوێری‌و نەوێری) بپێوین.

بێگومان، ساڵەهای ساڵی کێشەکانی خەبات: شەڕەکانی، کوشتارەکانی، شانازی‌و شەرمەزارییەکانی، بەهەڵچوون‌و بەهەڵبردنەکانی، کوشتن‌و بە کوشتدانی بێهودەی شەڕە ناوخۆکانی، تۆمەت‌و تاوانەکانی، بمانەوێ‌و نەمانەوێ، کەم‌و زۆر، ڕاستەوخۆو نا ڕاستەوخۆ، کاری لە تێکڕای بەشداربووانی ڕووداوەکانی ڕابردوو کردووە، بڕیاری پێداون، کاری پێکردوون، هەڵوێستی پێوەرگرتوون، سەنگەری پێگرتوون، هەروەها کوشتوویانەو بە کوشتیان داوە، بە زۆری بڕیاری نابەجێیان جێبەجێ کردووە...تاد. تەواوی ئەو ڕاستییانە چەشنی چقڵ هەرچی چۆنێ بیری لێبکرێتەوە دەچەقێتە چاوی تەواوی بەشداربووانی ڕووداوەکان بە لایەنی چاک‌و خراپیەوە.

هەر لایەکی سیاسی تفەنگێکی هەڵگرتبێ‌و فیشەکێکی تەقاندبێ، مفرەزەیەک یان لەشکرێکی هەبووبێ بەپێی سەنگی خۆی هەتا ئەو ڕۆژەی لە گۆڕەپانی خەباتەکەدا بووەو بڕیاری‌داوە یان بڕیاری جێبەجێ کردووە، کەم‌و زۆر ئۆباڵی کارەسات‌و بەسەرهاتەکانی دەکەوێتە ئەستۆ. بەڵام ئەوەش هەیە پێشینان گوتەنی: هەر بەپێی خۆی‌و بزنیش بەپێی خۆی هەڵدەواسرێ. کوردییەکەی‌و کورتییەکەی، بەردی هەموو لایەک بەقەد قورسایی خۆی گۆمەکەی شڵەقاند*.

ئەمڕۆ هەڵسەنگاندنی ڕێبازی شۆڕشی درێژخایەن لە کوردستاندا پێویستیەکی هەرە پێویستی خەباتی ڕزگارییە. چونکە: شکستەکان زۆربەی ڕۆشنبیران‌و دڵسۆزانی گەلەکەمانی خستوتە سەر هەڵوێستی باسکردنی چەمکی شۆڕشی چەکداری‌و ئەنجامەکانی لەمەوبەر. ئەمەش ئەگەر بۆ تیۆریسین‌و نووسەرانی سیاسی‌و عەسکەری میللەتانی خاوەن قەوارە، تەنها بۆ دەوڵەمەندکردنی کاروانی ڕۆشنبیری گرنگ بێ، ئەوا بۆ کوردو میللەتانی ژێردەستە ئەرکێکی چارەنووس‌سازە.

کەم کەس هەیە لە کوردستاندا، کەم‌و زۆر لە پاش شکستی چەکدارانەی (ئەنفالەکان)ی ساڵی ١٩٨٨ەوە بە شێوەیەک لە شێوەکان، بیری لە چارەنووسی کوردایەتی چەکدار نەکردبێتەوە. بیرکردنەوەش جۆرەها شێوەی گرتۆتە خۆی: نائومێدی‌و ڕەشبینی، خۆ بەدەستەوەدان، پەنا بردنە بەر هەندەران، بردنە سەری ڕۆژ لە ئێران‌و ئۆردوگاکان. ئەدلیستی‌و بەرەڵلایی ژیان، هەروا بێ لێکدانەوە سوور بوون لەسەر خەباتی چەکداری، ئەوانە هەموو بیروڕاو نەخۆشیە سایکۆلۆژیەکانی شکست‌و کارەساتی دوای شۆڕشە ئەرێیەکەن!

باسی سەرنج ڕاکێش لەوەدایە، هەر وەکو جاران لەبەر چەندین هۆی سیاسی‌و پێکەوەبوونی، نەتەوایەتی‌و شەخسی، درێژەپێدانی شۆڕشی چەکداری ئێستاش بە دەستەبەری سەرکەوتن دەزانن، بەڵام گوایە ڕەخنەیان لەم لایەن‌و ئەو سەرکردەو فلانە فەرمانده هەیە. لە ڕوانگەی ئەمانەوە ئەگەر بێت‌و کەم‌و کوڕییەکانی خەباتی چەکداری ڕاست بکرێنەوە، دیسانەوە پێشمەرگە دەتوانن پەرە بسەننەوەو لەپاشەڕۆژیشدا سەرکەون.

* لەم ڕووداوانە بێ ئۆباڵ نیم (نووسەر)

ئەو قسانە سەرجەم هەن‌و ئێستاش لە کۆڕو کۆمەڵدا باس دەکرێن‌و بەپێی ئاستی توێژەکانی خەڵک بیروڕایان لەسەر گەلاڵە دەکرێن. دیارە هەمیشە ڕەخنە لە خەڵک گرتن خۆشترە لە ڕەخنە لە خۆ گرتن. بۆیە: ئۆباڵی شکست خستنە پاڵ لایەک‌و کەسێک‌و دەربازکردنی لایەن‌و کەسانی دیکە لە گەرمەی شکستی گەلاڵەدا دیاردەیەکی ئاسان‌و ئاساییە.

بۆچوونی چینایەتی جیاوازیش هەتا چین‌و چەوسانەوە بێت، دەمێنێ بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا پێوانەی بابەتی هەڵسەنگاندنی دیاردەکان دەچەسپێن.

لەمەودوا هەوڵدەدەین ئەو باسانەی پێوەندیان بە باری ئابووری گۆڕاری جیهان‌و ڕادەی کارکردنە سەر ڕووداوەکانیان هەیە، بکەین. تەکنۆلۆژیای جەنگ‌و جێگۆڕکێی چینەکان‌و هەڵوێستی چینەکانیش بەرامبەریان.

بێگومان باسەکان تێکڕا هەوڵدانێکە بۆ دەرخستنی بە بن‌بەست گەیشتنی شۆڕشی درێژخایەن وەکو سەرەکی‌ترین ڕێبازی ڕزگاری گەلانی ژێردەستە، مەگەر لە هەندێ شوێنی تایبەتیدا نەبێ. یان وەکو شێوەیەکی خەبات لە خزمەتی ڕاپەڕینی شارەکان بخرێتە گەڕ. ئەگینا شۆڕشی درێژخایەن کە وەکو باسای ئەگۆڕی گەلان باس دەکرا قۆناغی بەسەرچوو. ئینجا دەست‌نیشان کردنی ئەڵتەرناتیڤی شۆڕشگێڕانەی نوێی سەردەمەکە بۆ کرێکاران‌و گەلان وەکو درێژەپێدانی شۆڕش بەپێی هەلومەرجی زاڵی ئەم قۆناغە.

باسەکەش زۆرتر پەیوەستە بە تیۆری شۆڕشی درێژخایەن لە جیهاندا کە وەکو ڕەوتێکی خەباتی سەخت زیاتر لە (١٥٠) ساڵە خەباتی چەکداری لە کوردستاندا کراوەتە پێناوی ڕزگاری بەبێ ئەوەی ڕزگاریشی هێنابێتەدی، بەڵکو زیاتر لەوەش، پاش هەر ڕاپەڕینێکی چەکدارانە بە ڕێبەرایەتی سەرداران‌و بۆرژواکانی کوردستان، جگەلە قوربانی هەزاران کەس‌و خاپووری هەزاران شارو شارۆچکەو گوند، سەداتیش لەسەر نەخشەی مێژووی کوردستان بە: پارێزگاو قەزا، ناحیەو مەڵبەندی جوگرافی گەورەو گران، لەکیس نەتەوەی کورد چوون. هەمووشی لە سایەی ڕێبازی شکست‌خواردوو بە ڕێبەرایەتی چینی شکست‌خواردوو... بەبێ ئەوەی ڕێبازەکەش لێی کۆڵرابێتەوە یان هەوڵدرابێ باسی زانستی لەسەر بنووسرێ.

بۆیە: باسەکە گەرچی سەبارەت بە تیۆری شۆڕشی چەکدارییە، بەڵام لە خزمەتی

تاوتوێ کردنی زانستیانەی کوردایەتی چەکداریشە کە هەن ئێستاش، بە تاکە ڕێبازی سەرفرازی دەزانن. بەبێ ئەوەی لە تیلەی چاویشەوە بێ، ئاوڕێک لە گۆڕانکارییە بنەڕەتیەکانی جیهان بدەنەوە. جیهانیش بەم گەورەییە!!

دیارە هەموو کەسێک دەستی نووسینی نییەو هەموو یەکێکیش ناتوانێ بە وردی لە پرۆسەی لە گرێژەنە دەرچووی وا بکۆڵێتەوە، بەڵام هەموو ئەوانەی ڕاستەوخۆ تەرخانی خەباتن ئەرکی سەرشانیانە، ئێستا لە جاران زیاتر لەم ئاستەنگە عەسکەرییە بتوژنەوە لەبەر ڕۆشنایی: ئەزموونەکان، دیاردەو دەرکەوتەکان، کارەسات‌و شکستەکان بە پاڵوێنەی زانستی بیری خۆیان‌و خەڵک بپاڵێون.

کێشەکە، ڕەوتەنی‌و ساکارو سانا نییە، کێشەیەکی لاوەکی‌و دەرەکی نییە، بەڵکو کێشەیەکە چارەنووسی لەمەوپاشی ژیانی گەلەکەمان‌و نیشتمانەکەمانی پێوە بەندە. ئەگەر لە کێشەی ئەوها نەکۆڵینەوەو لە پێناویا ماندوو نەبین کەواتە شایستەی ئەوەین مامەڵەی کوردایەتیمان پێ بکرێ. بەکورتی:

> بۆ ئەوەی بە ئازادی بگەین دەبێ پێش هەموو شتێک، خۆمان لە قەتیسی بیرکردنەوەی کۆن ئازاد بکەین. بەبێ خۆئازاد کردن لەو قەتیسە بە ئازادی ڕاستەقینە شاد نابین.
> ئازادی چۆن دێتە دی ئەگەر ئەندێشەت ئازاد نەبێ‌و ئەندێشەش ئازاد نابێ... ئەگەر لە سانسۆری تەسکی خۆپەرستی ڕزگارمان نەبێ.

### ٣/١- خۆنەبوونی ڕێبازی پارتیزانی

جەنگی پارتیزانی سەرەتاکانی بۆ ژیانی سەرەتایی، بگرە بۆ ناو ئاژەڵانیش دەگەڕێتەوە، بەڵام هەتا هاتووە ئەمیش پێش خراوەو بنچینەکانی چەسپیوە. گەر لەو سەردەمانەدا کە دەوڵەت بە چەکە سەرەتاییەکانی پیشەسازی ئاسنگەران دەپارێزرا، سوارچاک‌و شیرو شمشێرو قەڵغانی باش، هەندێ جارو لە هەلومەرجی تایبەتی‌دا ڕۆڵی لە جەربەزەیی‌و سەرچڵی دەستەیەکی یاخی‌دا گێڕابێ‌و بەرامبەر ژمارەیەک جەنگاوەری زۆر دەستەیەکی بچووک، جاروبار سەرکەوتبێ، ئەوا پاش پێشکەوتنی پیشەسازی بەتایبەتی لە قۆناغی سەرمایەداریدا کە چەک‌و ئامرازەکانی زانستی جەنگ پێشخران: چەکی دوور ئەنگێو، چەکی دەسترێژ، هاوەن‌و تۆپ، تارنجۆک‌و

مین، تەقاندن و تەقینەوەی ڕوخێنەر، لە سەرەتاوە و دوای ئەویش پەیدابوونی: تانک و زرێپۆش، فڕۆکە و کۆپتەر، گازی ژەهراوی، هەروەها: چەکی ئەتۆمی و ڕۆکێتی کیشوەر تێپەڕ و جۆرەها چەکی کوشندەی دیکە لەپاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە. تێکڕا ئەو چەکانە لە هەر سەردەمێکدا، قۆناغ و بارودۆخێک، ڕاستەوخۆ کاریان کردۆتە سەر زانستی جەنگ و چۆنیەتی جەنگین و سایکۆلۆژیەتی جەنگاوەران و بەهێزکردنی ڕژێمەکان و داوودەزگای داپڵۆسینیان، بەتایبەتی لەشکرەکان. بۆیە: جەربەزەیی و سەرچڵی و سوارچاکی و شیر و قەڵغانی بڕندەو کوشندە، جێی خۆیان بۆ هۆشیاری عەسکەری چۆڵ کردووە و لە بەرامبەر ئەو چەکە پێشخراوانەدا ڕێبازی عەسکەری نوێ، نەک سەرچڵی و ئازایەتی، خوڵقاوە و پێڕەو کراوە.

دیاردەی دیاری ئەو گۆڕانکاری و ڕووداوانە گرتنەبەری جەنگی پارتیزانییە وەکو ڕێبازێکی خۆبوونی عەسکەری کاریگەر دژی لەشکری پەرداخت، لەچوارچێوەی بنچینەکانی جەنگین، نەک دابڕاو لەوان.

جەنگی پارتیزانی، وەکو جەنگ و تەواوی پێداویستەکانی دیکەی ژیان بابەتیانە پێکهاتووە و لە پرۆسەیەکی (عەسکەری ـ کۆمەڵایەتی ـ سیاسی) دوور و درێژدا، بەرەبەرە بنەما تیۆرییەکەی گەڵاڵە بووە.

ڕێبازی پارتیزانی ئەگەر لەسەر زەمینەی کۆمەڵایەتی بەپێی پێویستی چینایەتی و نیشتمانی سەری هەڵنەدایا، هەرگیز بە ئارەزووی لێوشاوەترین ئەندیشمەند، نەدەبوو بە ڕێبازێکی چارەنووس‌سازی قۆناغێکی ژیانی میللەتان. لەبەر ئەوەی هەڵقوڵاوی باری کۆمەڵایەتی و نیشتمانی بوو، بۆیە لە شێوەی خۆڕسکییەوە قاڵبی تیۆری بۆ دۆزرایەوە و لە دەیان ئەزموونی دژواردا لە بەرامبەر دەیان دەوڵەتی ئیمپریالیستی و کۆنەپەرستی پەرداختی جۆراوجۆردا، سەرکەوتنی بەدەست هێنرا و دەیان میللەت و نیشتمانی گەورە و ناوەنجی و کچکەشی پێ ڕزگار کرا.

کۆن ئەمریکاییەکان دژی پورتوگالییەکان (١٧٧٥-١٧٨١) پێڕەوییان لە جەنگی پارتیزانی هاوشانی جەنگی بەرەیی کرد و ئەنجامێکی باندەریان بەدەست هێنا. لە جەنگەکانی ئەمریکای ناوەندی و ئەورووپای ڕۆژئاوای کۆنیشدا، شێوەیەک لە شێوەی جەنگی پارتیزانی گیراوەتەبەر و سودی عەسکەری لێ وەرگیراوە، بەڵام وەکو شێوەیەکی سەرەکی جەنگین، جەنگی پارتیزانی لە ئیسپانیادا بە تەواوەتی

تاقیکرایەوەو سەرخرا.

کە فەرەنسا ئیسپانیای داگیرکرد. لەشکری شکاوی ئیسپانیا چیدیکە نەیدەتوانی بە هیچ کلۆجێک دابەزێتە مەیدانی جەنگی بەرەیی فراوانەوە، بەتایبەتی پاش شکستی گەورەی شەڕی بەرەیی (ئۆکانا) لە ۱۹ی تشرینی دووەمی سالی ۱۸۰۹دا. بۆیە لەشکرە بەزیووە کەم هێزەکەی ئیسپانیا، بەناچاری کشانەوە چیاو جەنگەڵەکانو بەدەستەو تاقمی بچوکو جیاجیا، پەلاماریان دەدایەوەو هەڵیاندەکوتایە سەر داگیرکەر. سەرەنجامی سەدان شەڕی گەورەو گچکەی قارەمانانە، لەشکرە پەرداختەو زۆرو داگیرکەرە سەرکەوتووەکەی ناپلیۆنیان هەراسان کردو ئیسپانیایان لێ رزگار کردن. ئەم سەرکەوتنە لە مێژووی جەنگداو بۆ جەنگی پارتیزانی بە وەرچەرخان دەژمێردرێو نەتەوەی ئیسپانیا بوون بە سەرمەشقی خەباتی نەتەوە کەم هێزو خۆڕانەگرەکان بەرامبەر دوژمنی بەهێزتر.

سەرکەوتنی جەنگی پارتیزانی، سەرەتای ڕێگایەکی دوورو درێژی مێژوویی بووە کە ئیسپانیەکان یەکەمین گامی بنەڕەتیان بۆ دانا. لەوە بەدواوە، هەر نەتەوەیەک ئەگەر لە جەنگی ڕووبەڕوو بوونەوەدا سەرنەکەوتبێ، ژیرانەو ئازایانە، جەنگی پارتیزانی بەرپاکردبێ، درەنگیشی خایاندبێ، سەرەنجام سەرکەوتووە، وەکو: سەرکەوتنی ئەمریکا بەسەر ئینگلیزو زێرکەوتنی نەمسا لە ئیتالیاو هەنگاریا. بەپێچەوانشەوە هەر نەتەوەیەک وەکو لە جەنگی بەرەییدا بەرگەی نەگرتبێ، جەنگی پارتیزانیشی هەڵبژاردبێ، سەرانی ئەو نەتەوەیە بوونەتە مایەی سەرشۆڕیو ژێرکەوتنی نەتەوەکەیان، وەکو مانەوەی نەتەوەکانی ئاسیاو ئەفریقیەکان لەژێر رکێفی عوسمانیەکانو پاش ئەمانیش هی ئیمپریالیستیەکان. باشترین نموونەش، نەتەوە داگیرو دابەشیندراوەکەی کوردستانە کەوا هیچ کاتێک لە نەتەوەکانی دیکەی دراوسێی ئەگەر زۆرتری خەبات لە پێناوی رزگاریدا نەکردبێ، کەمتری نەکردووە، بەڵام ئەو هەلانەی میللەتانی لاوازترو کەمتر لە کورد، خاوەن نیشتمانی تەسکتر لە کوردستان لە مێژوودا قۆزتیانەوەو توانیان بگەنە ئامانجی سەرفرازی دژی عوسمانیە داگیرکەرەکان. کەچی هاوزەمانی ئەوانو پێشتریش کورد دەستیداوەتە چەکو جەنگاوە، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی ڕاپەڕینە چەکداریەکانی شێوە جەنگی بەرەیی فراوانیان گرتۆتەبەرو لە بری شێوەی خەباتی نوێی گونجاو، دروست کردنی قەڵاو قەڵاتی سەخت بە گرنگ زاندراوە، بۆیە هەموو جارێ لە هەموو ئەو قۆناغە زێڕینانەی هەڵکەوتوون، دوژمنی بەهێزتر، پڕ چەکتر، لە جەنگە

بەرەبییەکاندا سەرکەوتووەو تەواوی قەلاّ سەختو بلّندەکانی میرو شێخو ڕابەرایەتی ڕاپەڕینەکانی داتەپاندووەو خۆشیانی گرتووە: میری ڕەواندوزو بەدرخانو یەزدانشێرو شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریو شێخ مەحموود. بەڵگەکانیانن، هیچی ئەو ڕێبەرانە، وێڕای تۆمارکردنی شانازی گەورە لە مێژوودا لەکاتی ڕاپەڕینە چەکداریەکاندا هێڵی عەسکەری ڕوونو ستراتیژی عەسکەری ڕاستیان نەبوو، جەنگی بەرەییو پارتیزانیان تێکەڵاو دەکرد (بە زۆریش جەنگی بەرەییان دەکرد) جیاوازی هەریەکەیان نەدەزانی، هیچ نەبێ بە دەرس لێوەرگرتنی شکستەکانی ناو ڕاپەڕینە یەک لەدوای یەکەکانی ناو بزووتنەوەکە. هەر ڕاپەڕینو ڕێبەرێک شکابێت، ڕێبەرەکەی پاش ئەو، قەڵای سەختتری دروست کردووە. شەڕی بەرەیی گەورەتری نەخشەکێشاوە؛ کەچی جاروبار کە ڕاپەڕینێ شکابێ ڕێبەرو سەردارو بەگێکی ئازاو لاسار، خۆڕسکانە کەوتبێتە جەنگی پارتیزانی بۆ ماوەیەکی باش دوژمنی هەراسان کردووەو چەشنی شەڕە بەرەبییەکان دەرەقەتی نەهاتوون، بە فرتوفێڵو سوێندی درۆ نەبێ، لەوانە: خان مەحمودو نوراللە بەگ، پاش شکانی ڕاپەڕینەکەی بەدرخان، هەروا برایم خانی کفریو مەحموود خانی دزلی لە سەردەمی شێخ مەحمودا، بارزانیو بارزانییەکان لە سەردەمی کۆماری مەهاباددا.

دەمێکە سەلمێندراوە کەوا جەنگی بەرەیی کلاسیکی کە هەزاران ساڵ ڕێبازی عەسکەری ئیمپراتۆرە گەورەو کۆنەپەرستەکان بووە، هەتا سەر سەرکەوتنی پێوە بەند نییەو گۆڕانکارییەکان چەشنی باقی دیاردەکانی ژیان، ئەمیشیان گۆڕیووە.

پێش ئەوەی شۆڕشی درێژخایەنی چەکدارانە ببێتە ڕێبازێکی عەسکەری ناسراوی گەلانی داگیرکراوو لێرەو لەوێ، هاوشانی جەنگی کلاسیکی بەرەیی، بەتایبەتی لەناو میللەتانی کەم هێزو شکستخواردوودا زۆرجار بە شێوە پەراگەندەو خۆبەخۆ پەیرەوی لە پارتیزانان کراوەو میللەتان هێندە ڕقیان لە داگیرکەران بووە، شکستو ورەی بەرزتر کردوونەتەوەو لەپێناوی ڕزگاری نیشتمانەکەیاندا، بە قسەی دەسەلاّتدارانی ستەمکاری پێشوویان، یان چینی چەوسێنەری میللەتەکەی خۆیان کردووە (بەتایبەتی چەوساوەکان) بەبێ ئەوەی لایەنی کەمی بەرژەوەندی چینایەتی خۆشیان ڕەچاو کرابێ. باشترین نموونەش جوتیارانی چەوساوەی کوردستانن کەوا دەیان جار: ڕاپەڕیون، ماڵوێران کراون، کوژراون، دەربەدەرکراون، بەبێ ئەوەی بچووکترین مافی چینایەتییان لە بەرنامەی ڕێبەرە دەرەبەگو شێخە دەسەلاّتدارەکاندا، تەنانەت لە هی ڕێکخراوە سیاسییەکانی سەرەتای سەرهەڵدانی

یان هەتا کاتی جەنگی دووەمی جیهانیش دیاری کرابێ. ویراش چەوساوەکان لە خۆشەویستی نەتەوەو نیشتمانەکەیان، چوون بەگژ داگیرکەرانی بێگانە.

لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا کە جەنگ بوو بە زانستێکی سەردەمەکەو زانیاری جەنگین پەرەی سەند، دەوڵەتە ئیمپریالیستە خاوەن ئەزموونە جۆراوجۆرەکانی جەنگی گەورەو گچکە، بەپێی فراوانی قەوارەی بەرژەوەندی ئابووریو سیاسییان، لەهەموو بارێکی: تەکنۆلۆژیو زانیاریو سایکۆلۆژییەوە هەتا دەهات پتر پەرەیان دەدایە جەنگ. پەلاماردانی گەلانیش بوو بە پێویستییەکی مانو نەمانی ئیمپریالیستەکان. گەلانیش لە بەرامبەر ئەم دوژمنە دڕندەو پڕچەکەدا، چیدیکە شێوەی بەرەنگار بوونەوەی کۆن دادی نەدەدانو بە چەکی سووکی دەستکرد (ساچمەزەنو تاپڕ)و هی قاچاغچیو چەتەگەری (ماهوزەرو مانهێرو ئینگلیزیو برنەو) بەرگەی تۆپو تانک، پاشانیش هی فڕۆکەیان نەدەگرت. لە زۆربەی بزووتنەوە چەکدارییەکانی سەرەتایی چەرخی بیستەمدا دژی ئیمپریالیزم، قوربانییەکی زۆر دراو سەرکەوتنیشی نەهاتەدی.

ڕاپەڕینی شارەکانیش ـ بەسەنگەربەندیشەوە ـ گەرچی کاریگەریش بوون، بەڵام زوو دادەمرکێنران.

لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا، وەکو بۆچوونی چینایەتی جیاوازی: فەلسەفیو ئایدیۆلۆژی، سیاسیو ئەدەبیو مێژوویی هەبوونو هەن، هەروەها دوو بۆچوونی جیاوازی عەسکەریش هەبووو هەیە. لە بەرامبەر بۆچوونی سەرمایەداراندا، بۆچوونی کرێکارانیش وەکو پێویستییەکی بابەتی خەباتی چینایەتی، خەملی. ڕێبەرانی کرێکاران، بە ڕوونی سەلماندیان کە جەنگ درێژەکێشانی ناکۆکیە سیاسییەکانە لە پێناوی سەپاندنو پاراستنی دەسەڵاتی سیاسی چینایەتی یەکێک لە چینەکانی کۆمەڵو ژیانی کۆمەڵایەتی. بۆ ئەمەش بە دوای شێوە نوێی جەنگدا کەوتنە لێکۆڵینەوەو هەموو باسەکانیش لە دەوری ئەوەدا دەسووڕێنەوە کە جەنگ ئامرازێکە لەو ئامرازانەی ئامانجی سیاسیان پێ دێتەدیو هەرگیز لەو ئامانجە جیا نییە. هەردەم لە مێژوودا چەوسێنەرەکان چەواشەپییەکان مەبەستیان بووە جەنگو جەنگاوەران لە سیاسەتو ڕێبازی ئایدیۆلۆژی دابڕن. بەڵام شۆڕشگێڕان بە پێچەوانەوە جەنگو سیاسەتیان بە تەواوکەری یەکدی زانیوەو ئاوێتەیان کردوون. چۆن سیاسەتیان لەسەر بنەمای زانستیانە هەڵسەنگاندووەو بە وردیش چاودێری تەکنۆلۆژیای جەنگو پلانو نەخشەکانی جەنگیان کردووە بەستوویانەتەوە بە ڕێبازی

شۆڕشگێڕانە، پاکیان کردۆتەوە لە کاری دڕندانەو خستویانەتە خزمەتی کرێکاران‌و خەڵکی زەحمەتکێش.

دڕندەیی بۆرژواکانیان لە جەنگ کردۆتە هەوێنی دژایەتی کردنیان لە بەرامبەریاندا، جەنگی شۆڕشگێڕانەیان دژی جەنگی کۆنەپەرستانە داهێناوە. جەنگاوەریان وەکو هۆشیارترین ڕۆڵە گوش‌کردووەو لەپێناوی ئامانجی ڕەوای کرێکاران‌و گەلاندا. کاریگەری بیرو ڕای شۆڕشگێڕانەیان لەپێش کاریگەری جەنگ‌و جەنگدا بووە. ئەم ڕاستییە لە مێژە ئەنگڵس ئەنگاوتویەتی:

" وەکو دەبینین تەناتەت لەوپەڕی جەنگی شەقامەکاندا سەنگەربەندەکان کارێکی ورەیی یا ڕەوشتی یان زیاتر لە کارایی مەتریالیستی هەبوو. ئەو کاتەی سەنگەربەند توانای بەرگەگرتنی هەتا هاتنی کاتی کارایی لە ورەکە هەبوو، سەردەکەوت، کە هەتا ئەو کاتەش بەرگەی نەدەگرت، دەبەزی. ئەمە خاڵی سەرەکییە پێویستە هەرکەسێ جەنگی شەقامەکان لەپاشەڕۆژدا دەکات، دەرکی پێ بکاو بیری بخاتەوە "‹٢›.

بەوچەشنە، لقەکانی جەنگ، جەنگی بەرەیی‌و سەنگەربەندی هەروەها پارتیزانیش شێوازێکی عەسکەری دابڕاو لە بیروباوەڕ نەبوون. هەمیشە لە جیهانبینی کرێکارانەوە بەستراونەتەوە بە خەباتی چینایەتی کرێکاران‌و گەلان، تەنانەت هەتا پاش جەنگی یەکەمی جیهانیش، جەنگی چەکداری، چ سەنگەربەندی شارەکان‌و چ پارتیزانی شێوەیەکی خەباتی لاوەکی بوون لە خزمەتی خەباتە سەرەکییەکەی کرێکاران‌و زەحمەتکێشاندا کە ڕاپەڕینی ناو شارەکان بووە.

## ١/٤- پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر

جەنگی پارتیزانی، یان هەر جەنگێکی چەکداری دیکە، سەرەتا نەکرانە شێوەی سەرەکی خەباتی شۆڕشگێڕانە.بەڵکو هەتا ئەوکاتەش مابووی تێزو تیۆری جەنگی پارتیزانی بە ڕوونی داڕێژرێ، چونکە شێوەی دیکەی خەبات سەنگی سەرکەوتنی هەبوو، بەتایبەتی لەناو وڵاتە سەرمایەدارەکاندا کە مەڵبەندو ناوەندی خەباتی

‹٢› الماركسية و حرب العصابات. ترجمة ابراهيم العابد و ماهر الكيالي المؤسسة العربية للدراسات و النشر ـ بيروت ص: ١٨

شۆڕشگێڕانە بوون‌و جاریٚ خەباتی گەلانی دواکەوتووی داگیرکراو دەروازەی ڕێبازی شۆڕشی درێژخایەنی نەخرابووە سەرپشت، گەرچی جەنگی پارتیزانی کەمو زۆر لەناو ئەو میللەتانەشدا گەلیٚ لەوەو پێشیش پیادە دەکرا، ئەوەتا لینین دەلیٚ: (ناکریٚ حیزبی زەحمەتکێشان جەنگی پارتیزانی بە تاقە ئامراز بزانیٚ، یان تەنانەت سەرەکیش، لە تێکۆشانیدا... پێویستە ئەم ئامرازە ملکەچی ئامرازەکانی دیکە بێت...و پێویستە بسازیٚ لەتەک ئامرازەکانی جەنگی سەرەکیدا)‹٣›.

شیاوی شیکردنەوەیە بڵێین: بۆچی ئەوکاتەی لینین ئەم بۆچوونەي هەبووە؟ یان لەبەرچی شۆڕشی درێژخایەن‌و جەنگی پارتیزانی نەکردۆتە ڕێبازی سەرەکی شۆڕشگێڕانە؟ بەتایبەتی لە ڕووسیای ئەوساشدا، گەرچی خۆشی وڵاتێکی سەرمایەداری گەورە بوو، تەنانەت پێشیدەگوترا ئیمپریالیستی. بەلاٌم دواکەوتوو، کێشەی جووتیارانی قووڵو دەوڵەتێکی پان‌وپۆڕ بوو. لە ڕووی تۆپۆگرافیەوە دەشیا بۆ شۆڕشی درێژخایەن، لەبەر ئەوەی ڕژێمە تزارەکەی سەنگەری چەواشەی کۆنەپەرستانەی ئەورووپا بوو، دوژمنیشی فرە هەبوون. سەرەڕای ئەو ڕاستیانەش هێشتا لینین وێڕای شارەزاییەکی قوڵی لە جەنگ‌و کاری عەسکەری، کارایی پارتیزانی، ڕێبەرایەتی‌و کارامەیی، کەچی شۆڕشی درێژخایەنی فۆرمۆلە نەکردووەو نەشیکردۆتە ڕێبازی سەرەکی سەرکەوتنی چینایەتی کرێکاران، بگرە جەنگی پارتیزانیشی وەکو جۆگەلەیەکی ڕووباری عەسکەری زانیوە. بەکورتی هۆی ئەم بۆچوونەی لینین بۆ ئەم خالاٌنە دەگەڕێتەوە:

١- ئەوکاتە روسیا ببووە ناوەندێکی گرنگی خەباتی کرێکارانی شۆڕشگێڕ لە جیهاندا، پاش ئەوەی لەوەوپێش لە وڵاتانی دیکەدا بوو، وەکو: ئەڵمانیا، بەریتانیا، فەرەنساو ئەمریکا. لینین دەرکی بە پاشەڕۆژی سەرکەوتنی ئەم خەباتە بە ئەزموون وەرگرتنی لە شکستی ناوەندەکانی دیکە، کردبوو، بۆیە تەنانەت شکست‌و نوشستی کاتی ڕاپەڕین‌و شۆڕشی ١٩٠٥ و ١٩٠٧یش ڕێبازی پیٚ‌نەگۆڕی‌و سوور بوو لەسەر بەرپاکردنی شۆڕش‌و ڕاپەڕین لە کارگەو شارەکانەوە.

٢- هاوشانی روسیا، ئەودەمە ئومێدێکی گەورە بە خەباتی ئینتەرناسیۆنالیزم هەبوو کە لەسەرانسەری ئەورووپادا یان لە چەند وڵاتێکیاندا بە روسیاشەوە پێکەوە شۆڕشی پرۆلیتاریا هەڵبگیرسیٚ‌و سەربکەویٚ. لەبەر ئەوە داپڕینی ڕوسیا لەو ڕەوتە گشتیە

‹٣› لینین. استیقاظ آسیا. مجموعة مقالات، دار التقدم موسکو ص: ١٢

بە گرتنەبەری ڕێبازی شۆڕشی درێژخایەن هەڵەیەکی ناهەموار دەبوو.
٣- دەوڵەتە ئیمپریالیستیو کۆنەپەرستەکان پێیان دەکرا بە جەنگو چەک، هاوئاهەنگی لەگەڵ ڕوسیای تزاردا بکەنو شۆڕشی درێژخایەن (بەتایبەتی بۆیەکسەرجاری هەڵگیرسایی) لەناوبەرن

لەبەر ئەوانە، ئەودەمە شۆڕشی درێژخایەن نەکرایە ڕێبازی سەرەکی ڕزگاری کرێکارانو گەلان، هەرچەندە جەنگی پارتیزانیش لەمێژبوو سودەکەی دەرکەوتبوو. دەشزانرا کاریگەریشە، چونکە مارکسیەکان، بابەتیانە ڕووداوو دیاردەکانو ڕەوتی خەبات هەڵدەسەنگێنن، مارکسیزم فەلسەفەیەکی ڕیالیستییە، خەیاڵستی نییە، لە ڕیالەوە بۆ ڕیال، نەک لە خەیاڵەوە بۆ خەیال، ڕاستی هەڵدەگۆزێ.

پاش ئۆکتۆبەر، چەندین ئەزمونی کلپسەندووی دیکەی کرێکارانو گەلان، خرۆشان. بەلام بەداخەوە لەبەر گەلێ هۆی بابەتیو خۆیی‌و عسکەری، شکێندران. لە گەرمەی تراژیدیەتی ئەم شکستەدا پێشبینی چاوەڕوانکراوی (بێداری ئاسیا) هاتەدی. ئەوە بوو شۆڕشەکانی هیندو تورکیاو ئێرانو میسرو عێراق (بەداخەوە جگەلە کوردستان کە نەخراوەتە ڕیزی شۆڕشەکانەوە بەڵکو لینینو دەوڵەتی ئۆکتۆبەر پشتیوانی ڕژێمی ئەتاتورکو پاشای ئێرانیان کردووە). لینینو شۆڕشی ئوکتۆبەر ئومێدێکی زۆریان پێیان هەبووە، بەلام زۆربەیان تێکشکێندراون. هەرچەند تورکیا لەچاو هاوشێوەکانی لە ڕووی سیاسیەوە سەرکەوتوو بوو بەلام سەرەڕای پشتیوانی بێ دریغی لینینو پاش ئەویش وڵاتی ئۆکتۆبەر زۆری نەبرد شۆڕشەکە هەڵگەڕایەوە بۆ دژترین شۆڕشی چەواشەی ناوچەکەو کەوتە ڕیزەی کرێکارانو زەحمەتکێشانی وڵاتەکەو گەلانی وەکو کوردو ئەرمەنو چەرکەسیەکانیان سەرکوت کرد. هەناسە کورتترین ڕژێم بوو لە شاردنەوەی ناوەڕۆکی چینایەتی چەوسێنەرانەیانو هەر ئەوسا دەرکەوت بۆرژواو وردە بۆرژوای میللەتانی دواکەوتوو هەتا چەند پابەندی دروشمی ئازادیو دیموکراسین.

لاوازی دەسەڵاتی شۆڕشی ئوکتۆبەرو سەرنەکەوتنی بزووتنەوەی کرێکارانی جیهان، وایان لە لینینو ڕێبەرایەتی ئوکتوبەر کردبوو، بۆ پاراستنی شۆڕشەکە جگە لەو سازشەی (برێست - لیتۆفسک)، مانۆڕی سیاسی گەورەش لەگەڵ ئیمپریالیزم بەڕێوە بکەنو بۆ ئەمەش چاویان لەگەڵێ ڕاستی نیشتمانی لە جیهاندا پۆشیوە. لەوانە گەوهەری بۆرژوا- نیشتمانی ئەو سەردەمەیە کە هەر زوو شۆڤینیەتو کۆنەپەرستیان دەرکەوتبوو، چ بەرامبەر کرێکارانی خۆیان، چ بەرامبەر نەتەوە

ژێردەستەکانیان، وەکو کوردو ئەرمەن لە کوردستانو ئەرمەنستانی کوردستانی تورکیا. سیاسەتی کەمالیە شۆڤێنیەکان لە کۆنگرەی پاریسو دژایەتیو سەرپێچیکردنی پەیمانی سیڤەر (١٩٢٠) بەڵگەیەکی زیندووی ئەو سیاسەتەیە. هەر ئەو سیاسەتەی شۆرەویش چاوی پێ لە گەوهەری رژێمە بۆرژوا تازە سەرکەوتووەکان پۆشی (هەڵبەتە مێژوو دەریخست ئەو سیاسەتە هەڵەی گەورەیان تێدا بووە.) بێگومان رژێمی تورکیاش زیرەکانە دەجولانو پەیتا پەیتا پەیمانیان بۆ شورەوی نوێ دەکردەوە بەتایبەتی لەکاتی کۆنگرەی پاریسدا (١٨ی کانونی دووەمی ١٩١٩)* کە ریاکارانە ڕێبەرایەتی شۆڕشی بۆرژوازی تورکیا دەیانگوت:

" لەسەر هەمان ڕێگای ململانێ کردنی ئیمپریالیزم لەگەڵتان نین، مەیدانی خەباتمان دژی ئیمپریالیزم لە هەمان کاتدا هێڵی بەرگری ئێوەشە، بۆیە واتان لێ چاوەڕوان دەکەین پشتگیریمان بکەنو پارەو چەکمان بدەنێ "<٤>.

ئەمە بروسکەی رژێمی تورکیایە بۆ شورەوی.وەکو گوتمان مانۆری دەرەکی شۆرەوی وای لێکردبوون چاو لە زۆر شت بپۆشن، بۆیە لەگەڵ ئەم زیرەکییەی کەمالییەکان، بەرژەوەندییە سیاسیەکان هاوئاهەنگ بوونو ئاکامیش قازانجە گرنگەکەی بۆ رژێمی بۆرژوای تورکیا گەڕایەوە. تەنیا یەکەمین جاری یارمەتیدان، یەک میلیۆن رۆبل زێڕ دراوە بە ئەتاتورکەکان. جگە لە کەرەسەی جەنگینی زۆری دی. هەروەها چەندین پەیمانی سیاسی ـ عەسکەری دووقۆڵی گرنگیش لەگەڵ تورکیادا، (کە هەمووشی لە قازانجی تورکیا بووە) لەکاتێکدا مۆرکراوە نەک رژێمی بۆرژوای (ئەتاتورکە تازە سەرکەوتووەکان ئامادەی دانی مافە دیموکراتیەکان بە گەلانو خەڵکی تورکیا نەبوو، بگرە لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢١دا، ١٧ سەرکردەی حیزبی کۆمۆنیستی تورکیاشیان لە سێدارەداو چەوسانەوەی توندیان دژی کرێکارانو رۆڵە شۆڕشگێڕەکانیان پێڕەو دەکرد.

گومان لەوەدا نییە، لە ڕووی تاکتیکییەوە شورەوی سودی لەو سیاسەتانە وەرگرتووە. بەڵام کە ئەو سوودە تاکتیکیە لەسەر حسابی ئامانجی ستراتیژی خەباتی

---

* لە کۆنگرەی سوڵحی پاریسدا (١٩١٩) بەتەواوەتی کوردو ئەرمەن چەواشە کرانو کرانە قوربانی ئیمپریالیزم.

<٤> النعيمي. د. احمد نوري ـ تركيا و حلف الشمال الاطلسي. المطبعة الوطنية، عمان/اردن ١٩٨١ص:٥٣

رزگاریخوازانەی کوردو ئەرمەن کەوت‌و شورەوی دەستی لە ئەرمەنستانی گەورە بەپێی پەیمانی ١٦ی ئاداری ١٩٢١ ددانی بە سنووری باکوری ڕۆژهەلاتی تورکیا، بۆ تورکیا ناو دەستی لە ویلایەتی قارس‌و ئەردەهان هەلگرت. دوای کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس‌دا دەستبەجێ پەیمانی دۆستایەتی‌و بێ‌لایەنی لەنێوان هەردوو وڵاتەکەدا هەر لە پاریس‌دا مۆرکرا، واتە (پاش باس‌وخواسی کێشەی موسل) ئەم پەیمانەش سالی ١٩٣٥ نوێ کرایەوەو ناوەرۆکیشی ئەوەیە:

هەردوو لا هاوبەشی هیچ پەیمانێک یان بەشداری هیچ جۆرە کارێکی دوژمنکارانە دژی یەکدی نەکەن.

سالی ١٩٣٢یش هەشت ملیۆن دۆلار یارمەتی دیکەیان داوەتە تورکیا بۆ پێشخستنی پیشەسازی. دانەوەی نرخەکەیشی بێ سوود بووە. ئەمانە لەکاتێکدا ڕوویانداوە ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی کوردستانی بەشی تورکیا پاش سەرکەوتنی کەمالیەکان بە تەواوەتی لە ددان پێدانانی مافی کورد نائومێد بوون. بۆیە داوایان لە شورەوی دەکرد پشتیوانیان لێ بکەن، بەلام کۆمیسیاری هەندەرانی شورەوی بەپێی بۆچوونی (د.عەزیز شەمزینی) هەلوێستیان وابووە:

پاش ئەوەی لە مەسەلەکەی کۆلیەوەو هەلومەرجی ئەوسای جیهانی گرتەبەرچاو، بڕیاری‌دا پشتیوانی کوردو تورک نەکا بەلام بە ڕوونی پیشانی‌دا کە یەکێتی سۆڤیەت سۆزی خۆی بۆ خەباتی کورد دژی بەریتانیا دەبڕی<٥>.

نازانین داخۆ پشتیوانی‌لێکردنی ڕژێمەکان چۆنە؟ ڕێکەوتننامەی لەگەل مۆر کردوون، دەستیان لە خاک بۆ هەلگرتوون، پارەو چەکیان پێداون، لە سیاسەتی نێونەتەوایەتی‌دا پشتیوانیان لێکردوون. ئیدی بۆ (د.عەزیز شەمزینی) پاساو دەهێنێتەوەو پشتی بە چ سەرچاوەیەک بەستووە گوایە شورەوی لەنێوان کوردو تورک‌دا، بێ لایەن وەستابێ؟ لەوەش سەیرتر ئەوەیە (د.عەزیز) بۆ ئەوەی پاساو هێناوەکەی لای خوێنەر بچەسپێنێ لەو سێ دێرەدا کە باسی هەلوێستی شورەوی بەرامبەر کەمالیەکان‌و کورد دەکات، چاو لە باسە ڕاستەقینەکە دەپۆشێ‌و خوێنەر دەباتە سەر "سۆزی" شورەوی لەتەک کورد دژی بەریتانیا. باسیش باسی کەمالیەکانە کە ڕاستەوخۆ هەڕەشەیان لە چارەنووسی کورد کردووە. هەموو

---

<٥> شەمزینی، د. عەزیز. جولانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان. چاپی دووەم. چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ. ١٩٨٥ وەرگێڕانی فەرید ئەسەسەرد، ل: ٧٩.

کەسێکیش دەزانێ دژی بەریتانیا شورەوی نەک پشتیوانی، بگرە وەڵامی نامەی شێخ مەحموودیشیان لە ۲ی کانوونی دووەمی ۱۹۲۳دا نەدایەوە. پشتیوانی هەروا دەبێ! ڕەنگە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی شورەوی یان چەندین نووسەرو لێکۆڵەرو لێکۆڵینەوەی سیاسی باشیان لەسەر کورد نووسیبێ. هەر ئەمانەش لای (د.عەزیز) بوونە مایەی ئەو پاساوهێنانەوەیە. بەڵام ئەم جۆرە نووسینانەی شورەوی‌و لەسەر نووسینیشیان لەلایەن نووسەرانی دۆستی شورەوییەوە ئەو ڕاستیە مێژووییە روون ناکات کە سیاسەتی ڕەسمی شورەوی پشتگیری نەکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی هەموو پارچەکانی کوردستان‌و پشتگیری کردنی هەندێ لە دوژمنانی بووە. بۆیە هەتا دامەزراندنی کۆماری مەهاباد لای شورەوی ئاسایی بووە ڕاپەڕینەکانی کوردستانی تورکیاو ڕاپەڕینی سمکۆو هی شێخ مەحمودو بارزانیەکان بشکێندرێن. بێگومان کار کە بەو شێوەیە بەرێچووبێ جگەلە ئەرمەنستان، شۆڕشی ڕزگاریخوازانەی کوردستانیش. نەک پشتگیری نەکراوە، بەڵکو بە کۆنەپەرستیش دژی ڕژێمی (پێشکەوتنخوازی!) تورکیا لەقەڵەم دراوە. هەر بۆیە لەناو ئەو شۆڕشانەی ئەو سەردەمەدا کە لەژێر کارایی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە جیهاندا بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتدا پەرەیان‌سەند شۆڕشی کوردستان حیسابی بۆ نەکراوەو نەخراوەتە ریزی شۆڕشە چەکدارییەکانی چین‌و هیندو ئێران... تاد.

کاریگەری شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ئاسیادا: لە ئێراندا تێکشکا، لە تورکیادا دڕندانە هەڵگەڕایەوە، لە هیندستاندا خامۆشکرا، لە کوردستاندا سەرکوتکرا، لەعێراق‌و میسریشدا ژێرخرا... لەوانە مایەوە چین، پێچەوانەی ئەوان جگەلە ئاڵوگۆڕە سیاسیەکان، چەمکی عەسکەری نوێشی هێناکایەوە. ئالێرەدا دەبێ بگەرێین بەدوای دۆزینەوەی سەری گوریسی درێژخایەن‌و تیۆری جەنگی پارتیزانی.

## ٢- باری بابەتی و خۆیی

باری بابەتی ئەو بارە سیاسییە دور لە دەستکردو ئارەزوو خولْقاوەیە کەوا لەخۆڕا، خۆبەخۆ بەبێ بڕیار سەرئەنجامی توند بوونی ناکۆکی نێوان کارو سەرمایە، پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان و هێزەکانی بەرهەمهێناندا دەخولْقێ، نیشانەکانی خولْقانیشی ئەوەیە: چینکە سەرمایەدارە دەسەلاتدارەکان، خاوەنەکانی ئامرازی تایبەتی بەرهەمهێنان، کە بەهۆی سەرمایەداری زۆرو سیستەمی سەرمایەداریەوە کرێکاران بەکرێ دەگرن و ئاکامی کەلْکە بوونی ناکۆکیەکان، دەبنە کۆسپی پێشکەوتنی هێزەکانی بەرهەمهێنان و بەمەش تەنگوچەلْمەکان، کێشە چینایەتی و کۆمەلایەتی و سیاسییەکان دەتەقنەوە. تەقینەوەیەک کە لە دەستەلاتی ئەوان و لە بازنەی یاساو کۆنترۆلی دەزگا سەرکوتکەرەکانیان دەترازێ و هەلْدەچێ، ئیدی ناتوانن یان چیدیکە توانای بەرگە گرتنی دۆخی گرفتەکانیان، باری هەژاری ئابوری و سیاسی کۆمەلایەتییان نەبێ. ئەمەیان سەبارەت بە دەسەلاتداران لەلایەک؛ لەلایەکی دیکەشەوە خەلْکی چەوساوەش چیدی بە ڕژێمەکەو دۆخەکەو ژیانە ژێر دەستەکەیان ڕازی نەبن و پەنگاوی قینیان بتەقێتەوەو ڕاپەڕن. کەی وای لێهات ژێردەستە بە سەردەستە ڕازی نەبێ و سەردەستەش توانای دابینکردنی ژێردەستەی نەمابێ، ئا ئەمە نیشانە زەق و ڕەقەکانی لەباری بابەتین. باری بابەتیش ڕەخسانی هەلْکەوتی گەورەی بەرپاکردنی شۆڕشە.

باری خۆییش:

ئاستی بەرزی هۆشیاری شۆڕشگێرانە، واتە: حیزب دەگرێتەوە. حیزب بە واتای

ڕێکخستنی پۆلایین، هۆشیاری سیاسی بەرز، تاکتیک‌و ستراتیژی ڕاست، دروشمی دروست، خاوەن سەرکردایەتی ناسراوی لێوەشاوەی متمانە پێکراو،کادری تەرخان، پێشڕەوی چینی شۆڕشگێڕ. حیزبێک نەک هەر بتوانێت قۆزەرەوەی باری بابەتی بێت. بەڵکو خۆیشی دەستی شۆڕشگێڕانەو دەسیسەی سیاسیانەی لە پێکەیاندنیا هەبێ، بۆ: گۆڕینی بنەڕەتی کۆمەڵ‌و ژیانی کۆمەلایەتی، بۆ لێخستنی چینی کۆن‌و هێنانە سەر کاری چینی نوێ.

باری خۆیش، هەتا لەباری بابەتی‌دا زاخاو درابێ، پاشەڕۆژ سەرکەوتووتر دەبێ. بە پێچەوانەش ئەنجامی پێچەوانەی دەبێ. جاری واش هەڵکەوتووە باری بابەتی پێگەییوە، بەلام باری خۆیی نەخەملیوە، لەبری ئەم بارە خۆییەش ڕێکخراوی سیاسی دیکە، یان بزووتنەوەی سیاسی دیکە، بارە بابەتیەکەیان ژیرانە لەدەست نەداوەو لە ڕووی سیاسیەوە ڕژێمی دیکتاتۆریان ڕووخاندووە. یان داگیرکەریان ڕاماڵیوەو ئەلتەرناتیفی باشیان هێناوەتە سەرکار، وەکو کوباو جەزائیرو یەمەن‌و عێراق‌و میسر. بەلام ئەم جۆرە سەرکەوتنە سیاسی‌و عەسکەریانە زۆر ناباتە دووچاری گرفتی ئابوری‌و کۆمەلایەتی قوڵ دەبن، چونکە پێشڕەویان نەبووە. کوبا لەناو ئەمانە جیاوازە کە پاشان باسی دێتەسەر.

ئاشکرێ حیزبی پێشڕەویش هەبێ، واتە باری خۆیی خورت کرابێ، بەلام باری بابەتی نەخوڵقابێ، ڕاپەڕینی شارەکان یان شۆڕشی درێژخایەن بەرپا بکرێ‌و سەربخرێ. ئەمەیان وەکو پرۆسەی شۆڕشگێڕانە مەحاڵە. چونکە هەردەم ڕژێمەکان ئەگەر تەقینەوەی باری بابەتی بینی ستەمکاریان نەگوشێ هێندەیان لەباردایە، ڕاپەڕینی تەسکی شارەکان، یان مانگرتنی ئێرەو ئەوێی کرێکاران یاخود بزووتنەوەی چەند ساڵەی خاوەن سەدان‌و زیاتر چەکدار لەناو بەرن بگرە شالاوی توندیش بەرنەسەر بەهێزترین حیزبی سیاسی‌و ژیانی کوشندەش بگەیەننە سەرکردەو بنکردەیان بەلام هەر ئەو ڕژێمانە ئەگەر دەسەلاتی بەهێزر ئۆرگانی تۆکمەشیان هەبێ، حیزبی پێشڕەوی کرێکارانیش نەبێ، ناتوانن بە ئاسانی لەژێر تەوژمی گرفتە قوڵەکانی باری بابەتی دەرباز بن، بە مەرجێ بزوێنەرێکی هەبێ، وەکو ڕاپەڕینی گەلاتی قارەمانی ئێران‌و ڕاپەڕینی گەلی فەلەستین چونکە: باری جۆشخواردووی بابەتی سەراپای ڕژێمەکە داوودەزگا ئابووریەکەی تێکڕا دەهەژێنێ‌و دەتەپێنێ. بەلام چالاکی حیزبی یان بزووتنەوەی پارتیزانی دەیان مەفرەزەش دەتەپێنێ. بەبێ باری بابەتی تەنها فشارو گوشاریان پێ دەخرێتە سەر بەشێ یان دەزگایەکی یاخود شارو

کارگەو ناوچەیەک، چارەسەرکردنی ئەمانەش بۆ ڕژێمی دەسەڵاتدار گران نەبووەو نییەو ناشبێ. زۆرجاریش هەڵکەوتووە، باری بابەتیو باری خۆییش چەشنی پەیکەرتاش سازی کردبن، دروست بوون، بەڵام ڕێبەرایەتی ڕاستڕەوی حیزبەکان، سیاسەتی سازشکارانەیان دەیان هەلی مێژوویی کرێکارانو گەلانیان لەبار بردووەو دوژمنانیان دڕترو قەڵەوتر کردووە. وەکو: ڕاپەڕینی چلەکانو پەنجاکانی ئێرانو خامۆشکردنیان لەلایەن (حیزبی تودە)وە. ڕاپەڕینەکانی چلەکانو پەنجاکانی عێراقو نەقۆزتنەوەیان لەلایەن حیزبی شیوعی عێراقەوە. هەروەها هی میسرو سووریاو سودانو تورکیا لە ڕۆژهەلاتداو هی بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاو نەمساو ئیسپانیاش لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا.

لەو کورتە باسە تیۆرییەی باری بابەتیو خۆیی، دێینەوەسەر بنچینەکانی شۆڕشی چینو چۆنیەتی بەرپاکردنو سەرکەوتنی هەتا تیۆری جەنگی پارتیزانی شۆڕشی درێژخایەنی گەلانی ژێردەستەی بێهێز دژی دوژمنانی بەهێز دیاری بکەین کە شۆڕشی چین گۆڕی خستەوە گیانی گلاوی زۆربان.

سەرکەوتوانە لە جەنگی یەکەمی جیهاندا هاتبووە دەرو بە ئەندازەی دووربینی سیاسەتەکانیان (بەتایبەتی بەریتانیاو فەرەنسا) ڕووپێوی سەرزەمینە داگیرکراوەکانیان دەپێواو دەبەشیەوە. لە کۆنگرەو کۆنفرەنسە ئاشکراو نهێنییەکانیاندا ئەوەی بیانویستباو بیانخواستبا، بێ دڵی خۆیان نەدەکرد. هەڵبەتە بەهێزتریان زۆرترو کەم هێزتریشیان کەمترینیان تالان دەکرد. وا بوغرا بوو بوون پاش جەنگ هەریەکە لەو دەوڵەتانە دەیانویست (کۆمەڵەی گەلان ١٩١٩)بەوپێیەی دەیانەوێ دامەزرێو هەڵسوڕێ. ڕووپێوی خاکە داگیرکراوەکانی ژێر ڕکێفی ئینگلیز ٣٥ میلیۆن کیلۆمەتری دوجا زیاترو ژمارەي دانیشتوانیان ٤٥ . ملیۆن کەس دەبوو. فەرەنسا لە خوار ئینگلتەرا خاکی زۆری بەرکەوتبوو. کەچی ئەمریکا لە هەموویان دەوڵەمەندتر بوو. بگرە قەرزیشی دەدایە ئینگلتەراو فەرەنساو دەوڵەتانی دیکەی سەرمایەداری. بۆ نموونە: پێشجەنگ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ساڵانە (٢٠٠) میلیۆن دۆلاری قەرز دەدانێ. بەڵام پاش جەنگ ئەم ڕێژەیە هەڵکشا بۆ (١٤) میلیارد دۆلار. واتە بە پارەی ئەمریکا جەنگیان کردووەو کێشەکانی پاش جەنگیان چارەسەر کردووە. کەچی سەرباریش ئەمریکا (١٣٥-١٤٠) هێندە لە ئینگلتەراو ٤٥ هێندە لە فەرەنسا خاکی کەمتر بەدەستەوە بووە. کە بەوپێیەش جیهان کەوتبێتە ژێر دەستی بەریتانیاو فەرەنسا سەرکەوتووش بوونو ئەڵمانیایان

شکاندبێ، ئەمریکا دوور بێ‌و کەمترین خاکیشی بەدەستەوەبێ، هەڵبەتە چارەنووسی سیاسی گۆی زەوی‌بەدەکەوێتە دەستی دوو دەوڵەتە زاڵەکەو ئەمریکا پاشەکشە دەکات.

ئیمپریالیزم لەپاش کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان‌و دامەزراندنی (کۆمەڵەی گەلان) لەچاو سەرەتای سەرهەڵدانی تازە کەوتبووە سەر حوکم‌کردنی جیهان‌و سەرەتای ئەزموونی سیاسی-عەسکەری-ئابووری جیهانگیری پێڕەو دەکرد. کە ئەگەر لەگەڵ ئێستا بەراوردی بکەین، سیاسەتێکی ئیمپریالیستی دواکەوتوانە، نوقمی کۆنەپەرستانە، دڕندانەو دژی مرۆڤ‌و مرۆڤایەتیان پێڕەو دەکرد. تەواوی کردو کۆشیان لەپێناوی دابینکردنی هەرچی زۆرتری تالان‌و دزین‌و بەکارهێنانی زیاتری کاری هەرزانی هەزارانی ولاتە ژێردەستەکان بوو. لەسەر بچووکترین داخوازی نیشتمانی‌و دیموکراسی، سەدانیان دەکوشت‌و هەزارانیان دەگرت. لەسەر زیادکردنی پەنجا فلسی ڕۆژانەو کەمکردنەوەی نیو سەعاتی کار، قسابخانەیان بۆ کرێکاران دەنایەوە. خۆماڵی کردنی نەوت‌و کەرەستەی خاوی گەلان بۆ بەدیهێنانی ڕیفۆرمی کشتوکاڵی، گەورەترین تاوانی سیاسی بوو کە چاویان هەرگیز لێنەدەپۆشی. کۆمۆنیزم‌و بزووتنەوەی کۆمۆنیستی قورسترین سزایان لەسەر هەبوو. لە جیهانبینی ئیمپریالیستانەی ئەوساوە ئیمپریالیزم دەیڕوانیە چارەنووسی گەلان. لە کۆیلە بەولاوە هیچی‌کەیان پێ ڕەوا نەدەبینین. خۆ ئەگەر ئاوڕێکی (مرۆیانەشیان!) لەنەتەوەو نیشتمانێ دابێتەوە، پێش هەموو شتێک بەرژەوەندی ئیمپریالیستانەیان لەبەرچاوگرتووە ئینجا بڕیاری چۆنیەتی ماف‌پێدانی ئەو ڕژێمانەیان داوە کە بە خۆیانیان شەتەک داوون. بۆ بردنە سەری سیاسەتەکانیشیان، لەبەرامبەر کاردانەوەی گەلاندا، چ سیاسی‌و چ عەسکەری، بێ منەت بوون چونکە جگەلەوە توانیبویان چەندین ڕاپەڕینی کرێکاران‌و شۆڕشی گەلان سەربکوتن. ئەم سەرکەوتنە عەسکەریانەش، چەشەی ئیمپریالیستانەی کردبوون.

لەوسەردەمەدا چین گرنگترین ولاتی ئاسیا بوو، ڕاستەوخۆ کارایی لەسەر چارەنووسی هیندی چین‌و شیوە کیشوەری هیندو چەندین ولاتی دیکەی ئاسیا هەبوو. هەروەها هی ولاتانی دیکەش. ئەمە جگە لە سەرزەمینە بەپیت‌و فەرەکەی هاوسنووروو هاوخەباتیەکەشی لەگەڵ شورەوی‌دا سەرباری خەمی ئیمپریالیزم. بۆیە ئیمپریالیزم زۆری لا مەبەست بوو چینیان لەدەست دەرنەچێ. بە جۆرەها نەخشەو پیلان دەسیسەیان دەسازاند بیکەنە بنکەیەکی گەورەی شۆڕشی چواشە، بەدرێژایی

مێژوو دەسەڵاتدارانی ئەوروپای ڕۆژئاوا نەتەوەیەکیان کردۆتە داردەستی دەسیسەکانیان. هەمیشەش گەلانی سلاڤی‌یان بۆ ئەم مەبەستە دەخستەکار، بەتایبەتی رووس‌و گەلانی نار قەڵەمڕەوی روسیای تزاری. ئەو سەردەمە کە سوورەویان لەدەست چووبوو، گەلانی دیکەی سلاڤیش ڕاچەنیبوون‌و کەوتبوونە خەبات کردن‌و لێیان نائومێد بوو بوون. چینییەکان‌و هیندییەکان، باشترین‌و زۆرترین خەڵکی سەرزەمین بوون ئیمپریالیزم بۆ داردەستایەتی هەڵیانبژاردبوون، هەتا بیانکەنە نووکە ڕمی شۆڕشی چەواشەیان. بەتایبەتی چین پێش‌و پاش جەنگی یەکەم، بزووتنەوەی نیشتمانی‌و دیموکراسی کارێگەری، تیا بەرپەرایەتی (سن‌یان‌سن)و حیزبی (کۆمینتانگ) تەقیبووەوە. ئەم بزووتنەوەیە ساڵی ١٩٢٤ سەرکەوت، سەرکەوتنەکەش بزووتنەوەی نیشتمانی میللەتانی ژێردەستەو ئینتەرناسیۆنالیزمی ئومێدەوارتر کرد. کەواتە: ئیدی چۆن ئیمپریالیزم پاش شۆڕشی ئوکتۆبەر لێدەگەڕێ شۆڕشێکی وا ببێتە ئوکتۆبەری گەلانی ژێردەستە. بۆیە: پاش ٣ ساڵ لەسەرکەوتنی شۆڕشی بۆرژوایی چینی، شۆڕشی چواشە بە کودەتای (کانتون ١٩٢٧) دەستی پێکردو سەراپا چینی تەنییەوە. (شان‌کای‌شێک)یان بەناوی هەمان حیزبی نیشتمانییەوە (کۆمینتاگ) بەردایە گیانی هەزاران هەزار شۆڕشگێڕو کوشتن‌و گرتنی کۆمۆنیستەکان کرایە ئامانجی پیرۆزی... کودەتاکە: سیاسەتی کۆلۆنیالیستی کلاسیکی بەوپەڕی توندی پیادە دەکردو پێچەوانەی سەردەمی سەرکەوتنی شۆڕشی بۆرژوایی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان کە دژی دەرەبەگ بوون، لەچیندا دەرەبەگایەتی چەسپی. ئەو دەوڵەتە سەرمایەدارانە کە بوونە ئیمپریالیستی‌و جیهانی ژێردەستەیان دابین کرد، بەرژەوەندی ئەوسایان، چ لە ڕووی ئابووری‌و چ لە ڕووی کەم ئەزموونیان بێ، وایدەخواست پشتیوانی دەرەبەگایەتی کۆنەپەرست دژی بۆرژوای پێشکەوتنخواز بکەن. دژی رزگاری جوتیاران‌و دژی پێشخستنی پیشەسازی وڵاتانی ژێر دەستیان بوون‌و ئازادی سیاسی‌و ماف‌و هەستی نەتەوایەتیان پێشێل دەکردن

لە چینیشدا دەرەبەگ‌و دەرەبەگایەتی بوژایەوە، جوتیاران دووچاری ئاستەنگی کۆمەڵایەتی کەم وێنە کرانەوە، ئازادی‌و دیموکراسیەت پێچرایەوە، میلیتاریستیەت‌و دیکتاتۆریەتی بێ پەردە سەپێندرانەوە، شۆڕش لەگەڵ شۆڕشی چەواشە ڕووبەڕوو بوونەوە. لەم دووڕیانەدا، ڕێبەرایەتی حیزبی کۆمۆنیست کەوتە ناو ئەزموونگایەکی نوێی مێژوویی کە داخۆ: " ئەمری واقیع " بسەلمێنێ‌و پاساوی (ستالینیەت‌و

ستالین) لەسەر مانەوە لەناو (کۆمینتانگ)دا بۆ بڕینی قۆناغی بۆرژوازییەت بە ڕێبەرایەتی چینی بۆرژوا بە ڕاست بزانێ یان: ئەرکی تەواوکردنی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسی بگرێتە ئەستۆو بەرسنگ لە شۆڕشی چەواشە بگرێ؟ ئەگەر درێژەشی بە شۆڕشدا بۆ تەواوکردنی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسی، چۆنی بدا؟ ئەزموونی ئۆکتۆبەر دووبارە بکاتەوەو خەریکی کرێکاران و بوژانەوەی شوراکان و ڕاپەڕینی شارەکان بێ؟ یان بیر لە ڕێبنوێنی خەبات بکاتەوە؟

زۆربەی ڕێبەرایەتی گەلان بەپێی بارودۆخی جیاوازی میللەتەکانیان دەکەونە دۆخی واوە کە بلیمەتیەکی هەڵکەوتوانەی گەرەکە ئایندەیان بپێکن، بەڵام مێژوو دەڵێ: مخابن، کەمی ئەو ڕێبەرانە کاروانیان گەیاندۆتە مەنزڵ. یەکێکی دەستنیشانکراوی ئەو کەسانە ئەگەر بمانەوێ بابەتیانە ڕووداوەکانی ئەم سەدەیە هەڵسەنگێنین، ڕێبەرایەتی شۆڕشی نوێی چینە. لە بازنەی ئەو بابەتیە ناترازێین ئەگەر بڵێین: ڕێبەرایەتی شۆڕشی چین، پێشەنگی ئەو کەسانەی ناو گەلانی دواکەوتووی داگیرکراوە. ئەویش نەک بە لاسایی بەڵکو بە داهێنانی ڕێبازی نوێی شۆڕشی نوێی تایبەت بە وڵاتەکەیان شۆڕشی درێژخایەن.

## ١/٢- شۆڕشی چین

لەپاڵ شکستی شۆڕشی گەلان، یەکەمین شۆڕشی بۆرژوا نیشتمانی چین (١٩٢٤-١٩٢٧)و پاش کودەتا کۆنەپەرستیەکەی (شانکای شیک)یش درێژەپێدانی ئەم شۆڕشە لەلایەن حیزبی کۆمۆنیستی چینەوە بۆ بەدیهێنانی باقی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسی بە شۆڕشی درێژخایەن، ئاسۆی بێداریەکەی خەباتی ئاسیای ساماڵ کردو خۆگرتن و سەرکەوتنی پەیتا پەیتای شۆڕشەکەش، دەریخست کە ڕێبازی عەسکەری شۆڕشگێڕانەی نوێی چارەسەرکردنی چارەنووسی هەندێ لەگەلان (نەک هەموویان) لە دۆزینەوەدایە. ئەویش: شۆڕشی درێژخایەنی ئەو گەلانەیە، شۆڕشێ لەتەک هەلومەرجی گشتیی و تایبەتی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و جوگرافیی و عەسکەریاندا دەگونجێ.

بۆئەوەی بنچینەی باسەکە بە چەشنێکی بنچینەیی ببەستینەوە بە ناوەرۆکی باسەکە وا پێویستە لەسەر چین وەکو مەڵبەندی سەرەکی سەرهەڵدانی شۆڕشی درێژخایەن لێتوێژین، پاشان چەند نموونەیەکی دیش بهێنینەوە. هەتا تیزی ئەو ئەزموونانەی پێویستن لەگەڵ بزووتنەوەی گەلەکەماندا بەراورد بکرێن، بزانرێن و

سەرەنجامیش ئەو ئەنجامە هەڵگوزین کە: داخۆ شۆڕشی درێژخایەن... دەگوێردرێ یان نەگۆڕە؟ بێگومان وەڵامی پرسیاری واش لە باری بۆچوونی چینایەتی ناکۆکەوە دەدرێتەوە کە هەریەکێکیان ڕەنگرێژی بەرژەوەندی چینایەتی دژن... هی کرێکاران‌و بۆرژواکان!

پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر شۆڕشی سەرکەوتووی درێژخایەنی چین کاریگەرترین شۆڕشی جیهانە چاوی لێکرابێت‌و پێڕەو کرابێ‌و باس کرابێ‌و لەسەری نووسرابێ (هیچ نەبێ لە ڕووی عەسکەریەوە). سوودێکی زۆری گەیاندۆتە گەلان‌و گورزێکی گەورەی سرەواندۆتە دوژمنان. کە واش دەڵێین، مەبەستمان چاوپۆشین نییە لە هەڵە تیۆری‌و سیاسی‌و ئایدیۆلۆژیەکانی حیزبی کۆمۆنیستی چین کە بەتایبەتی لە پاش سەرکەوتنیانەوە هەتا هاتووە زیاتر دەرکەوتوون. ئەوەی مەبەستمانە دەرکەوتنی ئەو هەڵانە نابێ وامان لێ بکات لایەنە گەشەکانی پشتگوێ بخەین. قۆناغەکان وێکبچوریەی‌و بە ئارەزوو چاکەو خراپە تێکبشێلین. نەخێر، هەڵە هەڵەیەو ڕاستیش ڕاستییە. ئەم دوو جەمسەرە وەکو باقی دیاردە ناکۆکەکانی کۆمەڵ‌و سروشت تەواوکەری یەکدین‌و بێ‌یەک لە تەرازووی مێژوودا ناگێشرێن، کەواتە: مەبەستی باسەکە لایەنی سەرکەوتووی چەکدارانەی شۆڕشەکەیەو یاسای نەگۆڕیش وەکو وێستراوەو دەوێستری وا دەردەخرێ‌و هەتا ڕزگاری دوا میللەتی ژێردەستە پێڕەو بکرێ؟

ئایا بەئاسانی ئەم جۆرە شۆڕشانە لەناو هەموو وڵاتێک‌و میللەتێکی داگیرکراو، دەرەبەگ‌و نیمچە دەرەبەگدا، سەرکەوتووەو سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ؟ با کورتە وەڵامێکی ئەم پرسیارانە بدەینەوەو پێشەکی وەڵامەکەش ڕوونکردنەوەیەکی تیۆری هەڵدەگرێ. هەتا لەبەر ڕۆشناییەکەی پرسیارەکان شی بکەینەوە.

شۆڕشی نیشتمانی-دیموکراسی بە شێوەیەکی گشتی‌و بابەتی، وەکو شۆڕشی کۆمەڵایەتی کرێکاران بەبێ باری بابەتی‌و باری خۆیی، نەک جارێ بەڵکو دەیان جاریش بەرپا بکرێ، باشترین چەک‌و سەرکەوتنی گەورە بهێنێتەدی.

## ٢/٢- چۆنایەتی شۆڕشی چین

چین، لەڕووی سەرژمێری دانیشتوان‌و ڕووپێوی سەرزەمینەوە، بۆ یەکەم یەکەمین‌و بۆ دووەمیش سێهەمین وڵاتی سەرزەمینە. لەو هەلومەرجەدا شۆڕشی تێدا

هەڵگیرسا، چوارسەد ملیۆن تێپەڕ بوو؛ وڵاتەکە ئەگەرچی مەڵبەندێکی دێرینەی شارستانییەتو بەفەڕو پیتە، بەڵام سەدان ساڵ دەبوو سیستەمی دەرەبەگایەتی‌و بیروڕای مەزهەبی کۆنەپەرستانە، بێکاری‌و تریاک کێشان، سۆزانیتی‌و کۆیلە فرۆشتنو دەیان نەریتی دیکە، ناپۆتیان کردبوو. ئیمپریالیزم بە تایبەتی ژاپۆنو ئەمریکاو بەریتانیا، نەخشەکانیان دەنەخشاند، سیاسەتی کۆلۆنیالیستی کلاسیکیش بەجارێ چینی لەژێرباری چەوساندنەوەدا چەماندبووەوە. بێگومان لە وڵاتێکی‌وا گەورەو گراندا تاسەر مەرام بە گوێرەی چەشەی چەوسێنەران ناچێتەسەر. بۆیە شۆڕشی بۆرژوازی چین تەقیەوەو سەریش کەوت. هەر بۆیەش ئیمپریالیزم پێی گران بوو ئەم شۆڕشە بۆرژواییە قۆناغەکانی بێگرفت بگەیەنێتە ئاکام.

سەرکەوتنی شۆڕشی بۆرژوایی ساڵی ١٩٢٤ ڕەوتی ڕووداوە کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکانی چینی گۆڕی، هۆشیاری کۆمەڵایەتی‌و سیاسی، چینایەتی‌و کلتوری پەرەیان سەندو خەڵک تەوقی کۆنەپەرستی ڕاپسکاند. کورتیەکەی ئەوەی لە هەزرو سەدان ساڵ سەپا بوون، شۆڕش بە ماوەیەک گۆڕینی‌و هەڵیگێڕان. ئەمەیە مەزنی شۆڕش. هەر بەڕاستی شۆڕش لە ڕیشەوە گۆڕینی کۆمەڵە. لەمێژە گوتراوە کەوا: شۆڕش بە خێراییەکی سەیر نەک سەرکردایەتی، بەڵکو جەماوەریش فێر دەکات.

لەناو شۆڕشی نەتەوە ژێردەستەکان چین زیاتر لە هەمووان، مایەی بایەخ پێدان بوو. پاش لینین، کۆمینترن (ئینتەرناسیۆنالیزمی سێیەم) بایەخێکی بەرچاوی پێداو ئەوەی پتر بووە مایەی سەرنجیان، کێشەی جوتیاران بوو بگرە کێشەی جوتیاران لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا بەگشتی، ناوەرۆکێکی گرنگی سیاسەتی کۆمۆنیستەکانی ئەو سەردەمە بوو (نەک ئەم سەردەمە).

لەبەر ئەوەی سیستەمی دەرەبەگایەتی زاڵ بووەو سەدان میلیۆن جووتیار بێ زەوی‌و مەزرا بوون. بۆیە کێشەی جووتیاران گەوهەری شۆڕشی دیموکراسی کۆن بووە. چونکە ئەوسا جیهان وەکو ئێستا سیستەمڕێژی سەرمایەداری نەکرابوو، بازاڕی هاوبەشی وا نەبوو، بۆرژوای نیشتمانی نەخرابووە ژێر ڕکێف... تاد. لەبەر ئەوانە کێشەی جووتیارانو ڕاپەڕینی جووتیارانو بزواندنی جووتیاران دژی دەرەبەگایەتی بۆ ئیمپریالیزم خەتەرێکی گەورە بووە. سەرنج بدەین کۆمینترن لە کۆنگرەی ئایاری ١٩٢٣دا چۆن سەرنجی حیزبی کۆمۆنیستی چینی ڕاکێشاوە، ئەوسا گرنگی جوتیاران دەزاندرێ: کێشەی جووتیاران بەتایبەتی کێشەیەکی

سەرەکییە لە تەواوی سیاسەتدا.
ئەمانە رای ستادی کرێکارانی جیهانە سەبارەت بە شۆڕشی گەلێکی دواکەوتووی ژێردەستە. جا با شەن‌و کەوێکی بکەین‌و بزانین وایە؟. ئەوکاتە چین‌و چینیەکان ٨٠٪ جووتیار بوون. ستەمی دەرەبەگایەتییان لەسەر بووە. شۆڕشی بۆرژوازی بە سەرکردایەتی بۆرژوای نیشتمانی لە بەدیهێنانی ئەرکەکانی شۆڕش هەڵگەڕاو لە داخوازی جووتیاران وەرگەڕا. هاوپەیمانێتی حیزبی کۆمۆنیست‌و کۆمینتانگ داتەپی‌و یاسای ریفۆرمی کشتوکاڵ تێکدراو بێزارییەکی بێ ئەندازە لەناو جووتیاراندا خرۆشا.
ڕاستە تەنها لە مانگرتنێکدا حیزبی کۆمۆنیست توانی (٦٠٠٠٠) هەزار کرێکار هانبداو سەکەوتنێکی گەورەشی بۆ حیزبە کۆمۆنیستەکانی وڵاتە دواکەوتووەکانی ئەو سەردەمە هێنایەدی. بەڵام ئەم سەرکەوتنە چینایەتی-سیاسییە رەوتی رووداوەکانی چینی نەگۆڕی‌و یاسای گەشەکردنە کۆمەڵایەتییەکانی نەخستەی باری سەرمایەداری تەواوەوە جێگۆڕکێی بە چینەکان‌و هەڵوێستی چینایەتییانی نەکرد. بۆ نموونە: تەنها چەتە چەکدارەکانی دەرەبەگەکان کە بەناوی (منتوشان)وە تالانیان دەکردو زوڵمیان لە جووتیاران دەکرد، لە سێ ملیۆن کەمتر نەبوون. کە ئەوکاتە سەرژمێری سوپای رەسمی چین دوو میلیۆن بووە. واتە لەشکری چەوسێنەری دەرەبەگان بەهێزتر بووە لە هی دەوڵەتەکە (منتوشان)ەکان ملۆزمی خوێنخۆری جوتیاران بوون‌و رژێمە کودەتاچیەکۆنەپەرستەکەش پشتیوانی لێدەکردن. کە حاڵیش بەو شێوەیە بوویی‌و گەوهەری شۆڕشی دیموکراسی پێشێل کرابێ، کەواتە بەڕاستی کێشەی جووتیاران دەبێتە کێشەی سەرەکی شۆڕشی چین دژی شۆڕشی سەرکەوتووی چەواشە بۆ تەواوکردنی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسی.

## ٣/٢- شۆڕش لەکوێ؟

لەشار یان لە شاخ؟ کودەتاکە سەرکەوت‌و مانگرتنی کرێکارانیش تێک شکاو شۆڕشگێران کەوتنە بەر ڕاوەدوونان، شۆڕشی ڕاپەڕین کردن لە شاردا چەشنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، لاسایی کردنێکی ژێرکەوتوانە بوو.
(ستالین)یش وای پێ پەسەند بوو پاش کودەتاکەش، حیزبی کۆمۆنیست هاوپەیمانێتی خۆی لەناو (کۆمینتانگ)دا درێژە بداتی‌و زۆرینەی ڕێبەرایەتی حیزبی کۆمۆنیستی چینیش، لەو هەلومەرجەدا، ئەو سیاسەتەیان دەسەلماند.

بەڵام باڵی چەپی حیزبەکە ئەو سیاسەتەی نەسەلماندو ڕێبازی چەپی چەکداری خەڵک لەناو شارەکاندا بەڵکو لەناو جووتیارانەوە خستە ڕوو. سەرەتا ئەم بۆچوونە بە توندی ڕەتکرایەوەو ڕێبەری ڕاستڕەوی ئەوسای حیزبەکە (لیتشن تومو) مەیلی دۆستایەتی کۆمینتانگ بەو پێیەی ستالین دەیویست بەسەریدا زاڵ بوو، تەنانەت دژایەتی کردنی دەرەبەگایەتیشی خاو کردەوە، نەکا ڕژێم پێی قەڵس بێت. کە ڕاپەڕینی جووتیاران هەر کراو سەرکوتیش کرا، کۆمیتەی ناوەندی (موتسیتۆنگ)یان دەرکردو لە مەکتەبی سیاسیشیان خستو بەیاننامەشیان دژی دەرکردو ئەو بزووتنەوە جووتیارییەی مار ڕێبەرایەتی کرد ناو نا." بزووتنەوەی تفەنگ " هەتا دەریخەن گوایە ہانچەپو دوور لە خەباتی ڕاستەقینەی کرێکارانن. بەڵام (مار)و هاوڕێ چەپەکانی سەرلەنوێ لەشکریان پێکهێنایەوەو ڕێکیانخستەوە. دایانە شاخو کەوتنە ناو جووتیاران دژی دەرەبەگ وەستانو جوتیارانیان بە هەزاران لە حیزبو کۆمەڵە هەرەوەرزییەکانو لەشکری سووردا ڕێکخستو چەکدار کرد.

بەو شێوەیە شۆڕشی درێژخایەن، سەرەڕای بەرپەرچی توندی زۆرینەی ڕێبەرایەتی حیزبەکەو پێناخۆشی ستالینو لێخستنی (مار)یش هەر هەڵگیرسا. لادێکانو جووتیارانو شاخەکانیش بوونە بنکەو بۆتەی شۆڕش نەک کارگەو شارەکان، ئەگەرچی بزووتنەوەی کرێکارانو حیزبی کۆمۆنیست، پشتیوانی ئینتەرناسیۆنالیزمو چەندین هۆی یارمەتیدەری دیکەشی هەبوو... بۆ؟ چونکە:

- چین بارودۆخی تایبەتی خۆی هەبوو، نەدەبوو ببنە دیلی یاسا گشتییەکان.
- بزووتنەوەی جووتیاران دژی دەرەبەگەکان دەخرۆشا.
- شۆڕشی چەواشە توانای شکانی ڕاپەڕینی ناو شارەکانی هەبوو.
- شۆڕشی کشتوکاڵی پەکی خرابوو.
- حیزبی کۆمۆنیست دەیتوانی ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی خەڵک بکات.
- وڵاتەکە وڵاتێکی پانو بەرین، فروان، چونیەک گەشە نەکردوو بوو.
- ئیمپریالیزم، جگە لە تێکشکانی لە شەڕەوی دووچاری قەیرانی ئابووریو سیاسی قوڵیش هاتبوو.
- چین خاوەنی ئەزموونێکی مێژوویی زەبەندی خەباتی چەکدارانەی دەشتودەرەکانی بوو.
- دوژمنێکی بەهێزو دەرەبەگایەتییەکی قودرەتمەند، جوتیارانی کەم هێزو چەوسێنەریان هەبوو.

ئەوانە تێکڕا خەسڵەتەکانی شۆڕشی درێژخایەنی چین بوون کە وایانلێکرد بتوانێ لە مێژوودا، هەلومەرجێکی مێژوویی بقۆزێتەوەو حیزبی کۆمۆنیست سەرکردایەتی سەرکەوتووترین شۆڕشی درێژخایەن، وەکو خەباتی گەلانی لاوازی ژێردەستە دژی دوژمنانی بەهێزی چەوسێنەر بکات و سەر بخات. هەریەکە لەو خاڵانە چێوەیەکی گرنگی چوارچێوەی شۆڕشەکەیە، بەگشتیش کۆک و ناکۆکن، تەباو نا تەبان، باش و خراپن، نیوەیان لە قازانجی دوژمن و نیوەکەی دیکەیان لە قازانجی شۆڕشن. بە هەموشیان باروودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی و عەسکەری و تۆپۆگرافی چینیان پێکهێناوە. ڕێبەرایەتی ژیری شۆڕشەکەش چێوە چێوە ورد هەڵیپروانیوەتە بنچینەکانی چۆنیەتی بەرپاکردنی شۆڕشەکەو گۆشەگیرو خۆشباوەڕ نەبووە، لاسایی هیچ لایەکی نەکردووە، تەنیا لایەنی باش یان لایەنی خراپی نەبینیوە. داهاتووی دیاری کردووەو بەشێوەیەکی ئۆرگانیکی تەواوی ڕووە کۆمەڵایەتی و سیاسی و عەسکەرییەکانی پێواوە. دوای سەرجەمی ئەو ڕاستیانە ئینجا بڕیاری بەرپاکردنی شۆڕشی درێژخایەنی وەکو یەکەمین ئەزمونی شۆڕشگێڕی نوێ، داوە:

هەروا هەڕەمەکی، سەرپێیی، بە حەزو ئارەزوو، بۆ دەرکردنی ناوو ناوبانگ، یان بۆ داپۆشینی تاوانی کۆن و هەڵڕشتنی ڕقی کۆن یاخود بۆ قەرەبووکردنی لادان و بادانی ڕابردوو یان بە تەمای ڕێکەوتی سیاسی و کودەتای عەسکەری قیروسیای لە هەڵگیرساندنی شۆڕش نەکردووە. کە شۆڕشیشیان کردووە دژی دەرەبەگ و لایەنگری جووتیارانی هەژار بوون، زەویان داونەتێو یارمەتیان داوون، کۆمەڵەی هەرەوەرزیان بۆ پێکەوە ناوون و سەدان خەستەخانەو هەزاران کاری کۆمەڵایەتی، باش سەدان قوتابخانەو هەزاران پەناگاو سەدان تونێلی ژێرزەمینییان بۆ دروست کردوون.

تریاک کێشان و لێدان و زوڵم زۆریان قەدەغەکردووە، بێ ڕەوشتیان بە تاوان زانیوە. چەتەو چەتەگەریان تەفرو تونا کردووە. دەرەبەگ و تفەنگچی دەرەبەگەکانیان: چەک کردووە، کشتووە، پاک کردۆتەوە، جگەلە هەوڵدان بۆ گۆڕین و پەروەردەکردنەوەیان. دیلیان نەک نەکوشتووە بەڵکو پەروەردەشیان کردوون و جاری واش هەبووە هەزارانیان لێکردوون بە پێشمەرگە. دزییان بە تاوانێکی گەورە زانیوە. جگەلەوەی نەیاندەهێشت کادرە سیاسی و عەسکەرییەکانیان دزی بکەن و دزی ببێتە پیشەیان، بەڵکو سەدان جەردەی گەورەو بەناوبانگیشیان کە خاوەن سەدان و

هەزاران تفەنگچیش بوون، پاک‌کردۆتەوەو ناوچەی جوتیارانیان لێ رزگار کردوون. هەندێکیشیان پەروەردە کردووەو گۆڕیون. هی وایان هەبووە بۆتە سەرکردەی عەسکەری بەناوبانگی شۆڕشەکەو خۆشەویستی خەڵک‌و پێشمەرگەش.

## ٤/٢- دیل... بەرە!

هاوشانی ئەوانەش، ڕێبەرایەتیەکەیان چارەنووسی شۆڕشەکەو چینیان خستۆتە سەرووی هەموو بەرژەوەندییەک، بۆیە سەرەڕای زیاتر لە ١٠ ساڵ جەنگی ناوخۆ، سەرەڕای کوشتنی هەزاران کۆمۆنیست‌و ماڵوێرانییەکی بێ ئەندازە، هەرکە هەلی (بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی) دژی دوژمنی سەرەکی، ژاپۆن، هەڵکەوت، حیزبی کۆمۆنیست نەک بەو بیانووەی مادام ژاپۆن دژی کۆمینتانگە جەنگی ناوخۆی قوڵتر نەکردو نەک ئەو هەلەی بەهەل نەزانی بۆ تۆڵە لێسەندنەوەی کۆمینتانگ کە دوژمنی سەرسەختی کۆمۆنیزم‌و کۆمۆنیستەکان بوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە. کە ژاپۆن هاتە ناو سەرزەمینی چین، وێڕای بەهێزیو باڵادەستێتی حیزبی کۆمۆنیستی چین، قاڵ‌وقوڵی ئەزموونەکان بوو بوو هیچی ئەوانە لە شاڕێبازی نیشتمانی وێڵیان نەکردو دەستبەجێ دروشمی یەکگرتنی لەگەڵ کۆمینتانگ‌دا دژی داگیرکەرانی بێگانە بەرزکردەوە.

ئەوکاتەی ژاپۆن لەشکرکێشی کردە سەرچین لەناو سوپای دەوڵەتی چین‌دا ناکۆکی قوڵ لەسەر هەڵوێستی ڕاست بەرامبەر ژاپۆن تەقیبووەوەو هەرچی (شان کای شیک) بوو تێکشاندنی شۆڕشی ناوخۆی لە ڕووی عەسکەرییەوە لەلا گرنگتر بوو. لە ڕێگای دیبلۆماسیەتی (کۆمەڵەی گەلان)یشەوە دەیویست شکات لەدەستدرێژی ژاپۆن بکات. ئاکام ناکۆکیەکە تەقیەوەو لە شارێکدا تیپێکی نیشتمانپەروەر شان کای شیک/یان بەدیل گرت‌و تیپەکە پێوەندی نهێنی بە شۆڕشی چەکدارییەوە هەبوو. سەرسەختترین دوژمن گیراوە، هەلێکی گەورە بۆ تۆڵەسەندنەوە ڕەخساوەو سەرکردایەتی حیزبی کۆمۆنیست کەوتە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی مێژوویی: بەرگری لە نیشتمان، یان تۆڵەسەندنەوە لە کۆنەپەرستێکی کۆدەتاچی؟ ئەو دووڕیانە مێژووییانە، ژیری ڕێبەران لە داهێنکردنی چارەنووسی گەلان‌دا بڕیار دەدەن.

دەرکردنی ژاپۆن و رزگارکردنی نیشتمان و کوشتنی دوژمنێکی سەرسەخت، هەڵوێستی شۆڕشگێڕێتی و هەستی تۆڵەسەندنەوەو ڕق و قین لە مەحەک دەدات. هەڵبەتە خەڵکی قیناوی تۆڵسێنی قوڵ و قاڵ نەبوو لە ئەندێشەی شارستانی (کە هەر هەمووی ڕەوشتی چینەچەوسێنەرەکانن) قینی خۆیان دەخەنە بان بەرژەوەندی نیشتمانی و میللەت و بیروباوەڕەوە، بەپێچەوانەشەوە، ڕۆڵە شۆڕشگێڕەکان گۆشەنشینی تۆڵسەندن لەپێناوی سەرکەوتن، ناکەنە خەڵوەتی خۆپەرستی و قین هەڵڕشتن.

بۆیە: حیزبی کۆمۆنیستی چین گرتنی شان کای شیکی بەهەڵنەزانی بۆ تۆڵەسەندن لە بکوژی هەزاران کۆمۆنیست، بەڵکو بە هەڵکەوتی زانی بۆ ئاشتبوونەوەی گشتی هێزە شۆڕشگێڕو نیشتمانییەکان دژی ژاپۆن وەکو دوژمنی سەرەکی.

حیزبی کۆمۆنیست لەم هەلومەرجە چارەنووس‌سازەدا لەپێناوی نەهێشتنی شەڕی ناوخۆو یەکگرتنی ڕاستەقینە (شان کای شیک)یان نەگرت ئەشکەنجەی بدەن، نەیان شکاندو هەوڵی ناوزڕاندنیان نەدا، بەڵکو ڕێزیان گرت و بەهەڵمداوان کەوتنە کۆششی ڕێکەوتن لەگەڵیا. با سەرنج بدەین دووەمین ڕێبەری حیزبی کۆمۆنیست و شۆڕشەکە (شوئێن‌لای) چۆن چۆتەلای دوژمنە گیراوە سەرسەختەکەیان:

پاش کەمێ لە گەیشتنی وەفدیکۆمۆنیست، سەرۆکەکەی شوئێن‌لای بەرەو چاوپێکەوتنی شان کای شیک چوو کە بە تەواوەتی بەم چاوپێکەوتنە شڵەژا بە تایبەتی تەندروستی کەمێ تێکچووبوو نەفسیەتیشی تاکامی ڕووداوەکە لەقیبوو. دەم و چاوی لەترسا لەکاتی چاوپێکەوتنەکە زەرد هەڵگەڕا، چونکە شوئێن‌لای ڕاسپێردراوێکی سیاسی پێشووی لای ئەو بوو. ساڵی ١٩٢٧یش ٨٠ هەزار دۆلاری کردبووە خەڵاتی کوشتنی، بەڵام شوئێن‌لای چووە هۆدەکەوە سڵاوی برادەرانەی لێکرد ‹٦›.

نهێنی لەم ڕەفتارو لەم جۆرە هەڵوێستە چییە؟ ئایا ڕووداوی مێژوویی وا لەخۆڕا بێ بنچینەی چینایەتی و بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە ڕوو دەدەن یان نەخێر؟

---

‹٦› ادغار سنو. النجمة الاحمر فوق الصين، الراحل الاول من تأريخ الثورة الصينية. ترجمة كمال ابوالحسن و كمال ابوالعزة، ص: ٤٦٧

وەلامیش ئەوەیە لەم سەردەمەدا چونکە شۆڕشگێڕەکان لە پاشەڕۆژی سیاسەتەکانیان دڵنیاو بابەتیانە ڕووداوەکان هەڵدەسەنگێنن بۆیە: کە بۆرژوازیەکی دوژمنی سەرسەختیشیان دەگرن، لەپێناوی بەرژەوەندی بەرزی نیشتماندا بەو شێوەیە لە تەکیا دەجوڵێنەوە. کوتو مت پێچەوانەی ئەمەش بۆرژواکان لەبەر ئەوەی بێ ئایندەی چینایەتین، بۆیە کە شۆڕشگێڕێک دەگرن، ئەگەر کەسێشی لێ نەکوشتبێ و هەوڵی دۆستایەتیشی دابێ ئەشکەنجەی دەدەن و ڕەفتاری ناجوامێرانەی لەگەڵا دەکەن و هەوڵ دەدەن بە تەواوەتی لە مەترسییەکەی ڕزگاریان بێ. لەبەر ئەو ڕاستییە سیاسی و ئایدیۆلۆژیانە:

ـ ئەگەر شۆڕشی درێژخایەنی چین ئەو حیزبە ڕێبەرایەتی نەکردباو ڕێبەرو ڕێبەرایەتییەکەی بەو چەشنە هەڵنەسوڕابان، هەرگیز نەدەکرا یەکەمین ئەزموونی شۆڕشی درێژخایەن سەربخرێ.

ـ بەڕاستی ڕێبەرایەتی شۆڕشەکە دژی دەرەبەگ و لایەنگری جووتیاران نەبایە، زەویان پێ نەدابان و خزمەتیان نەکردبانایە. (١٤٣٣) کۆمەڵەی هەرەوەرزیان بۆ دانەنزرراندبان، ئەو شۆڕشە لە سەدان پێشمەرگەوە، نەدەگەیەندرایە چەندین ملیۆن.

ـ ولاتەکە پان و پۆڕ، فراوان و فرەجۆر نەبایە، تۆپۆگرافییەکەی بۆ شۆڕشی درێژخایەن نەگونجابایە، قەت شۆڕشەکە بەرامبەر بەو شالاوانەی بە گەورەترین هێز دەکرانە سەری، بەرگەی نەدەگرت و سەریش نەدەکەوت. بۆ نموونە: پاش چوار هەڵمەتی چەندین ملیۆنی دەوڵەت، شۆڕشەکە بەرگەی پێنجەمین هەڵمەتی نەگرت، بڕیاری ڕێپێوانی گەورەی‌دا (المسیرە الکبری). لەم ڕێپێوانەدا توانی سەرکەوتوانە (... ٦) میل لە دژوارترین پاشەکشەدا ببڕێ. پاشەکشەش (٢٣٨) ڕۆژی خایاندووە. هەموو ڕۆژێکیش تووشی شەڕ بوون، (١٥) ڕۆژی شەڕی ئێجگار سەختیان تێدا کراوە. حەوانەوەی زۆر کەم بووە. بە (٢٨) زنجیرە شاخی سەختدا هەڵشاخاون کە پێنجیان، چوار وەرزە بەفریان لێ‌نەبڕاوە، ڕووباریان هاتۆتە ڕێ. سنووری (١٣) ولایەتیان پێواوە. سەرەڕاش (٦٢) شاریان ڕزگار کردووەو بەناو لەشکری (١٠) ڕەوە جاشی گەورەشدا تێبەڕیون. کاری مێژوویی وا بۆ شۆڕشێ کە لەسەرەتای پاشەکشەکەدا سەدان هەزار پێشمەرگە بوویێ، باری سەنگین و چەک و جبەخانەیشی گواستبێتەوە، ئەگەر لە فیلمدا ببیندرێ ڕەنگە هەر بە فیلم بزاندرێ. بەلام لە بوونی سەرکردایەتییەکی شۆڕشگێڕو لەناو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی فراوانی چینە شۆڕشگێڕەکانداو لەسەر زەمینێکی پان و پۆڕی وەکو چین‌دا،

سەرکەوتن دێنێتەدی. بۆ نموونە:

ئەگەر چین ڕووپێوەکەی (... ٩٧٨.) کیلۆمەتەر دووجا نەبایە، بەڵکو نیوەی ئەو ڕووپێوەش بایە، مەگەر لەخەوا پاشەکشەکە سەرکەوتبایە، عەلبەتە پاشەکشەکەش نەگەیەندرابایەتە ئاکام، شۆڕشەکە دەبەزی.

تێکڕای ئەو ڕاستییانە بنچینەییەکانی شۆڕشی درێژخایەنی سەرکەوتووی چینن کە بوو بە ئاقارێکی سەربەخۆی ئاقارەکانی ڕزگاری گەلان. دیارە وێڕای ئەم بنچینانە کە ڕێبەرایەتییەکەیان زانستییانە دەستنیشانیان کردبوون و تیۆری شۆڕشی درێژخایەنیان لەسەر داڕشت، نابێ فاکتەری دەرەکیش کە ڕۆڵێکی یارمەتیدەری کاریگەریان لەسەرکەوتنەکەدا هەبووە، لەبیربەرین. لەپێشدا یارمەتی شوڕەوی کە بەدرێژایی شۆڕشەکە سەرەڕای جیاوازی هەڵوێستی ستالین لەسەر شۆڕشەکەو ستالینییەتی پێڕەو لێکراوی کوێرانەی ئەوکاتە. بە حوکمی سەرکەوتن و پێشکەوتنی بابەتییانەی شۆڕشەکە کە خۆی بەسەر ڕای گشتی جیهاندا سەپاندبوو، یارمەتییەکە نەدەبڕایەوە ئەمە جگەلەو پشتیوانییەی ئینتەرناسیونالیزمیش.

هەلومەرجی جیهانیش لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهاندا بەتایبەتی ئەودەمە ژاپۆن هاوپەیمانی نازیو فاشییەکان بوو یارمەتیدەرێکی سیاسی و عەسکەری ئاوالای شۆڕشی چیندا کە بتوانێ بێ ترس و مەترسی یارمەتی لە هەموو لایەک وەربگرێ، بە دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکانیشەوە، بەبێ ئەوەی لە تۆمەتی وابەستەیی ئیمپریالیزم بسڵەمێتەوە.

## ٢/٥- گەڕانەوە بۆ ڕابردوو

لە داڕشتنی تیۆری شۆڕشی درێژخایەن و جەنگی پارتیزانیدا، ماوتسی تۆنگ سودێکی زۆری لە سەرچاوە کلاسیکییەکانی جەنگ وەرگرتبوو بەتایبەتی خودی چین کە وڵاتێکی پڕ لە ئەزموونی دێرینەی عەسکەری بوو بۆ یەکەمین جاریش لە مێژوودا لەو وڵاتەدا، کۆنترین سەرچاوەی جەنگ و جەنگین لەلایەن ئەندێشمەندی عەسکەری بەناوبانگی چین (سن تزو)وە بەناوی (هونەری جەنگەوە) نووسراوە. گرنگی ئەم کتێبەش جگەلەوەی یەکەمین کتێبی جەنگە، لە زانستی جەنگی کۆڵیوەتەوەو بەرنامەی عەسکەری بۆ جەنگ داڕشتووە. کتێبەکە لە ڕووی ڕەوتی مرۆڤایەتیشەوە بۆ زەمانی خۆی بەرزو پیرۆزە. (سن تزو) لەو سەردەمە کۆنەوەریەدا، سەردەمی خوێنمژینی کۆیلەو جووتیاراندا، سەردەمی کوشتن و

گوێرەی بەرژەوەندی ئەوان ڕێبازی عەسکەری دانەرشتووە ڕەفتاری ئەوانی نەکردۆتە بنەمای تیۆرییەکەی. بەڵکو:

ڕێنوێنی جەنگاوەرو فەرماندەی چەکداری کردووە کە جەنگ و جەنگین، هەڵمەت و سەرکوت، لە مرۆڤ دۆستی و مرۆڤایەتی، دادپەروەری و ڕەواخوازی جیانەکەنەوە. هانیداوون: درندە نەبن، بێگوناە نەکوژن و لەگەڵ دیل‌دا ڕەفتاری جوامێرانە بکەن. بیست و چوارسەدە واتە دوو هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر ئەندێشەمەندی ئەوانەی گوتبێت هەتا هەنوکەین گرنگە.

ماو: جگەلەوانە کەڵکی لە هەزاران ڕووداو، سەرگوزشتەی کۆن و پێشینان وەرگرتووەو ئاوێتەی گوتارو گوتەکانی کردوون. پێکەوەی بەستوون و لە بۆتەی پێویستییەکانی سەردەم‌دا زاخاوی داوون. سەرەنجامی سەرجەمی ئەو ڕاستییە مێژوویی و پەندو سەرگوزەشتە بە نرخانەش بلیمەتانە (ماو) پەرەی بە جەنگی پارتیزانی‌داو کردیە تیۆری سەربەخۆی شۆڕشی درێژخایەن وەکو ئامرازێکی کاریگەری دەستی گەلانی ژێردەستەی بێ‌هێزو لاواز دژی دوژمنانی سەردەستەی بەهێزتر بە مەرجێک تیۆرییەکە لەگەڵ هەلومەرجی گشتی و تایبەتییاندا بگونجێ.

بۆماوەیەکی زۆر ئەم ڕێبازەی شۆڕشی درێژخایەن گەر نەشبووبێتە یاسای گشتی خەباتی گەلان ئەوا هاوشانی پارتی پێشڕەوو بەرەی نیشتمانیی وەکو یاسا پیڕەوییان لێدەکراو چەندین میللەتی‌دیکەی ژێردەستەی جیهان پابەندی بوون، هەندێکیان سەرکەوتن و زۆریەش چەواشە بوون!*

ئەو گەلانەی توانیان یاسا گشتی و تایبەتییەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ڕزگاری بدۆزنەوە، هەلی باری بابەتییان تێکەڵاوی باری خۆیی و تایبەتی کردبێ، سەرکەوتوون، لەوانە: گەلی ڤێتنام، جەزائیر، کوبا، لاوس و کامبۆدیا، ئۆگاندا، هەروەها چەندین میللەتی دیکەیش شۆڕشی درێژخایەنیشیان گرتەبەر، قوربانییەکی زۆریشیان‌داو ئازایەتییەکی باشیشیان نواند، بەڵام ژێرکەوتن، وەکو: یۆنان، ئیسپانیا، مالیزیا،بۆلیڤیا، ئەرجەنتین، کۆلۆمبیا، پیرۆ، بەرازیل...تاد.

ئێستاش چەندین میللەتی دیکە پیڕەوی لە شۆڕشی درێژخایەن دەکەن و

---

* هەتا ئێستاش وا باوە گوایە زۆربەی شۆڕشە چەکدارییەکان سەرکەوتوون. بەڵام بە پێچەوانەوە زۆربەیان بەزیون. (لە کۆتایی کتێبەکەدا لە حەوت پاشکۆدا ئەم ڕاستیە دەسەلمێنین)

بەردەوامن لەسەر ڕۆیشتنی وەکو:
کوردستان، فەلستین، تامیل، فلیپین، بۆرما، پیرۆ، سلڤادۆر. هەر لەم ساڵەدا جەنگی ناوخۆی ئۆگاندا بەلاداکەوت و دوژمنیان شکاند. بەرەی ساندینیستا و سەرکەوتنەکەی بەناوبانگە.
بێگومان ڕێبازی شۆڕشگێڕانەی شۆڕشی درێژخایەن کە لەیەکەم هەڵمەتیدا سەرکەوتبێ و دوای ئەوەش لە چەندین وڵاتی دیکەدا بە ئامانج گەیشتبێ، هەر ئەوەی لێچاوەڕوان دەکرێ هەتا ئێستاش، کەم و زۆر کارایییەکەی مابێ و پێڕەوو پێناوی هەبن. مشتومڕی لەسەر بکرێ و بخرێتە ناو باس و خواستێکی گەورەوە. ئەمەش دیاردەیەکی نامۆنییە. چونکە ئێستاش دیاردە لاوەکی و فەلسەفە دژنوەکان بە گەرمی لێیان دەکۆڵرێتەوە کە هەندێکیان زیانیان لە قازانجیان زیاترە، ئیدی چۆن ئەم تیۆرە عەسکەرییە شۆڕشگێڕییە لەکاتێکدا هێشتا دەیان میللەت ژێردەستەن و ناچاری ئەم تیۆرەیان دەکەن لێی نەکۆڵرێتەوەو پێڕەونەکرێ؟ بەڵام داخۆ ئەنجامەکەی گەیشتۆتە کوێ؟ زانینی ئەمەیان گەلێ گرنگە هیواداریین لەناو باسەکەدا، وەڵامی ئەم پرسیارە ڕووناکی خرابێتەسەر.

## ٣- ڕێبازی جیاوازی پارتیزانی

ئەوەی ڕوونمان کردەوە کورتەیەکی چەمکی جەنگی پارتیزانیو شۆڕشی درێژخایەنی وڵاتی چین بوو، کە لە چەندین وڵاتی دیکەشدا بەشێوەیەکی گشتی چاوی لێکراو ڕێبازە عەسکەرییەکەی سەرپشخرا، بگرە پەرەیشی پێدرا بەتایبەتی لە کۆریاو ڤێتنامدا کە سەرکەوتنی گەلیڤێتنام زیاتر لە ٣٠ ساڵو هی کۆریاش ٢٠ ساڵ زیاتری خایاند.

ئەم وڵاتانە لە جەنگی پارتیزانی بچووکەوە دەستیان پێکردو بەرە بەرە بەرەو جەنگی پارتیزانی گەورەتر، هەروەها بۆ جەنگی بزووتەو جەنگی بەرگری ستراتیژیو جەنگی هاوتایی ستراتیژیو دوا قۆناغیش، جەنگی هێرشی ستراتیژی کە ئیدی شارەکانو پایتەختیان گەمارۆ دەداو دوا بەرهەڵستی دوژمنیان تێکوپێک دەشکاندو ئاڵای سەرکەوتنیان هەڵدەکرد.

وەکو پێشینیش کرابەوە لەم وڵاتانەدا باری بابەتیو باری خۆیی بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش هەبوو کە پێویستیشی کردبێ بەرەی نیشتمانیو شێوەی خەباتی جۆراوجۆری دیشیان داهێناوە. ئەوانە تێکڕا لەناو بزووتنەوەی بەرینی چەکداریی جووتیارانو هەر خەڵک دژی ستەمکاران کاریان بۆ کراوەو سەرخراوەن. سەرکەوتنەکیش بەبێ پشتیوانی بێ درێغی ستراتیژیو هەلومەرجی هەڵکەوتووی جیهانیی نەهاتۆتەدی. سەرەڕای سەرجەمی ئەو ڕاستییە چارەنووسسازانە شۆڕشی هاچکام لە وڵاتانی خاوەن ئەزموونی شۆڕشی درێژخایەن، (٢٠) ساڵ کەمتریان پاش قوربانیدانی سەدان هەزار شەهیدو ئەنگیوراو، خاپوور بوونی هەزاران شارو

شارۆچکە، گوندو دامەزراوی ئابوری بۆ سەرکەوتن نەویستووە. (پاشان دێینە سەر پشتیوانیو توانای دوژمنان) ئەمانە وا، جگە لەم ئەزموونانە لە ولاتانی دیکەدا شۆڕش بە ڕێبازی جیاوازیدیکەیشەوە هەڵگیرساوەو سەریشخراوە. ئەمانەش بۆخۆیان مایەی باسێکی گەرمن بگرە ڕای واش هەیە ئەم شۆڕشانە بەوەدەزانن لە یاسای شۆڕشەکانی چینو ڤێتنامو ماننەدەکانیان ترازاونو بە ڕێبازی سەربەخۆیان لە جیهاندا دەزانن. ئەمەیان چۆنەو چۆن نییە؟ دەبێ ڕوانگەیەکیان لەسەر بکەینەوە.

## ١/٣- یەکەمیان، کوبا

(٥.٧) ساڵ لەمەوبەر(٢٨/ی ئوکتۆبەری ١٤٩٢) سەوڵی کەشتییەکەی (کریستین کۆلۆمبس) بەربەستێنی دورگەی کوبا کەوتو ناوی ولاتی (کوبا) وەکو ولاتێکی ئەمریکای ناوەند کەوتە ناوانەوە.

لە دۆزرانییەوە هەتا ساڵی (١٨٩٩) تاقە ساڵی ١٧٦٢-١٧٦٣ لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیزدا بووە. ئەگینا باقییەکەی (٤.٧) ساڵی ڕەبەق ئیسپانیەکان داگیریان کردووە. پاش ئەوە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هێزی تێدا پیادە کردووەو هەتا سەرکەوتنی شۆڕشی ڕزگاری، لەژێر دەستی خۆیو بەکرێگیراوانیان بووە.

داگیرکردنو چەوساندنەوەی نەتەوایەتی لەمێژوو کۆباییەکانی هانی خەبات لە ساڵی ١٨٦٨ بۆ ماوەی (١.) ساڵ دابوو. لەم (١.) ساڵەدا ڕاپەڕینێکی چەکدارانەی خوێناوی بەرپاکراوەو (٨.) هەزار ئیسپانیو (٤..) هەزار کوبایی کوژراون. ساڵی ١٨٩٥ دیسان ڕاپەڕینو شکاونەتەوە. سێ ساڵ پاش ئەم ڕاپەڕینە شکستخواردووە بە پشتیوانی گەرمی ئەمریکا، ئیسپانیاییەکانیان دەرپەڕاندووە. لەگەڵ ئەمریکاییش هەمیشە لە کێشەو شەڕوشۆڕدا بوون. چونکە ئەمریکا لە ئیسپانیا داگیرکەرتر بووە. سەرەنجام کوبا لە ساڵی ١٩٣٣وە کەوتە دەست (باتیستا)ی دیکتاتۆرو هەمیشەش لەو ساڵانەدا مانگرتنو ڕاپەڕین بەردەوام بووە، گرنگترین ڕووداوی سیاسی کە دیکتاتۆرییەتی باتیستای لە مەحەکدا، هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٢ کە سێ کەس کاندیدی سەرەک کۆماری باتیستا سێیەمین دەنگی هێنا. وەکو خووی دیکتاتۆرەکان، دەدانی بە دۆڕانی خۆیدا نەناو دەستی بەسەر گەورەترین پادگانی (هاڤانا)ی پایتەختی ولاتەکەدا گرتو بە کودەتا ئاکامی هەڵبژاردنەکەی بەتاڵ کردەوەو خۆی داسەپاند. ئەوکاتە: کاسترۆ... پارێزەرێکی ٢٥

ساڵە دەبێ لە میتینگێکی ئاسایی هاڤانادا داوای سزادانی باتیستای کردووە، چونکە: برگەی شەشەمی بەرگری کۆمەڵایەتی وڵاتەکەی بەو کودەتایە پێشێل کردووە، لەبەشێکی ئاخاوتنەکەیدا دەڵێ: لۆژیک دەڵێ ئەگەر لە کوبادا دادگاو دادیاری هەیە دەبێ باتیستا سزا بدریٚو ئەگەر باتیستا سزا نەدریٚو هەروەها درێژە بەکاری خۆی بە ناونیشانی سەرپشکی وڵاتو سەرۆکی کۆمارو سەرەک وەزیرانو سیناتۆر جەنەراڵو سەرۆکی کاروباری سەربازیو داودەزگاکانی دیکەی وڵاتو دەسەڵاتی تەنفیزیو دەسەڵاتی یاساپێۆیو خاوەنو خاوەنداریتی گیانو ماڵی تەواوی خەڵکی کوباو خاوەنی تەواوی مەزرای ئەوان بدات لە حاڵەتی وادا دادگا نامێنێ. بەڵکو ئەم دادگایە سەرکوتو خاش دەبێ. ئا ئەمە ڕاستییەکی هەراسانکەر نییە ‹٧›.

بێگومان گوتەی ئاگراویوا لە ئاڵۆزترین دۆخی کوبادا، خاوەنەکەی لەپاشەڕۆژدا دەکاتە خاوەنی شۆڕش، هەروەهایش بوو. پاش ئەو میتینگە ناوبانگی کاسترۆ فڕی، کوبا هەتا دەهات دووچاری قەیرانی ئابووریو کۆمەڵایەتی، سیاسیو عەسکەری پتر دەبوو. حیزبە سیاسیەکانیش تێکرا هەر لایەک لە ڕوانگەی چینایەتی خۆیەوە کەوتبوونە تێکۆشان، لەناو ئەو حیزبانەدا (حیزبی کۆمۆنیست) بەهێزترینو کاریگەرترین حیزبی کۆمۆنیستی ئەمریکای لاتین بوو. یەکەمین حیزب بووە توانیویتی لە کابینەیەکی نیشتمانیدا هاوبەشی بکات. لەساڵی ١٩٢٥بەشەوە دامەزراوە. بەڵام ئەم حیزبەش هەروەکو حیزبە ریڤیژیونیستەکانی دیکەی جیهان، پەتای لە شۆڕش ترسان گرتبووی.

ساڵی ١٩٣٤ لە ڕاپەڕینێکی گشتی چەکدارانەدا ڕژێمی دیکتاتۆری (ماکادۆ) ڕوخێندراوە. کەچی حیزبی کۆمۆنیست لە ترسی ئەوەی گوایا نەوەکا ئیمپریالیزم دەست تێوەرداتە ناو کوباوە خۆی لە ڕاپەڕینەکە دزیوەتەوەو داواشی لە کرێکاران کردووە واز لە ڕاپەڕینەکەیان بهێنن ئەم سیاسەتە ڕاستئاژۆیەی حیزبی ناوبراو درێژەی درایەو هەوڵیان دەدا لە ڕێی ڕیفۆرمو پەرلەمانەوە، گەشە بە وڵات بدەنو ژانی سیاسی خەڵک کەم بکەنەوە. ئەوەی بیریان لێنەکردەوە ئەرکە بنەڕەتییەکەی سەرشانیان بوو ئەویش: ڕوخاندنی بۆرژوازیەتە لەڕێی شۆڕشەوە. لەم وڵاتەشدا،

---

‹٧› منوچهر کمالی طه. مسائل نیمکره غربی. کوبا. کاسترو انقلاب. موسسه انتشارات امیر کبیر، تهران ١٣٦٦ص: ٣٢٨و٣٢٩.

چارەنووسی خەڵک ڕێگای شۆڕشگێرانەی خۆی پێچەوانەی ڕاستئاژۆیی ریڤیژینیستەکان دۆزیەوەو نەدەکرا میللەتێک داهاتی تێکڕایی ساڵانەی هەرکەسێکی (۳۱۲) دۆلار بێ، لەکاتێکدا هی داگیرکەرەکەی کە (۱۱۲) میلیش لێی دوور بێ داهاتی ساڵانەی هاوولاتییەکانی (۲۲۲۹) دۆلار بێ واتە دەورووبەری حەوت بەرامبەر. نەدەکرا میللەتی برسی‌وا لەبەرامبەر داگیرکەری خوێنمژی وادا بیر لە شۆڕش نەکاتەوەو بە ئومێدی پەرلەمان‌و تەفرەخواردووی دروشمی ڕیڤیژینستەکان مان نەگرێ، ڕانەبەری‌و شۆڕش هەڵنەگیرسێنی، نەکا ئەمریکا دەست‌وەرداتە نیشتمانەکەیان.

## ۲/۳- شۆڕشی بێ پێشڕەو

گوترا بەهێزترین حیزب، حیزبی (کۆمۆنیست) بووە. ئەمیش لە شۆڕش ترساوە! لەبری هاندانی جەماوەرو ڕەخساندنی زەمینەی شۆڕش بە پێچەوانەوە کە جەماوەر کەوتۆتەسەر هەڵوێستی شۆڕشگێرانە ئەم حیزبە ساردی کردوونەتەوە، واتە: باری بابەتی لە کوبادا هەڵکەوتووە، بەلاّم بارە خۆییەکە لەباری بردووە. هەر بۆیە ئەگەر بە یاسای گشتی‌و بابەتی‌بایە، دەبوو شۆڕش لەکوبادا هەرگیز بەرپا نەکرابا، کەچی واش‌دەرنەچوو!

ڕاستە لەکوبادا حیزبی پێشڕەو نەبووە جڵەوی خەباتیش بەدەست حیزبەوە نەبوو. هەروەها کوبا وڵاتێکی پان‌وبەرین‌و خاوەن گەلێکی زۆریش وەکو چین نەبووە. هاوسنوورە دەریای ئەمریکاش بووە کە سەرکردەی ئیمپریالیزمە. تەواوی ئەوانە ڕاست‌و دروستن. بەلاّم لە بەرامبەر ئەو ڕاسییانەدا کوبا بارودۆخێکی تایبەتی جیا لە بارودۆخی چین‌و ڤیێتنام‌و کۆریا شۆڕش بزوێنی بووە.، ئەویش:

- جۆشخواردنی خەڵکی شارەکان بووە دژی رژێمی نەفرەت لێکراوی باتیستا.
- جووتیارانی لە کێڵگەی گەورەی رژێمدا لەژێر باری خراپترین چەوسانەوەدا ناڵاندوویانەو کێڵگەی شەکریش بەشێکی هەرە گرنگی ئابوری کوبا بووە.
- سەرجەم حیزب‌و لایەنە سیاسی‌و پیشەییەکان، سندیکاو کۆمەڵە ڕۆشنبیرییەکان، ئۆپۆزیسیۆن بوون.
- هەرچەندە رژێمەکە دیکتاتۆری بووە، بەلاّم لە ڕووی چەکەوە بەهێز نەبووە.
- جەماوەری وڵاتەکە خاوەن ئەزموونێکی خەباتی مێژوویی بوون‌و گیانی شۆڕشگێریەتییان پتەو بووە.

تەواوی ئەو پرینسیپانەو هی دیکەیش، بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی خستبووەگەڕو کوبایان کردبووە بنکەیەکی شۆڕشگێڕانەی ئەمریکای ناوەندی بۆیە: هەڵەیەکی کوشندەیە وا بزاندرێ لە کوبادا لە خۆڕا یان تەنیا بە پێکەوەنانی هێزی پارتیزانی توانراوە ڕژێمی باتیستا لە پەنای ئەمریکادا بڕوخێندرێ. لێکدانەوەیوا بەهەڵچوون‌و بەهەڵبردنێکی گەورەی تیۆری خەڵکە. چونکە بۆچوونی وا بناغەی زانستی نیەو زۆر جار بووشەتە مایەی تێکشکانی گەلێ لایەنی چەپو بزووتنەوەی چەکداری لە چەندین ناوچەدا. شۆڕشی چەکدارانە، پرۆسەیەکی عسکەری دابڕاو لە باقی دیاردەو دەرکەوتەکان نییە، گرێدراوی پێوەندییە ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و سیاسییەکانە. بەڵکو لەوانیشەوە هەڵدەقوڵێ‌و بە هۆی ئەوانیشەوە سەر یان ژێر دەکەوێ.

هەن، پارتیزان‌و پارتیزانی بە سوپەرمان‌و سوپەرمانێتییەتی تێدەگەن پێیان وایە: تفەنگ‌و ئالای سوورو ئستێرە سەرکەوتن بەدەست دێنن بۆچوونی واش لە لایەن تیۆریسیەن‌و نووسەرە بانچەپەکانەوە لەناو لاوانی چەپو چەپاویدا بلاودەکەنەوە. بە تایبەتی تیزە نەزۆکەکانی (رۆژێ دوبریە)و ئارادەیەک هی گیڤاراش کە لە جیهاندا بەناوی (البۆرە الثوریە) ناوبانگیان دەرچووە.

نووسەری بەناوبانگی فەلەستینیش (منیر شفیق) لەناو دەولەتە عەرەبییەکان‌و شۆڕشی فەلەستین‌دا گەلێ جار لێکۆڵینەوەی لەسەر جەنگی پارتیزانی وەکو یاسای نەگۆڕی ڕێبازی ڕزگاری گەلانی ژێردەستە دەنووسی‌و چەندین کتێبو نامیلکەی لەم بارەوە لە ئەندێشەی ڕێبەرانی پارتیزانی جیهانییەوە گوڵبژێر کردو لە کوردستانی بەشی عێراقیشدا ڕەواجیان دەدرایە، کەچی... ڕۆژێ دوبریە دەمێکە لەسەر پلەیەکی حیزبی سۆسیال دیموکراتی فەرەنسا بەسەرکردایەتی (فرانسوا میتران) خەریکی (بونرە)ی بازاری هاوبەشە! (منیر شفیف) ناوی جارانی گومەو لەژێریشەوە خەریکی (مارکسی-اسلامی)یە.

لە کوبادا پاش ئەوەی کاسترۆ بوو بە سیمایەکی ناسراوی ئۆپۆزیسیۆنی چەپ، مارکسی نەبوو. لە حیزبی کۆمۆنیست یان هیچ حیزبێکی دیکەدا نەبوو. خۆی پاش ئەوەی لەرێگەی دادگاو پەرلەمان‌و خۆپیشاندان‌و مانگرتن، بێ تاقەت بوو بوو، کەوتبووە ڕێکخستنی بزووتنەوەیەکی چەکدار لە ١٩٥٣دا وەکو شێوەیەکی دیکەی خەبات ڕێبازی چەکداری گرتەبەرو بە (١٧٠) جەنگاوەر هەڵمەتیان بردە سەر ئۆردووی هەزار کەسی (مۆنکا)دا. شکان‌و پاش شکستەکەش کشانەوە بۆ شاخی

(سیراماسترا-١٣٩٦ پێ بەرزە) دوای چەند ڕۆژێک لە دامێنی شاخەکەدا لەپرخەی خەونێکی پاش شەکەتیدا، کاسترۆو دوو هاوڕێی دەگیرێن (رائول کاسترۆ)ی برای و چەند جەنگاوەری دیکە کە لە هەمان شاخدا خۆیان شاردبۆوە دوای گرتنی کاسترۆ تەسلیم دەبنەوە.

بەرێکەوت کۆنە دۆستێکی کاسترۆ بەناوی (پدروساریا) فەرماندەی ئەو سەربازانەی کردووە کە ڕێکچوونەتە سەر کاسترۆ. بڕیاریش بووە کە لەهەر کوێیەک دەبیندرێ دەست بەجێ بکوژرێ. کۆنە دۆستەکەیشی سەرەڕای ئەوەی عەسکەریش بووە بڕیاری کوشتنی پێ بووە، بشی کوشتایە خەڵاتیش دەکرا بەڵام ویژدانی هاوڕێیەتی و مرۆڤایەتی بەبێ هیچ مەبەستێکی تایبەتی، ڕێگەی نەداوە تاوانی وا بەرامبەر کۆنە هاوڕێیەکی خۆی بکات. بە بیانوی پشکنینی گیرفانی کاسترۆ لێی نزیک دەکەوێتەوەو دەچپێنێتە گوێی کە: جارێ ناوی ئاشکرای خۆی نەڵێ. ئیدی کاسترۆش تێدەگاو کە دەشیگەیەننە هاڤانا ئاژانس و ڕۆژنامەو حیزبەکان ئاگادار دەبن، بەمەش گیانی رزگار دەبێ. لێرەدا جێی خۆیەتی دوو ڕاستی بخەینە ڕوو:

- دۆخی کوبا بە چەشنێ جۆشی شۆڕشگێرانەی خواردووە، تەنانەت ڕێبەری بزووتنەوەی چەکداریش گیراوە، بە ئاشکرا نەیانتوانیوە بیکوژن. ئەمەش بۆ ڕێبەرێکی وەکو کاسترۆ کەم نییە هەتا نەزانێ چیدەکاو گەلەکەی چۆن رزگار دەکات.

- پدروساریا بەوکارەی بەرامبەر کاسترۆ کردی ناوی خۆی بە زێڕ لە مێژووی کوبادا نەخشاند، پارەو پاداشت، پلەو پایە، کاریان نەکردبووە سەر ویژدانی نیشتمانی و مرۆڤانەی. جوامێری وا نەک پێچەوانەکەی هەمیشە دەدرەوشێتەوە.

پاش شکستی ئەم هەڵمەتە، کاسترۆ لە زیندان دەرباز دەبێ و لە پێشوو پتر دەبێتە شۆڕشگێری ناسراوی کوبا. دەچێتە دەرەوەو بەناوی ڕۆژی هەڵمەتەکەوە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێرانە پێکەوە دەنێ. پاش خۆسازدانێکی گەرم، ساڵی ١٩٥٨ دیسان بزووتنەوەی چەکدار بەرپا کردەوە. بەرنامەی سیاسیشیان ڕێکخستنی تەواوی ئۆپۆزیسیۆنەکانی کوبا بوو کە لایەنگری خەباتی شۆڕشگێرانەو کۆماری دیموکراسی بوون. توانیشیان ئەم لایەنانە ڕێک بخەن:

١- بزووتنەوەی ٢٦ی حوزەیران ٢- حیزبی (ئەتن-تبکۆس) ٣- کۆمیتەی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ ٤- حیزبی کارگەران ٥- حیزبی شۆڕشی کوبا ٦- حیزبی دیموکرات ٧- فیدراسیۆنی خوێندکاران ٨- ڕێکخراوی ئەفسەران ٩- ڕاپەڕینی بەرگری.

ئەوانە، لەنێو خۆیاندا یەکێتییەکی تۆکمەیان دروست کرد. بەڵام حیزبی کۆمۆنیستیان پشت گوێ خست. لەبەر ئەوەی دژی بزووتنەوەی چەکداری بوون و دەیانگوت: کاسترۆ کارەسات دەخوڵقێنێ و خەباتی کرێکاران لەبار دەبات پاشان حیزبی کۆمۆنیست بەرە بەرە هەڵوێستی خۆی گۆڕی و چەشنی لایەکی لاوەکی لەکاتی سەرکەوتندا حیسابیان بۆ کرا. ئەگەرچی سەرەڕای ئەو هەڵوێستەشیان بۆ ئەوەی بەرەی گەل کێشەی قوڵی تێنەکەوێ کاسترۆ نەیدەهێشت بە توندی دژایەتی بکرێن.

ئەو ڕاستیانە، کەوا بە کورتی خرانە ڕوو، دەریدەخەن کە شۆڕشی کوبا سەرچلانە دەستی پێنەکردووەو تەنیا بە (بۆئرە)بیریان لە سەرکەوتن نەکردۆتەوە (وەکو پاشان دەویسترا وا پیشان بدرێ) بەڵکو هێڵی سیاسی و یەکێتی سیاسی و ڕاپەڕینی خەڵکیشیان لەبەرچاو گرتووە ئینجا خەباتی چەکداریان بەرپا کردووە. ڕاستە شۆڕشە چەکدارییەکە پاڵەپەستۆیەکی کاریگەر بووە بۆ سەر ڕژێم، بەڵام تاج لەسەر دانانی سەرکەوتن، لە شارەوە، لە ڕێگەی ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵکەوە گەیشتە ئاکام، نەک تەنها بە لولەی تفەنگ. تەنانەت کە باتیستا سەرئەنجامی ڕاپەڕینێ جەماوەر، هەڵهاتبوو، سەرەتا کاسترۆ بە گاڵتەو پروپاگاندەی زانیبووە، گوتبووی: هێشتا ئێمە لەسەرەتاداین. ڕاستیش نەبووە ئەو کاتەی ڕژێم ڕووخاوە شۆڕشەکە تەنیا دوو هەزار پێشمەرگەی ڕێکخستووە. کەواتە: ئەگەر کاسترۆو شۆڕشگێڕانی کوبا بە ڕواڵەتی دیکتاتۆریەتی باتیستا هەڵخەڵەتابان، هەرگیز بەو زووییە شۆڕشیان بەرپا نەدەکردو ئەو هەڵە هەڵکەوتوویەیان پێ نەدەقۆزرایەوە. ئیدی لەو وڵاتەدا وێڕای نەبوونی حیزبی پێشڕەو باری بابەتی شۆڕش بەتەواوەتی لەبار بووە، ڕێبەرانی شۆڕشەکە لەناو ئۆپۆزیسیۆندا ئەوپەڕی زیرەکانە هەڵسوڕاوون بۆیە سەرکەوتوون.

## ٣/٣- ئەمریکای لاتین

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی چەکدارانەی شاخەکان ڕاپەڕینی خەڵکی شارەکانی کوبا هاوشانی جەنگە پارتیزانی، وەکو ئەزموونێکی نوێچەشن کاری کردە سەر هەستی سیاسی چەپ و خستنیە سەر هەڵوێستی پیاچوونەوە بە ڕێبازە کۆنەکاندا، چەندین بۆچوون و لێکدانەوەی سیاسی-عەسکەری لەسەر سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا هاتنە ئارا. کە گەڵاڵە تیۆرییەکەیان لەناو ئەو چەپانەدا لە: (البؤرة الثورية)دا

بەکالاّ کرایەوە، لەبنچینەشدا هاوکێشەی گەلاّلەی تیۆرییەکە پێچەوانەی بۆچوونی چینایەتی کلاسیکی باوی سەردەمەکە بووە کە:
- داخۆ حیزب شۆڕشی پێ هەڵدەگیرسێ؟
- یان شۆڕش حیزبی پێ دروست دەکرێ؟
هەرچی بۆچوونە کۆنەکانە سوور بوون لەسەر ئەوەی بەبێ حیزبی پێشڕەو (پێشڕەوەکەش خۆیان بن) ناکرێو ناشێ بیر لە شۆڕش بکرێتەوە چ جای بشکرێ. بەپێچەوانەشەوە (بوئرە)چییەکان دژی ئەو حیزبانە بوونو بە ترسنۆکو بۆچوونەکانیان بە سواو دەزانینو دروستکردنی بوئرە لایان چارەنووس‌ساز بوو. نموونەی سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا‌ش جۆکەری دەستیان بوو. لەوەش زیاتر (رۆژی دوبریە) قەڵەمی (بوئرە)چییەتی لێدادەگرێو دەڵێ: «لە هەندێ وولاتاندا ئەو کۆمەڵە شۆڕشگێرانەی کە بە گەرمی بۆ سازدانی خەباتی چەکدارانە رادەپەڕن، خۆیان لەژێر چاودێری راوەدوونانی ئەو حیزبە (مارکسیە-لینینیانە)دا کە زۆربەیان دەستیان لێ هەڵگرتووە زۆرتر لە چاودێریو راوەدوونانی دەزگا سەرکوتکەرە پەرسەنتووەکانی دەوڵەتان دەدۆزنەوە <٨>.
ئەم دیبەو دنەیە، دژی حیزبە کۆنەکان داکۆکی لێکراوەو کراشە سۆنگەی سیاسەتێکی تازە، لە ئەمریکای لاتیندا. بەمەش خەباتکردت دژی حیزبە بەناو کۆمۆنیستەکان کرایە ئەرکێکی هەرە گرنگی پارتیزان. ئیدی گوێنەدانە پرۆسە کۆنەکان لەمەر: ئەوەی حیزب بێڵێ راستەو ئەوەی نەیکا نادروستەو ئەگەر حیزبی پێشڕەو نەبێ هیچ ناکرێ، ئەو قسانە کە جاران زۆر دەگوتران‌و ئێجگار کەمیش کاریان پێدەکرا. لە ئەمریکای لاتیندا بەتایبەتی لەناو چەپەکاندا باویان نەما وەکو چەند بۆچوونێکی گەرو گول تەماشا دەکران. ئاکامیش پاش سەرکوتکردنی شۆڕشی کوبا تینو تاوی خەباتی چەکداری ئەمریکای لاتینی تەنیەوەو هەستەکانی بەرهەڵستی چەکدارانە تەقیینەوە.
(بوئرە)کان لە ساڵی ١٩٥٩وە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا، لە (سانتۆ دۆمینگۆ، پاراگوای، کولۆمبیا، ئەمریکای ناوەڕاست، رۆژهەلاّتی بەرازیل، پیرۆ، کۆزۆکۆ...تاد.) راپەڕینی چەکدارانەیان بەرپاکرد. لە گوندەکانو لەناو جووتیاران، شاخو جەنگەڵەکانەوە دەستەی پارتیزانییان خستە گەڕ. ناوچەکانیان

<٨> روجية دوبرية. ثورة في الثورة. ترجمة الياس سحاب، الطبعة الاولى ١٩٦٨ ص: ١٤٥.

چەندین ساڵ شڵەژاند. ئەوپەڕەکەی ٥ ساڵی خایاند، تێکچوون و لێکبەربوونی ناوخۆیی هاوزەمانی شەڕی ناوخۆیی کوردستان، لەناو ئەوانیشدا تەشەنەی شوومی سەند. دوژمنانیشیان بە پشتیوانی ئیمپریالیزم هەلی شەڕی ناوخۆکەیان قۆستەوە کەوتنە خۆیان و بەربوونە ویژەی پارتیزانەکان. لە کۆلۆمبیاو ئەکوادۆر، پیرۆ، پاراگوادا ڕەشەبای شکست هەڵیکرد. جووتیارانی بەرازیل بەرێبەرایەتی ڕێبەری دەرکەوتوویان (خولیاو) تێکو پێک شکان. لە ئەرژەنتینیشدا پاش ئەوەی ڕژێم هەڵبژاردنێکی ئازادی بەتاڵ کردەوە ڕاپەڕینێکی گەورەی میللی تەقیەوەو زووش دامرکێندرایەوە. ئاکام چەندین گروپ و ڕێکخراوی بۆرژوازی بچووکی چەپ، گێژو گرژ بوون و چوونەوە قاوغی تەسکیان، وەکو:

- بزووتنەوەی کرێکارو خوێندکارو جووتیارانی کۆلۆمبیا.
- یەکێتی شۆڕشگێڕانی لاوانی ئەکوادۆر
- بزووتنەوەی چەپی شۆڕشگێڕو بەرەی چەپی شۆڕشگێڕ.
- پێشڕەوە سۆسیالیستەکانی ئەرژەنتین.
- بزووتنەوەی پشتیوانی جووتیاران و باڵی چەپی حیزبی سوسیالیستی ئۆرۆگوای.

لەناوەکانڕا دیارە ئەو ڕاپەڕینە چەکدارانە هەڵچوونی چەپی پاش سەرکەوتنی کوبان. هەر بۆیەش زوو داچوون. گیڤاراش کە ئەندازیارێکی تیژەکەو دووەمین ڕێبەری کارامای شۆڕشی سەرکەوتووی کوبا بوو، کتێبەکانی لەسەر ڕێبازی پارتیزانی ئێستاش دیراسە دەکەن و سوودیان لێوەردەگیرێن. هەڵەکانیشی لێدەرهاوێن کە چاو لێپۆشینیان زیانی هەیە، بۆخۆی وەکو قارەمانێکی شۆڕشگێڕ مایەی شانازییەکی مێژووییە کەچی ئەمیش پاش ئەزموونێکی قوڵترو بە ئاستێکی سیاسی-عەسکەری بەرزترو ناوبانگێکی زیاتریش پلەی وەزیری لە کوبادا جێدێڵێ و خۆی دەگەیەنێتە جەنگەڵو چیاکانی بۆلیڤیا، تا وڵاتێکی دیکەی ئەمریکای لاتین لەدەسەڵاتی ئیمپریالیزم ڕزگار بکات.

لەبەر ئەوەی گیڤارا پێی وابوو دروستکردنی (بوئرە)دەستەبەری سەرکەوتنی شۆڕشە، خۆی و چەند هاوڕێیەکی دەگەنە بۆلیڤیاو چەند مەفرەزەیەکی چەکدار پێکەوە دەنێن. ئۆردوی هەڵگیرساندنی شۆڕش دادەمەزرێنن. چەندین شەڕی سەرکەوتوانەش دەکەن. بەلام (بوئرە) بە ڕێبەرایەتی ڕێبەرێکی وەکو گیڤاراش نەک بۆلیڤیای پێ ڕزگار نەکرا، بەڵکو ژیانی خودی گیڤاراو هاوڕێکانیشی ڕزگاریان نەبوو، هۆیەکەیشی ئەوەیە کە: باروودۆخی بۆلیڤیاو کوبا گەلێ جیاواز بوون:

بزووتنەوەی شۆرشگێرانە لە بۆلیڤیادا نەبوو. حیزب و گروپە چەپەکانیش نەک لەناو خۆیاندا ڕێک نەبوون بەڵکو ئامادەش نەبوون یارمەتی گیڤارا بدەن.

لەرووی کۆمەلایەتیشەوە رژێمی بۆلیڤیا پاش (٢٠٠) ساڵ چەوسانەوەی دەرەبەگایەتی ، هەندێ دەستکەوتی بنیاتی سەرمایەداری داهاوە جووتیاران و ئەم دەستکەوتانەش ناکۆکیە بنیاتیەکانی کەمتر کردبوو. بازاڕی سەرمایەداری بوژاندبوو، رق و قینی جووتیارانی تا رادەیەکی زۆر نیشتاندبووەوە. سەرجەمی ئەو ڕاستیانەش دژی سیاسی بۆلیڤیایان خاو کردبوو، بۆیە (بوئرە) و گیڤارا نەیانتوانی خەلک بە تایبەتی جووتیاران ببزوێنن، دەرکەوت:

١- سەرکەوتنی شۆرشی کوبا پێوەندی بە کۆمەلێ هەلومەرجی گشتی و تایبەتیەوە هەبووە مەرج نییە لە ولاتێکی دیکەدا کتومت دووپات ببنەوە.

٢- (بوئرە) یاسای گشتی رزگاری گەلانی ئەمریکای لاتین و ژێردەستە نەبوو وەکو دەوریسترا وای لێبکرێ و پێرەو بکرێ.

٣- ئیمپریالیزم ئەگەر بەهۆی شۆرشی کوباوە غافلگیر کرابێ و دەرکی بە مەترسیەکانی لەسەرەتاوە نەکردبێ، ئەوا پاش سەرکەوتنی شۆرشەکە بێگومان پەندێکی گەورەی وەرگرتووەو لەباقی ولاتانی ئەمریکای لاتیندا فریای خۆی و رژێمە وابەستەکانی کەوتووە. بۆیە لە هەمان روانگەی شۆرشی کوباوە بینینی دژی بۆلیڤیا هەڵەیەکی کوشندە بووە.

. ئەوەبوو... ئەو ولاتانەی مەڵبەندی خەباتی چەکداری ئەمریکای لاتین بوون لەبری سەرکەوتن و دووپات کردنەوەی چەندین کوبای دیکە، کەچی کرانە ئەزموونگای سەرخستنی شۆرشی چەواشەی دەیان کودەتای فاشیانەو دیکتاتۆرانە، لەوەش دژوارتر، ناوکۆیی خەباتی چەپەکان هەڵگێردراو بۆ ناکۆکی کوشندەی نێوان گەلانی ناوچەکەو بە توندی: ئەکوادۆری دژی پیرۆی، پیرۆی دژی بولیڤیایی و شیلی، بۆلیڤیایی دژی پاراگوایی، شیلی دژی ئەرژەنتینی...تاد. تێکراشیان بە دەسیسەی ئمپریالیزم تەقینەوە. سەرچاوەی بنیاتی ئەو شکان و کشانەش دەگەرێتەوە بۆ رۆلی لاوازی وردە بۆرژوا. ئەم چینە بەحوکمی پایەی ئابوری لەرزۆکیان دەتوانن نوێنەرەوەی شەپۆلێکی ئایدیۆلۆژی چەپ بن، کە بەهۆی خیانەتی بۆرژوا نیشتمانی و لاوازی کرێکارانەوە دەخرۆشێن، سەرەتا بەتوندی هەڵدەچن، بەلام کە ئەرکەکان سەنگین دەبن و کاروانی خەبات دووچاری چەرمەسەری سەخت دەبێت، ئیتر هەرگیز ئەم چینە لاوازە توانای بەرهەلستی پشبوودرێژی ئیمپریالیزم و

سەرمایەدارانی وابەستەیان نامێنێ. چونکە وردە بۆرژوا لە ڕووی ئابوورییەوە لاوازو ئەوان بەهێزن. ئەگەر باری بابەتی چەشنی کوبا ئیمپریالیزم لە پەلو پۆ نەخات، وردە بۆرژوا بە دروشمی چەپو ڕێبازی پارتیزانی ناتوانێ لە بەرامبەریاندا خۆ ڕابگرێ. ناشتوانێ شێوازی پارتیزانی بگەیەنێتە ڕاپەڕینی ڕووخاندنی وابەستەکانیان لە شارەکاندا.

بەشێوەیەکی گشتی، لاوازی ئابوری وردە بۆرژوا لە بەربەرەکانی کردنی ڕژێمە ژێردەستەکانی ئیمپریالیزم بەناوی مارکسیزم-لینینیزم بەشێوەیەکی جۆراوجۆر کاری نالەباری کردە سەر شۆڕشی ولاتانی ئەمریکای لاتینو هەندێ ولاتانی دیکەی ئاسیاش‌و دووچاری شکستی قورسی کردن.

وردە بۆرژوا، ئەگەر لەسەردەمی سەرهەلدانی سەرمایەدارییەوە هاوشانی ڕۆلی چاک (لەچاو چینە کۆنەپەرستەکان) گەلێ کێشەیشی بۆ کرێکاران هەردەم هەبووبێ، ئەگەر هەتا ئەو قۆناغەی هێشتا بۆرژوای نەشتمانی (پیشەسازی) کەمو زۆر ڕۆژمی نیشتمانپەروەرێتییان مابوو، وردە بۆرژواش لە ڕوانگەی خۆیەوە دژی چینی لەخۆی بالاتر سەنگەریشی گرتبێ، ئەوا دەبێ بزاندرێ پاش پەرەسەندنی ئیمپریالیزم‌و چۆن پرکردنی بۆرژوای نیشتمانی لە خەباتی نیشتمانی وردە بۆرژوا بۆسەر کرێکاران‌و فەلسەفەکەیان گەلێ لەکۆن ترسناکترن. چونکە چینی کێ بەرکی کەرەکەی جارانی (بۆرژوای نیشتمانی) کە لە ترسی ئەو وردە بۆرژوا بەلای پرۆلیتاریا دایدەشکاند نەماوونو لەم هەلومەرجەدا ئیتر مەیدانیان بۆ چۆل بووە خۆیان بچەسپێنن‌و ئێستا کەمتر منەتی کرێکاران‌و بیروباوەڕەکەیان لە ولاتانی ژێردەستەدا دەزانن. مەگەر بۆ شێواندنی بێت. هەر بۆیە دەبینین لەناو خەباتی ڕزگاریخوازانەی میللەتاندا زیاتر دژایەتی مارکسیزم دەکەن.

## ٤/٣- خەسلەتەکانی دوو ڕێباز

شۆڕشی چەکداری لە کوباو لەو ولاتانەدا جگەلەوەی جیاوازییەکی بەرچاوی بنچینەیی لەگەلێ شۆڕشی درێژخایەنی چیندا هەیە لە ڕاستیشدا کاسترۆ خۆی دەلێ: هەتا شۆرشمان کرد من هیچ کتێبێکی (مارتسی تونگ)م نەخوێندبووەوە، کەواتە لە دوو ڕوانگەی جیاوازەوە ڕێبەرایەتی هەردوو ولاتەکە ڕێبازی ڕزگاریان دارشتووە. هەلومەرجی چین جۆرێک ڕێبازی خواستووەو هی کوباش جۆرێکی دیکە. ئەو بزووتنەوە جووتیارییەو ئەو چەوساندنەوە دەرەبەگییەی لە چیندا هەبووە،

له کوبادا به جۆرێکی دیکەو بە شێوەی جیاواز هەبووە. لەچیندا کە دانیشتوانی سەدان جار لە کوبا زۆرتر بووە تەنیا دوو حیزبی بەهێزی تیا بووە (کۆمینتانگ‌و حیزبی کۆمۆنیست) یەکێکیان دەسەلاتدا ئەوی‌دیان ئۆپۆزیسیۆنی شۆڕشگێڕ. کەچی کوبا چەندین حیزب‌و لایەنی ئۆپۆزیسیۆنی تێدا بووە دەسەلاتیش بەدەست دیکتاتۆری بووە . دۆخی شارەکانیشیان جیاواز بووەو شۆڕشەکانیش لە هەلومەرجی جیهانی گۆڕدراودا هەلگیرساون. ئەمە جگەلە باری جوگرافی ولاتەکان. وەکو ئەو جیاوازییە زەقانە لە نێوان چین‌و کوبادا هەبووە، وێڕاش شۆڕشی چەکداری بە دوو شێوازی جیا لە هەردوو ولاتەکەدا هەبووەو لە هەردووکیشیاند لە جەنگی پارتیزانیەوە دەستیان پێکردووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ هەتا ئەودەمەش لە بەرامبەر رژێمە بەهێزو دیکتاتۆرەکاندا شۆڕشگێڕان سەرەڕای جیاوازی باروودۆخی ولاتەکانیان لە رووی بابەتییەوە، ئەندێشەی جەنگی پارتیزانی زال بووە بەسەریاندا. هەربۆیە لە کوباشدا سەرەڕای تەواوی ئەو جیاوازییانەی لەگەل چیندا هەبووە بیر لەو جەنگە کراوەتەوەو پێڕەویش کراوە.

تایبەتمەندییەکەی کوبا لەوەدایە (حیزبی پێشڕەو) وەکو چین رێبەرایەتی شۆڕشەکەی نەکردووەو چاوەڕێش نەکراوە هەتا ئەو حیزبە لەدایک نەبێ، شۆڕشیش نەکرێ، لە کوبادا ئەگەرچی بە پارتیزانیش دەست بە شۆڕش کراوە، بەرە بەرە لە بەرەکانی جەنگیشدا، گوندو شارۆچکەکان یەک لە دوای یەک رزگار نەکراوون تا رزگارکردنی پایتەخت (وەکو لە چیندا کرا). بەلکو شۆڕشی پارتیزانی شێوەیەک بووە لە شێوەکانی خەبات‌و خەباتی ناو شارەکان چارەنووسی شۆڕش‌و رژێمەکەیان دیاری کردووە، واتە: کە تەنگ‌و چەلمەکان لە کوبادا، لەناو شارو گوندەکانی‌دا، قول بوون‌و خەباتی پارلەمانی، ریفۆرمیستی، مانگرتن، دادی خەلکی نەداوەو رژێمی دیکتاتۆری باتیستا چۆکی دانەداوەو ئەوسا کاسترۆو هاوڕێکانی دەرکیان بە پێویستی رێبازی پارتیزانی کردووە وەکو شێوەیەکی کاریگەری پالەپەستۆ خستنەسەر رژێمەکەو گورجتر تەقاندنەوەی ناکۆکییەکان بۆ زووتر رەخساندنی زەمینەی راپەڕاندن‌و راپەڕینی خەلکی شارو شارۆچکەکان. هەر بەڕاستیش، کتومت وادەرچوو.

ئینجا ئەم شۆڕشە سەرکەوتووەی کوباو تەواوی هەولەکانی پاش ئەمیش لە ئەمریکای لاتیندا لە مێژوودا لە هەمان ناوچەی جوگرافی‌و لەبەرامبەر ئیمپریالیزمی ئەمریکاو رژێمە دڕندە

وابەستەکانی‌دا سەرەڕای لاسایی کردنەوەی دڵسۆزانەش نەبوون بە یاسای نەگۆڕی خەباتی گەلانی وێکچووی کوبا، هیچ نەبێ دەرکەوت.

ئەگەر هەلومەرجی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری، سیاسی‌و عەسکەری شۆڕشگێڕانە، بەتایبەتی لە شارەکاندا پاش شارەکان لە گوندەکانیشدا وەکو پێویستە لەبارنەبێ، ئەوا هەرگیز تەنیا بە قارەمانێتی‌و ئازایەتی، بەدەستپێشکەری پێکەوەنانی (البورە الشوریە)، ناتواندرێ هیچ وڵاتێک رزگار بکرێت‌و چاو لێکردنی کوباش، بەبێ لێکدانەوەی ورد بەرێی هات‌و نەهات بردنی چارەنووسی گەلانەو هیچی دیکە.

شۆڕش بە چاولێکەری ناکرێ‌و بۆ ئەوەی میللەتانیش نەخرێنە تەپکەی ترسناکی چاولێکردن‌و چاولێکەری گەلانی سەرکەوتوو، پێویستە ڕێبەرو ڕێبەرایەتی میللەتان خۆیان لە کارایی ڕۆمانسیانەی سەرکەوتنی شۆڕشی گەلان بپارێزن‌و دوور بن لە سۆزی بێ بناغەی زانستییانەی هەڵگیرساندنی شۆڕش. هەروەها ڕۆڵە شۆڕشگێڕو هۆشمەندەکانیش پێویستە وردی هەڵوێستی ڕێبەران‌و وریای ئاکامی بڕیارو سیاسەتەکانیان بن. ئەمانەش تێکڕا، بە ئاستی بەرزی تیۆری‌و بە قوڵی ئایدۆلۆژی‌و قاڵی ئەزموون‌و سیاسەت‌و مەیدانی خەبات دێنەدی.

گەلێ جار سیستەمی نەتەوایەتی‌و چەوساندنەوەی چینایەتی، دۆخی سیاسی دژوارو کارەسات‌و ڕووداوێک پاڵ بە گەلان، چینە شۆڕشگێڕەکان، حیزبە سیاسییە نفوز پەیاکردووەکانەوە دەنێن هەڵوێستی لێبڕاو وەربگرن‌و بە پرۆسەی سیاسی سەخت وەڵامی پێویستیە کاتییەکان بدەنەوە، بەڵام مادام زەمینەو زەمانەی ئەو پرۆسەیە لە ڕووی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەوە وەکو دەخوازێ نەرەخسابێ، بێگومان بۆ حیزب‌و شۆڕش‌و ڕێبەران کاری سیاسی‌و عەسکەری گەورە، ماوەیەکی زۆریش بچێتەسەر، بەڵام سەرکەوتنی ستراتیژی ناهێنێتەدی چونکە بناغەی دەستدانە پرۆسەکە فشۆڵە. ئەگەر بشگوترێ پاش سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا شۆڕشی (نیکاراگوا)یش هەتا ڕادەیەکی زۆر لەسەر هەمان ڕێباز سەرکەوتنی وەدەستهێنا، ئیدی بۆ لەناو میللەتەکانی دیکەی جیهاندا ناکرێ هەمان ڕێباز سەربخرێ. وەڵامی ئەو پرسیارەش کورتە باسکردنێکی شۆڕشی نیکاراگوایە.

## ٢/٣- دووەمیان نیکاراگوا

لە ولاتە بچووکەکانی ئەمریکای ناوەند، شەش هەزار میلی چوارگۆشە رووبەریتی. ئەوکاتەی شۆڕشیان کردووە دوو ملیۆن و نیو تێبەڕبوون (٥١٪) لادێ نشین و باقیەکەیشی شاری بوون، ولاتەکە بەپێی سیاسەتی جیۆپۆلیتیکی فراوانخوازی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کلیلی ئەمریکای ناوەندە بۆیە چۆن ڤێتنام لە خوارووی رۆژهەلاتی ئاسیادا بە نیسبەت ئەمریکاوە ئێجگار بایەخی هەبووە، ئاوەها نیکاراگواش لە ئەمریکای ناوەندا بۆ ئەمریکا بایەخی هەیە. کەواش بووبێ، چی بە ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی کرابێ بۆ داپینکردن و لەدەستدانی ولاتێکی وا لە ناوچەکانی جوگرافی گرنگی وادا کردوویانە، بەلام ژیان و رووداوە کۆمەلایەتی و سیاسیەکان کە هەلومەرجی شۆڕشگێڕانەی گۆڕانیان خەملی ڕێک پێچەوانەی بۆچوونی چاوەڕوان کراوی ئیمپریالیزم دەتەقنەوە. بەمەرجێ ئەو هەلومەرجانە پەرەپێبدرێت و خاوەنی ڕاستەقینەیان بیانقۆزێتەوە. لە نیکاراگوادا وا بووە چونکە لە ٢٥٪ی شاری و لە ٢٥٪ی لادێیی بێکار بوون. نیوەیان زیاتر نەخوێندەوار بوون. پزیشک و پێداویستیەکانی تەندروستی، زۆر نزم بووە، خانووبەرەیان کەم و هەزاران منداڵیان مردووەو برسێتی برستی لێ بڕیبوون. تەنانەت لە ٨١٪ ماڵانیان بۆری ئاویان نەبووە. ئیدی چلۆن میللەتی وا بە ڕژێمی دیکتاتۆری وەکو (سۆمۆزا) ڕازی دەبێ و ڕژێمەکەش بەچ شێوەیەک و بە کام پشتیوانی دەتوانێ میللەتەکە داپێن بکات و هەنگوچەڵەمەیان چارسەر بکات و ڕێگای شۆڕشیان لێ بگرێ؟ وەکو: باری ئابووری و کۆمەلایەتی. جوگرافی و سیاسی، نیکاراگواو خەلکی نیکاراگوا بەو چەشنە بووە، وەنەبێ خەلکی نیکارگواش خۆڕسکیانە ڕاپەڕیبێ و شۆڕشی سەرکەوتوویان کردبێ. نەخێر وانیە، ئەگەر وا هەرمەکی بە چاولێکەری کوبا یان شۆڕشی دیکەی جیهان بەبێ حیساب کردن بۆ بارودۆخی خودی نیکاراگوا، نیکاراگواییەکان شۆڕشیان کردبا ئەمانیش بەدەردی ولاتانی ئەمریکای لاتین و شۆڕشە ژێرکەوتووەکانیان دەچوون.

باری بابەتی ولاتەکە بۆ شۆڕش بە تەواوەتی خولقابوو. نە ڕژێم توانای چارسەرکردنی کێشەکانی مابوو، نە خەلکیش چیدیکە بە ڕژێمەکە ڕازی دەبوون. تاکە ئامرازی مانەوەی ڕژێمی سۆمۆزا کوشتن و گرتن و تۆقاندن بووە. لە پاسەوانەکانی و ئەمریکا بەولاوە دۆست و پشتیوانی نەمابوون.

بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانە بە تەوژم بووە . ڕێکخرا بوو. ژیرانە ئاراستە دەکراو

تەواوی ئۆپۆزیسیۆن لەبەرەی (ساندینیستا)و یەکخستنی سۆشیالیستیو زیاتر لە (۲۰) ڕێکخراوی قوتابیانو کرێکارانو خەڵکیدیش یەکیان گرتبوو. چەندین کۆمیتەی گرنگیان دژی ڕژێم دامەزراندو بەرنامەی هاوبەشی شۆڕشگێڕانەیان دارشتوو دەوڵەتی کاتیشیان ڕاگەیاند. ئیدی هەتا دەهات لە ناوچەکەو جیهاندا دەوڵە کاتییەکە بە ڕەسمی دەناسراو ڕای گشتی جیهانو دەوڵەتان لە سۆمۆزا دەتەکینەوە.

لەناوگەرمەی ئەو ڕووداوانەدا، خەباتی چەکداری پێڕەو کراو خەباتی چەکداریش وەکو درێژەکێشانی تەنگوچەڵمە لە چارەسەرکردن نەهاتووەکان توانی کورەی قینو نارەزایی خەڵکی شارو لادێکان زیاتر جۆش بداتو بەرە بەرە خەباتی شارو شاخ، هی کرێکارانو زەحمەتکێشانو جووتیارانو کاسبکارانو نیشتمانپەروەران ئاوێتە بکاتو پێکەوە سازی ڕاپەڕینیان بدات. سەرەڕای بەرهەڵستی سەرسەختانەی ڕژێمو پشتیوانی لێکردنی ئەمریکاش، شۆڕشی ڕاپەڕینەکە خەباتی چەکدارییەکەی گەیاندە ئاکامی سەرکەوتن، دەریشکەوت کەوا شۆڕشی کوبا، هەرچەندە چەندین کۆششی شۆڕش‌کردن سەری نەگرت، بەڵام ئەگەر بێتو گیانی چەپی چاولێکردنی چەوت فڕێ بدرێو میللەتەکان بابەتییانە: یاسا گشتیو تایبەتییەکان، بارودۆخەکان، دۆستو دوژمنان، شارو شاخەکان توانای بەرهەڵستی پێشکەوتنخوازانەی چینە پێشکەوتووخوازەکان، شۆڕشگێڕانە لێکبدەنەوەو لە ئانو کاتی خۆیاندا بە شێوەیەکی ئۆرگانیکی سەرجەمیان بکەنە هێزی ئایدیۆلۆژی ماتریالیستی بزوێنەری جەماوەر، ئەوا ڕێبەرایەتی متمانە پێکراو، تاقیکراو، گومان‌لێنەکراوی ڕاستگۆی کۆڕی خەبات، کرێکارانو میللەتان هەر بەرەو سەرکەوتن دەبەن.

> بە هەڵڕشتنی ڕستەی شۆڕشگێڕانەو هەڵواسینی دروشمی گۆشەگیرانەو تاکتیکی فریودەرانەو ستراتیژی ئاوەژووکراو... یان پێ لەسەر ڕێبازی شۆڕشی درێژخایەن داگرتن. بەبێ لەبەرچاوگرتنی وەک پێویستی باقی ئەرکەکان، گۆڕانو گۆڕانکارییەکان، پێوەندییە ئابووریو دیاردە نوێکان... کرێکارانو میللەتان ستەمە سەرخۆرێن. وێڕای قوربانییەکی بێ ژماریش هەر ژێر دەخرێن!

## ٤- ئاکامو ئاینده

کۆمەڵو پەرسەندنی کۆمەڵایەتی میللەتان، ئاڵۆزو جیاواز پێک هاتوون. هیچ کەسێک دەسەڵاتی هێڵی جوڵاندنی نەکێشاون، هەر هەوڵێک بۆ سازکردنیان ، یان بە ئارەزوو هەڵسوڕاندنیان، یاخود بەپێی یەک پێوانەی نەگۆڕ بەکارهێنانی بێجیاوازی دیاردەو دەرکەوتەکان، ئەنجامێکی ترسناکی هەیە. لە ڕێڕەوی دەرکەوتنی ڕووداوەکانی ئەم ئەنجامە ترسناکەی لێکدانەوەی هەڵەکاندا خراپ بەرەو خراپترو خراپترینیش هەڵدەخزێ. ئەمانە، چ لە شتە بچووکو چ لە شتە گەورەکاندا ڕوودەدەنو ڕوودەدەنەوە...تاد. بەڵام ئاکامی تێکڕا ڕووداوەکان، چەند نالەبار بن، هەر ئەو ئاکامە بەپێی یاسای دیالێکتیکی (ڕەتی ڕەتکراو-نفي النفي) ڕێبازی گەیشتنە ئاکامێکی باشتر دەرەخسێنێو دڵسۆزان دەخاتە سەر هەستو هەڵوێستی ڕاستەقینە. ئەو دڵسۆزانە ئەگەر ئاستی ئایدیۆلۆژیو توانای تیۆریو دڵسۆزی سیاسیان بایی ئاکامی ناکامەکان بوو، ئەوا دەتوانن بەرامبەر کرێکارانو گەلەکەیانو مێژوو ئەرکێکی شۆڕشگێڕانە ڕاپەڕێنن یان هیچ نەبێ بناغەی ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکە داڕێژن خۆ ئەگەر واشنەبوونو ئاستیان لە پێویستی ئەو ئاستە چارەنووسازە کەمتر بوو، ئەوا لە بازنەیەکی بەتاڵدا دەخولێنەوە هەتا خپ دەروخێن.

داخۆ کام شۆڕش؟ و شۆڕش چەند پێویستی بە پێداویستیەکانی دیکەی خەباتە بەتایبەتی لەم سەردەمەدا؟ ئەوانە دوو پرسیارن چارەی شۆڕشی چەکدارانە دەنووسن، زانینو کارپێکردنیان پێوانەی سەرکەوتنەو نەزانینو پێشێلکردنیان سەرچاوەی ژێرکەوتنە.

سەرکەوتن پابەندی پارەی بێ ژمارەو چەکی کاریگەرو پشتیوانی بێ درێغ نییە، بەڵکو پێش ئەوانەو گرنگتریش لەوانە، چارەنووسی شۆڕش بەندی ستراتیژو دروشمی ڕاستەو تاکتیکەو کردەوەی شۆڕشگێرانەن. ئەگەر ئەو ستراتیژو دروشمەو تاکتیکانە زانستیانە دانەڕێژرێن، چەکو پارەو پشتیوانی نەک شۆڕشەکان سەرناخەن بەڵکو بۆگەنیشیان پێ دەکەنو ڕەوشتی شۆڕشگێرانەی کادرەکانیان دەشێوێنن. هەرکاتێ: ستراتیژ بەپێی پرنسیپ داڕێژراو دروشمی ڕۆشنیشی لێ هەڵگیراو دروستترین تاکتیکەو ڕاستترین پراکتیکیش‌کرانە پەرژینی شۆڕش، ئەوکاتە بڕیاری ڕێبەرایەتی شۆڕشەکان دەبنە ڕێنوێنی جەماوەرو دڵنیایی لە سەرکەوتن ئاسودەیان دەکات ئەمەش پەیتا پەیتا دەبێتە مایەی زیاتر بزواندنی جەماوەری زەحمەتکێش.

## ٤/١- گۆڕانو گۆڕین

لە ڕشتەکانی پێشتردا کەمێک لە کورتی درێژتر چەندین نموونەو شێوەی شۆڕشمان شیکردۆتەوە. هەرچیەکیشمان نووسیوە پێوەندییان بە ڕابردووەوە هەیە کە هەنووکەش شۆڕشی کوردستان دیلیەتی دەتوانین بڵێین لە بۆچوونو لێکدانەوەدا، کەمتر باری ئێستامان هەڵسەنگاندووە. بەڵام بەهیوای ئایندەیەکی گەشتر، تەکانێک بۆ پێشەوە دراوە. با پێکەوە سەرنج بدەینە ئەم دەقە: شۆڕشی کۆمەڵایەتی سەدەی نۆزدە دەتوانێ جامەی خۆی تەنیا لە دەقی ئایندە وەربگرێ نەک لە ڕابردوو. ئەم شۆڕشە هەتا هەرچەشنە بڕوای خورافی ڕابردوو بە تەواوەتی نەخاتە لاوە ناتوانێ ئەرکی تایبەتی خۆی جێبەجێ بکات. شۆڕشەکانی پێشوو لەو ڕووەوە پێویستیان بە وەبیرهێنانەوەی ڕووداوە مێژووییەکانی سەردەمە تێپەڕیوەکان هەبوو کە بتوانن ناوەڕۆکی خۆیان لەخۆیان بشارنەوە شۆڕشی سەدەی نۆزدەش بۆ ئەوەی بتوانێ ناوەڕۆکی خۆی بۆخۆی دەرخات دەبێ " لە مردووەکان بگەڕێ تا مردووەکان بیاننێژن" لەوێ ڕستە ناوەڕۆکی جێهێشتەو لێرە ناوەڕۆک ڕستە بەجێ دەهێڵێ ‹٩›.

‹٩› هەژدەی برۆمێری لویس بۆناپارت. وەرگێڕانی سیامەندی شاسوار، ل: ٩٩.

گەوهەری ئەم گوتەیە بە لەبەرچاوگرتنی گۆڕانکارییەکان ئێستاش زیندووە، ولاتانی داگیرکراوی دەرەبەگ و نیمچە دەرەبەگ (بێگومان هی جاران). لەپاش شۆڕشی چینەوە توانیان هەلومەرجی نوێ لە بەرچاو بگرن و خۆیان بە کۆمەڵێ یاسای کلاسیکی نەبەستن و بە شێوەیەکی گشتی، لە زۆر شوێندا، پابەندی بە ڕێبازی نوێ و خۆنەبەستنەوە بە ڕێبازی کۆن، سەرکەوتنیشی بەدەست هێنا.

زۆرشت لە جیهاندا ئێستاش لەچاو سەردەمی سەرکەوتنی شۆڕشی چین و لەوەودواش گۆڕاوەو پێویستە ئەندێشمەندان، خەڵکانی هۆشیارو شۆڕشگێر، لەبەرچاویان بگرن و ئایندە ئەنگێوبن. خۆیان نەبەستنەوە بە ڕابردوو، دۆگم نەبن و دۆگماتیزم تووڕ بدەن. هەرچەندە ڕابردووەکەش باش بوویی و ڕەوتی تیۆری و تێزەکانیشی سەرخراوی زەمان و زەمینەی خۆشیان بووبن کە زەمان و زەمینەکەیان گۆڕا دەبێ ڕێبازیش بگۆڕێ.

> هەموو شێوەیەکی ئابووری و سیاسی، عەسکەری و پیشەیی، ڕۆشنبیری و مرۆیی ئامرازێکن لە ئامرازەکانی بەدیهێنانی ئامانجە دوورو نزیکەکان. هەندێ لەو ئامرازانە بە میرات بۆ چینەکان و هەندێکی دیکەیشیان داهێندراوی خودی چینەکانە. بەمیراتماوەکان پەرە پێدەدرێن و تێکەڵاوی داهێندراوەکان دەکرێن. بەپێی ئەرکی سەرەکی و لاوەکی قۆناغەکانیش بەکاردەهێندرێن.

ئەو ئامرازانە، لەهەریەکێک لە قۆناغەکان، دۆخەکان، چەند گرنگ و کاریگەربن، قۆناغ بگۆڕێ و دۆخی نوێ بێتەگۆڕێ، ئامرازیش دەگۆڕێ. ئەمە لە یاسا سەرەتاییەکانی دیالێکتیکە هەچ یەکێک لە ئامرازەکانی خەبات گەورەترین سەرکەوتنیشی لەناو چەندین ولات و میللەتدا هێنابێتەدی، ئەمرو نەگۆڕ نییە.

مێژووی کرێکاران و خەباتی گەلان پڕن لە دەیان شێوەی خەباتی ئاڵوگۆڕپێکراو: مانگرتن، خۆپیشاندان، ڕاپەڕین، سەنگەربەندی شارەکان، ناڕەزایی دەربڕین، شۆڕشی شارەکان و جەنگی پارتیزانی شارەکان، هەروەها خەباتی چەکداری شارەکانیش (تیرۆرو تێکدان) هیچیەکێ لەو شێوە خەباتانە نەکراونەتە پەیکەرو پەرستراو. دەبێ بزانین لە ڕوانگەی زانستییەوە نەک ئامرازەکانی خەبات بەڵکو چینەکانی کۆمەڵیش، تەنانەت چینی پرۆلیتاریاش لە پاشەڕۆژی دووردا نامێنن.

## ٢/٤- شۆڕش دەگۆڕێ!

شۆڕشی چەکداریش لەو ئامرازانەی خەباتە کە لە منداڵدانی جەنگی کۆنینەوە لەدایک بووەو بووە بە میراتی چینە چەوساوەکان. چونکە لەهەموو قۆناغێکدا هەتا ئێستا چەوسێنەرەکان دەسەڵاتی چەوساندنەوەی خۆیان بەجەنگ سەپاندووەو پاراستووە. بە ئارەزوو هیچ چینێکی دەسەڵاتدار هەرگیز لە مێژوودا تەختی دەسەڵاتیان بۆ چینێکی نوێ جێ نەهێشتووە.

شۆڕشی چەکداری، جۆرەها گۆڕان و گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو دێت. لەوانە شۆڕشی درێژخایەنیش. ئەگەرچی هێشتا گەلانی داگیرکراویش ماون لەبەرئەوەی پێوەندییەکان گۆڕاوون و دیاردەکان وەکو کۆن نەماوون. تەکنۆلۆژیای جەنگ زاڵەو شۆڕشی چەواشەی سەرمایەدارانیش بەپێی بەرژەوەندی سیستەمە جۆراوجۆرەکانیان هاوئاهەنگە.

> داخۆ هەتا ئەو ڕۆژەی گەلێکی داگیرکراومابێت دەبێ شۆڕشگێڕانی پێڕەوی شۆڕشی درێژخایەن و جەنگی پارتیزانی، ئێستەرەم بە زیبک و زاکون (قانون و الحرکە) بزانن و ئیللان و بیللان ئەم ئامرازەی خەبات بە ڕاستەقینەی سەرکەوتن بزانن یان نەء؟ دەمێکە وەڵامی ئەم پرسیارە مشتومڕی لەسەرە، باسدەکرێ و دەکۆڵرێتەوە. تەنیا لە کوردستانداو لەناو میللەتانی دواکەوتووی وەکو کورد نەبێ کە هەمیشە لە شۆڕشی چەکداریان و هیچیشیان بە هیچ لە سایە خوێناوییەکەیدا نەکردووە (ئازەری، بلوچ، ئەرمەن، پەشتم، تامیل...تاد.) کەچی نە وازی لێدەهێنن و نە بە گوێرەی گۆڕانکاریە نوێکانیش لێی دەکۆڵنەوە. هەر بۆیە ئەڵتەرناتیڤی سەرکەوتنیش نادۆزنەوە. نەدۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤی شۆڕشگێڕیش میللەتان بە ژێردەستەیی و داگیرکەران بە زاڵی دەهێڵێتەوە.

وەکو تەواوی دیاردەو ڕووداوەکان پارتیزانیش لەجیهانبینی چینایەتی جیاوازەوە لێک دەدرێتەوە. هەن ئێستاش لە جاران گەرمترن لەسەر جەنگی پارتیزانی و هەشن توخن کەوتنی ئەم چەشنە بە چەنەبازی چەپڕەوانەی دەزانن. لەبەرامبەریشیاندا ڕێچکەی تازە سەری هەڵداوەو پێیانوایە هەردوو بۆچوونەکە چ ڕێبازی شۆڕشی

دڕێژخایەن و چ دژایەتیەکەیشی بە هەڵە دەزانن و لێکۆڵینەوەی نوێ‌چەشن دەخەنە ڕوو. لایەنگری دارشتنی ستراتیژی نوێی شۆڕشگێڕانەی گونجاون لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی سەردەم.

ئەو ڕێبازانە کامیان ڕاستەو کامیان هەڵەن؟ هۆی ڕاستەکەیان چییەو چاوگی هەڵەکەیان چۆنە؟ ئەو پرسیارانە سەرەباسی چارەنووس پێوە بەستراوی خەباتی گەلان و کلیلی دۆزینەوەی ڕێگای ڕزگاری و ئازادیەی، هەرلایەک بتوانێ وەڵامی زانستیانە بداتەوەو بابەتیانە بیسەلمێنێ، پارمەتیەکی مێژوویی گەلاڵەکردنی بەرنامەی شۆڕشگێڕانەی لەمەوداو ئایندەی زەحمەتکێشان دەدات. بەپێچەوانەشەوە بەهەڵەچوونی چەپ و ڕاست لە وەڵامدانەوەدا زیانێکی ترسناکی بۆ ئێستاو داهاتوو دەبێ.

وەڵامەکانیش سەدان لێکۆڵینەوەو نووسین هەڵدەگرن کە حەق‌وایە هەموو ئەندێشمەندێک، سیاسی و عەسکەری بە توانا بەتەنگیەوە بێت و لەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بکۆڵێتەوە.

## ٣/٤- جێگۆڕکێی چینایەتی

هەروەکو چۆن لەکۆنەوە دیاردە نوێکانی سەرمایەداری قووڵ نەبووبن یان زۆرو قوڵیش بووبن، کەم و زۆر کاریان کردۆتە سەر باری کۆمەلایەتی و هەڵوێستی سیاسی، ئاوەهایش ئەم گۆڕانە گەورەو کاریگەرەی ئیمپریالیزمیش ڕاستەوخۆ کاریان کردۆتە سەر باری کۆمەلایەتی و کارکردنەکەش پایەی سیاسی چینەکانی گۆڕیوە.

کۆن، کەم و زۆر دەشیا لە وڵاتانی وەکو عێراق بۆرژوای پیشەسازی لاوازی نیشتمانی بەربەرەکانی لەگەڵ هەندێ لە دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان یان لەگەڵ هەندێ کۆمپانیای لاوازیان بکات و بۆ سەرخستنی ئەمەیش پشت بە هەستی نەتەوایەتی و بەرهەڵستی نیشتمانی و هەڵوێستی چینایەتی ببەستێ. هەڵبەتە ئەمەیش لە حاڵەتێکی سیاسی تایبەتیدا کە ئەگەر مەترسی پەرەسەندنی خەباتی شۆڕشگێڕانەی کرێکاران، بە مەترسی‌تر لە مەترسی ئیمپریالیزم نەزانێ. کە هۆیەکەشی بەرژەوەندی ئابوری هاوبەشی بابەتیانەیە بۆیە لە بەرامبەر ئەو مەترسیە بۆسەر بەرژەوەندی چینایەتی هاوبەشیان لە کۆنەوە لە ئیمپریالیزم نزیک کەوتوونەتەوە. ئەو ڕاستیە سەبارەت بە بۆرژوای کۆنە نیشتمانپەروەر، کۆن وا بووبێت کە ئیمپریالیزم بەم

چەشنەی ئێستای لە ڕووی سەرمایەو پیشەسازیو تەکنۆلۆژیاوە، نیو هێندەش باڵادەست نەبووبێ، دیارە لەم هەلومەرجەدا بۆ هەتا هەتایە، چەکی نیشتیمانپەروەریتی لە شان بۆرژوای نیشتمانی داماڵدراوەو لە بەرامبەر زاڵی ئێستای کۆمپانیا فرە ناسنامەکاندا کە حوکمی ئابوری زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی جیهان دەکەن، ئێستا ئەم چینە نەک بە کارخانەی بچووکو بەرهەمی کەم بایەخ (کە هەرکاتێک مۆنۆپۆلەکان گەرەکیان بێ دایاندەخەن) ناتوانن کێ بڕکێ لەتەک مۆنۆپۆلەکاندا بکەن، بەڵکو لە وڵاتە ژێردەستەکانیاندا ئیمپریالیزم تەواو بۆرژوای دەستەمۆ کردووە، ئەم چینە بەبێ ئیمپریالیزم یان لەبەرامبەری ئیمپریالیزمدا تەنانەت ناتوانن قەیتانی پێڵاویش سەربەخۆ بەرهەم بهێنن، کەواتە: بۆرژوای نیشتمانی، وەکو چینێکی خاوەن سەنگی سیاسی-چینایەتی، لە بازنەی بزووتنەوەی ڕزگاری-دیموکراسی دەرخراوەو توندوتۆڵ شەتەکی ئەمپریالیزم دراوە. ئەم چینە دەمێکە بۆتە بەشێک لە سیستەمی سەرمایەداری جیهانو بەدیهێنەری مەرامە سیاسیەکانی. بەشێوەیەکی بنچینەیی بۆرژوای پیشەسازی لە وڵاتانی وەکو ئێمەدا ئەگەر دەسەڵاتی سیاسیشیان وەکو چین بەدەستەوە نەبێ، بەڵام بەرژەوەندییان ئاوێتەی ئابوری ڕژێمەکان بووەو ڕژێمەکانیش ژێردەستەی ئیمپریالیزمن. کورتیەکەی بۆرژوای نیشتمانی لەناو ئۆردووی سەرمایەن دژی ئۆردووی کار. هەربۆیە وەکو دوژمنی سەرسەختی کرێکارانو خەباتی گەلان دژی سۆشیالیزمو ڕزگاری- دیموکراسیشن.

جوتیارانیش: جاران، گەوهەری خەباتی نیشتمانی- دیموکراسی بوونو زۆرینەی لەشکری شۆڕشی درێژخایەنیان پێکدەهێنا ئەمەش لەبەر ئەوەی: دەرەبەگایەتی زاڵ بوو، دەرەبەگ پایزەبرا گەورەی پاش شەنکردنی خەرمانی جووتیاران بوون. ناکۆکی سەرەکی لەنێوان جووتیارانو دەرەبەگەکاندا هەبوو، گەورەترین داخوازی جووتیاران ڕیفۆرمی کشتوکاڵی بوو. ئەم ڕیفۆرمەش کۆن بەبێ ڕزگاریو دیموکراسی نەدەهاتەدی. هەربۆیە کە شۆڕشی ڕزگاری لە گوندەکانەوە دەستی پێکرد جووتیاران لەو مەڵبەندانەی باری بابەتیو خۆیی شۆڕشیان تێدا پێدەگەیشت، چەکیان هەڵدەگرتو دەبوونە زۆرینەی لەشکری شۆڕشەکانیش. شۆڕشگێڕەکانیش ئەگەر ئەو ڕاستییە کۆمەڵایەتیەی جووتیارانیان دەرک نەکردایە نەدەچوونە ویژەی جووتیارانو چەکیان پێ هەڵنەدەگرتن. بەڵام لە پەنجاکان بەدواوە، هەتا هاتووە ئەوبارە کۆمەڵایەتییەی جورتیارانو پایەی ئابوریان گۆڕاوە، لەلایەکەوە شۆڕشە نیوە

سەرخراوەکەی ولاتانی ژێردەستە بە ڕێبەرایەتی وردە بۆرژواو بۆرژوا[1] تا ڕادەیەک بەرژەوەندییان وا خواستویەتی هەنگاوی گەورەی ئابووری بۆ جووتیاران هەڵبگرن و ڕاستەوخۆ بەپێی نەخشەیەکی بۆرژوازییانە، لە چەوساندنەوەی دەرەبەگایەتی ڕزگاریان بکەن. لەم ڕووەوە هەنگاوی ئابووری بەرچاویان بۆ ناون و دەنێن؛ لەڕوویەکی دیکەشەوە بەرژەوەندی پێکەوە گرێدراوی ئیمپریالیزم و ڕژێمە بۆرژوازییە ژێردەستەکان وایانخواستووە پێوەندی سەرمایەداری باڵبکێشێ بەسەر لادێیەکان و جووتیاراندا. چونکە ئەگەر ئاستی ژیانی جووتیاران و هێزی کڕین و فرۆشتنی باشیان نەبێ، کاڵای سەرمایەداریش بازاڕی گەرمی نابێ، بۆیە: گوندەکان لەچاو کۆن هەتا هاتووە زیاتر میکانیزمەکراوون. ڕێگاوبانیان بۆ براوە،بەیتەرەیان بۆنێردراوە، قوتابخانەو خەستەخانەیان بۆ کراوە. لەبەر ئەوانەش بەرهەمیان زۆرتر بووەو زیاتریش دەفرۆشرێ و دەکڕدرێ: ئەوانە هەموو باری کۆمەڵایەتی جووتیارانی گۆڕیوەو گەیەندراونەتەوە سایەی ژیانێکی گەلێ ئاسوودەتر لەو ژیانەی لەسایەی دەرەبەگایەتیدا بەسەریان دەبرد.

ئەوگۆڕانە ئابوورییە، بێگومان ئەگەر لەبنەڕەتەوە باری کۆمەڵایەتی جووتیارانی نەگۆڕیبێ، دەبێ لەوە دڵنیابین باری چینایەتییانی بە جۆشنێ گۆڕیوە ئیدی لەهەر وڵاتێکی ژێردەستەی دەوڵەمەندا ئەو گۆڕانە ئابوورییانەیان تێدا هاتبێتەدی، جووتیارانیان لەبەر هیچ هۆیەکی دیکەو لەژێر کاریی هیچ سیاسەتێکی کۆن و نوێش وەکو کۆن ناکرێنەوە گەوهەری شۆڕشی نیشتمانی-دیموکراسی. لە شۆڕشی درێژخایەنی لە گوندەوە دەستپێکردوودا، نابنەوە زۆرینەی لەشکری دوژمن ڕامالێن. ئیدی ستەمە دروشمی بۆرژوایانەی وردە بۆرژوای حوکمکراو یان هی وردە بۆرژوای بالادەستی نەتەوە ژێردەستەکان، چەشنی جاران کە دەرەبەگایەتی مابوو، کە کرێکاران نەبوونە چینێ خۆیان و نەیاندەتوانی پێشڕەوایەتی خۆیان و زەحمەتکێشان بکەن؛ ستەمە بتوانن جووتیاران ببزوێنن و تێکەڵاوی شۆڕشی درێژخایەنیان بکەن، لەشکریای لێپێکبهێنن و لە شاخانەوە شارەکانیان پێ ڕزگار بکەن. هەمیشە جووتیاران بەشی زۆری وردە بۆرژوایان لە وڵاتانی دواکەوتووی داگیرکراو و نیمچە دەرەبەگدا پێکهێناوە، بەڵام پاش شۆڕشی بۆرژوازی وەکو ئەرکێک لە ئەرکەکانی دیموکراسی (تەنانەت بۆرژوازیش) شار بایەخی زۆرتری دەدرێتێ و گوند کەمتر دەبێ. جووتیاران کەمتر دەبن و بەم کەمییەش باری ژیان و ژێوارییان بەرزتر دەبێ. بەتایبەتی لە وڵاتانەی نەوت و کەرستەی هەمەچەشنەی ژێرزەوییان زۆرە، دەمێکە

پێڕەوی لە ستراتیژی لاسایی‌کردنی ئەورووپا دەکەن‌و لەسەر حیسابی کشتوکاڵ‌و جووتیاران. لە ئەندازە بەدەر بایەخ بە شار دەدەن‌و دەیانەوێ بە قەڵەمباز بەبێ بایەخدان بە ئاستی ڕۆشنبیری‌و شارستانییەت، ئابووری کۆمەڵایەتی ئاستی وڵاتانیان بگەیەننە ئاستی پێشکەوتنی ئەورووپاو دەسەڵاتدارانیش وەکو سەرمایەدارانی ژێردەستە بچنە ریزی سەرمایەدارانی سەردەستە. هەڵبەتە ئەمە هەڵەیەکی کوشندەی ستراتیژی سەرمایەدارانی وڵاتانی ژێردەستەیە کە ئیمپریالیزم لە هەموو بارێکەوە قازانجی لێکردووە بەڵام ئەم شکستە هیچ لەوە ناگۆڕێ کە باری کۆمەڵایەتی جووتیاران گۆڕاوەو ژیانیان، ژمارەیان، ژینگەیان‌و هەڵوێستی چینایەتیشیان وەکو کۆن نەماوە.

ئەم چینە لە وڵاتانی وەکو عێراقدا ئێستا زیاتر بەستراونەتەوە بە پێوەندی سەرمایەداری‌و بازاڕی سەرمایەدارییەوە ئەگەرچی بە حوکمی سیاسی شۆڤینیستانەی ڕژێمەکانی وەکو بەعس هەستی نەتەوایەتی ئەم چینە بەهێزو پاشماوەی عەشیرەتگەریش‌و کێشەی چینایەتیشیان ماوە. هەڵبەتە هەشن زەوییان نییەو هەژارن. وێڕای هەموو ئەمانە، جووتیاران وەکو چین موڵکداری زەوین‌و بەشێکی کەمیان نەبێ. زەویش بۆ جووتیاران مەسەلەی هەرە گرنگە، بۆیە دەبینین لەم شۆڕشەدا سەرەڕای سەختترین سایەتی شۆڤینیستانە، جووتیاران کەمتر چارەنووسیان بەستەوە بە شۆڕشی درێژخایەن‌و کەمتریش لە شارنشینە ڕۆشنبیرەکان چەکیان کردە شان. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە حیزبە وردە بۆرژواکانی کوردستان ئەگەرچی لە شۆڕشی ئەیلول لە ڕووی ڕێبازو سیاسەتەوە خۆیان باشترو جۆراوجۆرتر ڕێکخستووە، شەڕی ئازایانەترو گەورەتریشیان کردووە، چەندین لایەن‌و هەرلایەکیشیان جۆرێ بەرنامەی دارشتووەو بەشێوەی جۆراوجۆریش ویستویانە جووتیاران ڕابکێشنە ناو هێزەکانیان، کەچی بۆیان نەچووەسەر.

ئەگەر ڕەفتارو کرداری خراپی هەموو لایەنەکانی لێدەرهاوێین کە بە نۆرەی خۆیان دڵو دەروونی جووتیارانیان سارد دەکردەوە، ئەگەر ئەوەش لەیاد نەبەین کەوا سەرەنجامی سەرجەم شکستەکانی بزووتنەوەی کوردستان، جووتیاران‌و خەڵکێکی زۆری شارنشینیش لە شۆڕشی چەکداری‌و سەرکردایەتی بۆرژوازی نائومێدن. هەروەها کارایی نالەباری جەنگی ناوخۆش کەم نەبووە بەڵام وێڕای لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییانە، دەبێ زانستییانە پێ لەسەر بنەڕەتی کێشەکە دابگیرێ، ئەویش کە بابەتی ئابووری‌و پێوەندی کۆمەڵایەتی‌و بەرژەوەندی چینایەتی جووتیارانە. باقی

دیاردەکان کە پێشتر ئاماژەمان کرد، لەم پایە ئابوورییەوە چەکەرەیان کردووە. ئەم ڕاستی ئابووری‌و چینایەتییەش هەردەم لەمێژووی جووتیارانی تەواوی میللەتانی جیهاندا، ڕۆڵی چارەنووس‌سازی هەبووە لە ڕاپەڕین‌و شۆڕش کردنی جووتیاراندا یان لە دووڕە پەرێزی‌و خۆپەرستیدا.

چین‌و ڤیێتنام، کۆریاو کەمبۆج، لاوس‌و جەزائیر، کوباو نیکاراگوا...تاد. هەریەکە لەو وڵاتانە شۆڕشیان تێدا بەرپا کراوەو سەرەڕای جیاوازی ڕێبازی ڕزگاریان. بەڵام هەموویان لە چارەسەرکردنی کێشەی جووتیاران دژی دەرەبەگەکان، هاوشانی ئەرکە نیشتمانییەکانی دیکە، بگرە زیاتریش درێغیان نەکردووە، زیاتر لەوەش لە چین‌و ڤیێتنامدا پێش خەباتی نیشتمانی‌و سیاسی، خەباتکردن دژی ستەمی دەرەبەگایەتی‌و ڕزگارکردنی جووتیارانیان زووتر تەقاندۆتەوە. چونکە باری کۆمەڵایەتی‌و قۆناغی خەباتەکەیان وایخواستووە هەر ئەم ڕاستییەش زۆرینەی جووتیارانی کردە جەنگاوەری لەشکری شۆڕشی درێژخایەنی ئەو وڵاتانەو سەرکەوتن، کەچی دەشگوترا کرێکاران پێشرەون.

لە کۆریاش هەروەها بەدرێژایی ژێردەستەیی ژاپۆن، ڕژێم دەرەبەگی دەباراست‌و هیچ گۆڕانکارییەک بەسەر پێوەندی بەرهەمهێنانی جووتیاراندا نەهات. پاش جەنگی دووەمی جیهان‌و دەستتێوەردانی ئەمریکاو سەپاندنی ڕژێمێکی کۆنەپەرستی وابەستەی پشتیوانی‌لێکەری دەرەبەگایەتی، پێش هەڵگیرساندنی جەنگی بەرەنگاری نیشتمانی، جووتیاران دژی دەرەبەگەکان ڕاپەڕین‌و خۆ بەخۆ لە ۷۰٪ی بەرهەمیان بۆخۆیان هەڵگرت. هەر ئەمەش لە ئاکامدا هۆیەکی هەرە گرنگی سەرکەوتنی گەلی کۆریا بوو کەچی هەمان هۆی جووتیاران چەندین شۆڕشیان ژێرخست، چونکە باری چینایەتی دژایەتی دەرەبەگیان بەسەرچوو بوو.

## ٤/٤- بۆلیڤیا: گۆڕی گیڤارا

گیڤارا، پاش ئەوەی وەکو دووەمین ڕێبەری شۆڕشی کوبا، گەورەترین ڕۆڵی شۆڕشگێڕانەی گێڕا بەپێی ئەو ڕێبازەی خۆی باوەڕی پێی هەبوو پایەی وەزیری‌و خۆشی ژیانی پاش سەرکەوتنی شۆڕش لە کوبادا ساڵی ١٩٦٥ لەپێناوی سەرخستنی ڕێبازەکەیدا بەجێ‌هێشت‌و ملی ڕێی هات‌و نەهاتی سەرخستنی شۆڕشی لە وڵاتێکی دیکەی ئەمریکای لاتین‌دا دژی وڵاتە یەکگرتووەکانی گرتەبەر. هەڵبەتە گیڤارا باوەڕی وابوو ئەو ڕێبازەی شۆڕشی کوبای گەیاندە ئاکامی

سەرکەوتن، سەرکەوتنی دیکەش لە وڵاتانی دیکەی مانەندی کوبا بەدیدەهێنێ.لە گوتارێکیدا پاش سەرکەوتنی شۆڕشی کوبا، گیڤارا لە بەشێکیدا باوەڕی بە ڕێبازی پارتیزانی لە قارەی ئەمریکادا وادەردەبڕێ: «ئێمە لەو باوەڕەداین کە شۆڕشی کوبا سێ پایەی گرنگی بەخشیوەتە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی دژی ئێستای قارەی ئەمریکا. یەکەم: ئەوەیە کە هێزی خەڵک دەتوانن لە جەنگدا دژی سپا سەرکەون. دووەم: پێویست نییە هەمیشە چاوەڕێبین تەواوی مەرجەکانی شۆڕشگێڕیتی سازبێ، خودی ڕاپەڕینە ئەم مەرجانە دێنێتەدی. سێیەم: لەوێشە دواکەوتوانەی قارەی ئەمریکا گۆڕەپانی هەوڵدان بۆ خەباتی چەکدارانە بەشێوەیەکی سەرەکی دەبێ لە گوندەکاندا بێ ‹١٠›.

لەدوا نامەشیدا کە پێش ڕۆیشتنی بۆ بۆلیڤیا بۆ کاسترۆی بەجێهێشتووە، دەڵێ: «میللەتانی دیکەی جیهان کۆششی کەم بایەخی منیان پێویستە. من دەزانم ئەم خواستەی کەوا تۆ بەهۆی لێپرسراویت بەناونیشانی سەرۆکی دەوڵەتی کوبا، توانای بەدیهێنانیت نییە ڕاپەڕێنەو لەو ڕۆژەوە زمانی جوداییمان گەیشتووە ‹١١›.

کەواتە گیڤارا، هەم وەکو تیۆری چەکداری پارتیزانی هەم وەکو دژی نالەباری قارەی ئەمریکاو هەمیش وەکو ئەزموونو لێهاتوویی ڕێبەرایەتی خۆی لەخۆیو ڕێبازەکەی دڵنیا بووە، ئەوسا کوبای بەرەو بەرپاکردنی شۆڕش لە بۆلیڤیادا جێهێشتووە.

گەیشتۆتە بۆلیڤیا، شۆڕشی هەڵگیرساندووە، چەندین مەفرەزەی چەکداری پێکەوە ناوە، ئوردووی پێشمەرگایەتی دروست کردووەو مەشقی داون. هەروەها چەندین شەڕی سەرکەوتوانەشی ئەنجامداوە. بەڵام بەرە بەرە ڕاستییە کۆمەڵایەتییەکان پێیان سەلماندووە شۆڕش بە لاسایی کردن بەرپا ناکرێو تیۆری پارتیزانیش وا بە ئاسانیو ئاسایی مەرجە کۆمەڵایەتییەکانی سەرکەوتن ناهێنێتەدی. یەکێک لەو مەرجانەی پێویستە بۆ سەرکەوتن؛ (مەبەستی ئەم بەشەی باسەکەشە) کێشەی جووتیارانە، دەبا سەرنج بدەین ئەو ڕێبەرە لەخۆ دڵنیایە لەناو گەرمەی

---

‹١٠› ارنستو چەگوارا در انقلاب (با دو مقاله چاپ نشده) انتشارات مروارید. ترجمه م.أ.رهجو،ص:١٨.

‹١١› روبجى دوبرية، ثورة في الثورة، ترجمة الياس سحاب، الطبعة الاولى، يناير ١٩٦٨، منشورات دار الاداب، بيروت ص: ٢٤.

ڕووداوەکاندا لەسەر جووتیاران گەیشتۆتە چ ئەنجامێک: «هێشتا بەدەستی بەشدارنەبوونی جووتیارانەوە دەناڵێن، ئەمە بازنەیەکی بۆشە، بۆ ئەوەی جووتیار وا لێبکەین پابەندبن دەبێ بەردەوام کارەکانمان لە چۆڵەوانیدا بکەین، بەڵام ڕاپەڕاندنی ئەمەش پیاوی زۆری دەوێ ـ ڕووداوەکانی حوزەیران». هەروەها لەسەر هەمان بابەت دەڕوا: «ئێمە هەمیشە هەست بە نەهاتنی جووتیاران بۆ ڕیزەکانمان دەکەین سەرەڕای هەندێ نیشانەی هاندەر کە شێوازی پێشوازی کردنمان لەلایەن هەندێ لە جووتیرە پیرە ناسراوەکانەوە دەیسەلمێنێ. ـ تەمموزی ١٩٦٧».‹١٢›.

ئەو جووتیارە پیرە ناسراوانە نەک پێشوازی بگرە بە خۆیانو کوڕەو کوڕەزاکانیشیانەوە، چووشبانە ڕیزی مەفرەزەکەی گیڤاراو گیڤارستەکانەوە. (بورە)کەیان (نەک شۆڕشەکە) سەرنەدەکەوت. چونکە شۆڕش بزووتنەوەی بەرینی شۆڕشگێڕانەی جووتیارانی دژی دەرەبەگایەتی گەرەکە نەک پێشوازی پیرە ناسراوەکانە یان تەنانەت سۆزی چەندین عەشیرەتیش!!

ئەوەبوو (بورە)کەی بۆلیڤیا بەداخەوە بە ڕێبەرایەتی گیڤاراش ژێرکەوتو خۆیشی شەهید کرا، پاشان لێکۆڵەران دەریان خست کەوا: وێڕای ژێردەستەیی بۆلیڤیاو ئەو ستەمە سیاسیو نیشتمانییەی لەلایەن ئەمریکای ئیمپریالیستییەوە لەسەریانەو سەرەڕای چەوسانەوەی چینایەتی دژوار دژی کرێکارانو زەحمەتکێشان بەڵام لەو ئەوەی دۆخی شۆڕشگێڕانە لە شارەکانی بۆلیڤیادا چەشنی کوبا لە ڕووی بابەتییەوە نەخەملی بوو، بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەیان نەکەوتبووە سەر ڕاستە ڕێی شۆڕشو لەبەرئەوەی لەناو جووتیارانیشدا تازەگی، پاش ٢٠.. ساڵ خوێنمژینی دەرەبەگایەتی ڕیفۆرمی زەوی بۆ جووتیاران بەدیهێندرا بوو، ئەمەش دوور نییە وەکو نەخشەی شۆڕشی چەواشە لە ترسی دووبات نەبوونەوەی ئەزموونی کوبا بەدی نەهێندرابێ، بۆیە جووتیاران ڕانەپەڕینو نەچوونە ڕیزی (بورە)کانەوە. کە هەڵبەتە مەفرەزەکانی گیڤارا دووریش بوون لە زوڵمو زۆرلێکردنی جووتیاران (وەکو کوردستان) بەڵکو ئەرپەڕی ڕێزیان لێگرتوونو بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوانیشەوە سوپا ئازاریان نەدات بنکەکانیشیان لە گوندەکان دوور خستۆتەوە. بۆیە ناتواندرێ هیچ جۆرە کاروکردارێکی خراپ لەو (بورە)دا بکرێتە هۆی شکستیان، جگە لەو هۆیە کۆمەڵایەتیو سیاسیانەی باسمان کردن ئەوانەش پێوەندیان بەو گۆڕانکاریانەوە هەیە

---

‹١٢› هەمان سەرچاوەی پێشوو.

که له شستەکان بە دواوە ئیمپریالیزم بەپێی نەخشەی نوێی ئیمپریالیستی هەم بۆ پەرەپێدانی بازاڕی خۆی‌و هەم بۆ ڕێگرتن له بووژاندنەوەی شۆڕش، بەدیهێناون زۆرتریش گۆڕانکارییەکان دوو چینی گرتەوە: بۆرژوای نیشتمانی‌و جووتیاران.

ئەم گۆڕانکاریانەش بە دوو شێوە وردە بۆرژوا دەیانکاتە پشتیوانی نوێی خۆی بۆ دژایەتی کردنی کرێکاران‌و مارکسییەکان:

١- لەسێبەری رژێمە سەرمایەدارییە دەوڵەتییە هێشتا هەڵنەگەڕاوەکان بۆ فاشیەت که لەژێر فشاری ڕووداوەکاندا هەتا ڕادەیەک ریفراندۆمی سەرمایەداریان دەسەلێنن‌و ئەم چینە هەوڵیانە جووتیاران بکەنە هاوپەیمانی خۆیان دژی کرێکاران له خەباتی دیموکراسیداو لەم پێناوەشدا درێغی ناکەن هەتا دژخەکەش وابێ بۆیان دەچێتەسەر، چونکە جووتیاران‌و وردە بۆرژوای شارەکان، هاوبەرژەوەندی ئەم قۆناغەن.

٢- لە بەرامبەر رژێمە فاشییەکانی مانەندی عێراقیش بە حوکمی ئەوەی جووتیاران کەمتر دێنە ریزی شۆڕشی درێژخایەنەوە، وردە بۆرژوا زیاتر لەسەردەمی کۆنی بۆرژوای کۆنە نیشتمانی هەوڵدەدەن له شۆڕشی میللی یان له تەواوکردنی بە ڕواڵەتی ئەرکەکانی شۆڕشی دیمکراسیدا، پێشەنگ داگیر بکات، ئەگەر بە زەبری فاشیانەش بێت هەرکاتێکیش هەست بە مەترسی کرێکارانی شۆڕشگێڕ بکات، بەرهەڵستی توندیان دەکات‌و هەنگێنێ سەرکوت کرنی دیموکراسی وەکو سەربڕینی مریشک وایە لایان.

لەهەموو حاڵەتێکیشدا لێکۆڵینەوەی باری کۆمەلایەتی جوتیاران‌و هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی چینایەتییان هەروەها ڕادەی پێشکەوتن‌و باری سایکۆلۆژییان، ئایین‌و مەزهەبە جۆراوجۆرەکانیان، داب‌و نەریت‌و پێوەندی خزمایەتی‌و خێڵەکیان. زەوییان، ئاویان، داهات‌و بەرهەم‌و هەناردەیان بە تایبەتی لەم سەردەمەدا کەوا پیشەسازی پێشکەوتووەو میکانیزمەکردنی گوندو کێڵگەکان پەرەیان دراوەتی‌و دەدرێتی زۆر گرنگە.

## ٥- شێواندنی شۆڕش

زەمینەی چەکەرەکردنو تەشەنە سەندنی ئایدیۆلۆژی ڕیڤیژینیزم دەگەڕێتەوە بۆ
باری ئابوری پاش شکستی کۆمۆنەی پاریس (٢٨ی ئاداری ١٨٧١-٢١-٢٨
ئایاری هەمان‌ساڵ) وەکو یەکەمین ئەزموونی بەزێندراوی کرێکارانو سۆشیالیزم،
کە ئەویش هەر بلانکییەکان (بشێوێنەکان -فەوزەوی) بەزۆر لێی بەرپرسیارن
چونکە: لەکاتی خۆیدا پڕیان نەدایە شۆڕش. کە پڕیشیان‌دایە، قۆناغی دیموکراسی‌و
سۆسیالیزمیان تێکەڵاوکرد وەکو واشیان کرد، پاش سەرکەوتن لە پاریسدا هەڵیان
نەکوتایە سەر دوژمنانی کرێکاران کە فرسای‌دا خۆیان بۆ هەلی لەبار لە مەڵاس
دابوون. هەتا هەلەکە بۆ ئەوان هەڵکەوتو هەڵیان کوتایەسەر کرێکارانی کۆمۆنەو
نقوومی خوێنی هەزاران کرێکارانیان کرد.

ئەم شکستە بۆ کرێکاران زیانێکی گەورەو بۆ بۆرژوازییەکان قازانێکی
گەورەتری هەبوو. زیانەکەی بۆ کرێکاران لەو نائومێدییەدا بوو کە پاش شکستەکە
ڕۆدەچووە هەناوی هەندێ لە پەیڕەوانیان، قازانجەکەیشی بۆ بۆرژواکان لەو
گەشبینییەدا بوو کە لەو ئاستەنگەیاندا، لە شکاندنی کۆمۆنەدا هێنایانەدی، ئەمەش
لەخۆ دڵنیا بوونی لەناودا زیاتر چەسپاند. زیاتر لەوەش ئەو سەرکەوتنەی
بۆرژواکانو ژێرکەوتنەی کرێکاران، ڕێبازی ڕیفۆرمیستی لەناو بزووتنەوەی
کرێکارانی فەرەنساو ئەڵمانیاو ئینگلتەرادا سەرهەڵداو هەوڵوێستی چینایەتییانی
خامۆش‌و هەستی شۆڕشگێڕانەی فەرامۆش کردن. زەمینەی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی ئەم
بیروڕایەش، زیاتر لەسەر ئەو بنەمایەی ئۆروپاوە چەکەرەی کردو چەسپا کە: ئۆروپا

پاش جەنگی (روسیا-ئەڵمانیا ۱۸۷۰-۱۸۷۱) کە بە ڕاپەڕینی گشتیو گەورەی پاریس کۆتایی پێهات ماوەی پشوویەکی بیستساڵەی باشی بەخۆیەوە دی. لەوماوەیەشدا دەوڵەتانی کۆلۆنیالی سودو سوویەکی زۆریان لە کۆلۆنەکان پاشەکەوت خست. ئەمەش کاری کردەسەر ڕەوتی ئابوریو کۆمەڵایەتیو سیاسیش. ئیدی لێرەوە تیزی کۆششی ریفۆرمیستی بەرەو سۆشیالیزم داڕێژرا.

ئەدوارد برنشتاین ئەودەمە پاش جۆرج فۆلمار کە لە ساڵی ۱۸۹۱وە سەرەتایەکی ئەو تیزەی دەرخست، لەساڵی ۱۸۹۷-۱۸۹۸ وەکو بەرجەستەترین نووسەرو تیۆریسێنی ریڤیژێنیزم دابەزیە مەیدانەی مشتومڕو نووسین لەسەر مارکسیزمو شۆڕشو سۆشیالیزمی زانستی. بەمەدا کەوتە دژایەتی کردنی بنچینە شۆڕشگێڕیەکانی مارکسیزم بەتایبەتی هەوڵیدا بیسەلمێنێ گوایە:

۱- سەرمایەداری لەناوخۆدا سەرەنجامی ناکۆکیەکانی لەناوناچێو نابوود نابێ، بەمەش ماتریالیزمی مێژوویی ڕەتکردەوەو تیۆری خەباتی چینایەتیشی بەتاڵ کردەوە.

۲- شۆڕشی کۆمەڵایەتی کرێکارانی وەکو تاقە ڕێبازی دەستەبەری سەرکەوتن بەسەر سەرمایەداراندا بەربەرچدایەوە.

۳- سۆشیالیزمیشی لەڕێی ریفۆرمی کۆمەڵایەتیەوە وەکو: پەرەسەندنی کۆمەڵە هەرەوەرزییەکانو سندیکاکانو پەرەسەندنی شێنەیی دیموکراسی سیاسی...تاد. دەهێنادی!

کورتییەکەی:

حیزبی شۆڕشگێڕی کرێکارانی، لە حیزبی شۆڕشی کۆمەڵایەتییەوە، بۆ حیزبی ریفۆرمی کۆمەڵایەتی گۆڕیو مارکسیزمی لە ڕێبازی شۆڕشگێڕانەوە هەڵدەگێڕا بۆ ڕێبازی ناشۆڕشگێڕ. شۆڕشی خستە مۆزەخانەی مێژوو، سەرمایەدارانی هەتا هەتایە کردە پەیکەری ژیانو سۆشیالیزمی زانستی پێچایەوە.

ئەو بیروڕایانە لەلایەن کاوتسکییەوە کەمە کەمە دەپارێزراو دەسەپا، هەتا پاش برنشتاین بە تەواوەتی کاوتسکی بووە میراتگری بێ پەردەو پەروای. ئیدی ئەو ڕێبازە تەشەنەی تەواوی سەندەە ناو ئینتەرناسیۆنالیزمی دووەمو پاش مەرگی ئینگلسو پێش جەنگی یەکەمی جیهان، بالادەست بوو، لەو دەورووبەرەدا مەترسی بەرپاکردنی جەنگی ئیمپریالیستییانە کەوتە ئارا. جەنگیش هەل بوو کرێکاران

قەیرانەکانی سەرمایەداران بۆ پەرپاکردنی شۆڕش بقۆزنەوە. جەنگ کەهەڵگیرسا، باشترین هەل هەڵکەوت حیزبە سۆسیال دیموکراتەکان بتوانن بڕیارەکانی کۆنگرەی (شتوتگارت ۱۹۰۷) ئینتەرناسیونالیزم لە دژایەتی‌کردنی هەڵگیرسێنەرانی جەنگە ناڕەواکەو خۆشکردنی زەمینەی هەڵگیرساندنی شۆڕشی کۆمەڵایەتی بەتاڵ بکەنەوە.

لە ٤ی ئابی ۱۹۱٤دا، بە بڕیاری حیزبی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانیا، زیات لە سەد ئەندامی پەرلەمانیان (رایستاخ) دەنگیان بۆ بودجەی جەنگ‌دا. حیزبی ناوبراو بەم کارەی لەهەموو حیزبێکی سوسیالی دیموکراتی دیکە زیاتر کاری کردە سەر سۆسیالیستەکان‌و کرێکاران. چونکە بەدڵی گەورەی ئینتەرناسیۆنالیزمی دووەدەژمێردراو حیزبە سۆسیالیستەکانی ئەورووپا وەکو نموونەی دووربنمای خەباتیان تەماشایان دەکرد، هەربۆیە پاش ئەمان، سۆسیال دیموکراتەکانی فەرەنساو ئینگلتەرەش هەماش هەڵوێستیان وەرگرت.

سەرەتا کە هەواڵەکە گەیشتە لینین، پێی‌وابوو پروپاگەندەی هەڵبەستراوی پۆلیسی ئەڵمانیایە هەتا بۆی دەرکەوت ڕاستەو لێیان ڕاست بویەوە، هەروەها (رۆزا لۆکسمبورگ و لیبیکنیختیش) هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەیان دژی ئەو ڕێبازە ڕیڤیژینسییە وەرگرت. بەڵام ئەفسوس هیچی ئەوانە نەیانتوانی گرنگترین ڕاپەڕینی کرێکارانی ئەڵمانیا لە ناسکترین قۆناخی خەباتی کرێکارانی جیهاندا بگەیەننە سەرکەوتن، لەکاتێکدا شۆڕشی ئۆکتۆبەر پێویستی بەو پشتیوانیە هەبوو هەتا لە قەتیسی قەوارەی تاکە وڵات دەربچێ‌و شۆڕشی سۆسیالیستی قۆڵایی جیهانی بدۆزێتەوە وەکو شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەرەو سەرکەوتنی بەرن. مەترسی ڕیڤیژینیزم ئەوسا لەهەموو کاتێ زیاتر لەسەر پاشەڕۆژی شۆڕشی کرێکاران‌و گەلان دەرکەوت. بەوشێوەیە ڕیڤیژینیستەکان بوونە مایەی لەبارپردنی هەڵکەوتوترین دۆخی شۆڕش شۆڕش‌و ئەمەش لە مێژووی کرێکاراندا ژەهراویترین پوازی بۆرژوا بوو چەقێندرایە جەستەی بزووتنەوەی چەوساوەکان. لەوساوە ڕەوتی مێژوو لە گرێژنە دەرکراو هەتا ئێستاش نەخراوەتە سەرباری ئاسایی خۆی.

بەوشێوەیە، ڕیڤیژینیستەکان توانییان توندڕەوایەتی بلانکیەکان لە تێکەڵاوکردنی ئەرکەکانی دیموکراسی‌و شۆڕشی سۆسیالیستیداو لە یەکەمین شکستی کرێکاراندا بۆ بەدیهێنانی خواستە دیموکراتی‌و ریفۆرمیستیەکان، بقۆزنەوە. ئەگەر وانەبا، ئەگەر کرێکاران لە چۆنیەتی بەدیهێنانی دیموکراسیدا بۆ زەمینە خۆشکردنی باشتری سۆسیالیزم بە گەرمی تێکۆشابان، ڕەوتی ژیان لەو

زەمانو زەمینەیەدا بەچەشنێکی دیکە دەگەیشتە دۆخی ئێستامان.

لە شۆڕشی شوباتی ١٩١٧ی ڕوسیادا، کرێکارانو زەحمەتکێشان توانیان بیسەلمێنن کەوا لەسەرخستنی شۆڕشی دیموکراسیدا لەکاتی لاوازی بۆرژوادا، ڕۆڵێکی مێژوویان هەیە کە شۆڕشی ئوکتۆبەریش سەرکەوت دەبسان دەبوو ئەرکە دیموکراسیەکان بە ئەزموون لێوەرگرتنی کۆمۆنەی پاریس جێبەجێ کرابان، بەلاَم بەپێچەوانەوە دەستبەجێ دوای سەرخستنی ئوکتۆبەر یەکسەرە سەپاندنی سۆسیالیزم گیراوەتەبەر، جیاوازی ئوکتۆبەرو کۆمۆنەی پاریس لەوەدایە کەوا کۆمۆنە توخنی ئەرکە دیموکراسیەکان، تەنانەت توخنی دەوڵەتیش نەکەوتووە، بەلاَم بۆلشەویکەکان بەناوی دەوڵەتی کۆماری دیموکراسیەوە داهەزینە مەیدان، پاشان پەلەیان لەسەپاندنی سۆسیالیزم‌دا کرد، هەڵبەتە بوونی لینینو بۆلشەویکەکانو بەرزی ئاستی هۆشیاری چینایەتیو سیاسی ئەزمونی ئوکتۆبەری پاراستو چەسپاند، بەلاَم لەدوا ئاکام‌دا مێژوو باجی ڕاستیەکانی سەندەوەو ئاستەنگەکان کە لە سایەی دەسەلاَتی کرێکاراندا نارددرانەوە قووڵ بوونو تەقینەوە. ئەگەرچی لینین لەدوا سالاَنی ژیانیدا دەرکی بە مەترسی زوو سەپاندنی سۆسیالیزم کردو کەوتە هەوڵێکی گەرمیش بۆ پارسەنگ‌دانەوەی بە بایەخ پێدانەوەی دیموکراسی، بەلاَم مەرگ مۆڵەتی نەدا. ئەو مەرگە ناوەختە مەیدانەکەی ئاوالَە کرد دڕندەیەکی وەکو ستالین بیێتە جێنشینی لینین، ئیدی لەوساوە، پێش ئەوەی هەڵەکانی تێکەلاَوکردنی ئەرکەکانی دیموکراسیو سۆسیالیزم لێکجوێ بکەینەوە، ڕەوتی مێژوو لە گرێژنە دەرچوو.

## ١/٥- دیکتاتۆریەتی ستالینی

ستالین ١٨٧٩-١٩٥٣ (٣٠) ساڵ ڕێبەری حیزبی کۆمۆنیستی شورەوی بووە. لەناو حیزبی سوسیال دیموکراتو پاشانیش لە پەرەپێدانیدا بۆ حیزبی کۆمۆنیست لە تێکۆشەرە سەر سەختەکانی ڕوخاندنی ڕژێمی تزار دەناسرا. لەوپێناوەش هەتا سەرکەوتنی شۆڕشی شوباتی بۆرژواییو گۆڕینی بە شۆڕشی ئوکتوبەری ١٩١٧ کادرو ڕێبەرێکی کارامەی ناوداری خەبات بووە. بە ئازایەتیو لێهاتوویی خۆی متمانەی ڕێبەرایەتی حیزبی مسۆگەر کردووەو کراوەتە ئەندامی سەرکردایەتی حیزب لەسەردەمی خەباتی ژێرزەمینی‌دا، واتە خەباتی نهێنیو ئەشاردێ. هەڵبەتە ناتواندرێ نکوڵی لەوە بکرێ بەبێ توانای ڕێکخراوەییو سیاسیو پراکتیکی ئەو متمانەیەی نەدراوەتێ. بەلاَم پێویستە ئەوەش بزانین خەڵکانی سیاسیو تێکۆشەر

وەکو لەسەردەمی خەباتی ئاشکراو راشکاودا، تواناییان، ئاستیان، رەوشتیان، نەفسیەتیان، پەیوەندیو پێوەیان دەردەکەوێ. لەسەردەمی خەباتی ژێرزەمینیو نهێنیدا هەرگیز ئەو راستییانە وەکو سەردەمی ئاشکرای خەبات دەرناکەون، بگرە زۆرجار، زۆرکەس هەن، لەکاتی خەباتی نهێنی حیزبو حیزبایەتیدا لەکۆڕو کۆبوونەوەدا لەمشتومڕو رادەربڕیندا، پێچەوانەی ماهیەتی خۆی دەردەخات، بەتایبەتی ئەوکەسانەی لە ماهیەتدا هەلپەرستو خۆپەرستو هەڵپەهەڵپەکەری پێناوی پلەو پایەن. زۆرجاریش ماهیەتی مرۆڤ بەتایبەتی مرۆڤی بەتوانا، نووسەر، زیرەکو بەدەسەلات، درەنگتر لە کەسانی کەم تواناو ئاستنزم زەق دەبێ. چونکە ئەو تواناو زیرەکییەی لەپێناوی بەدیهێنانی مەبەستەکانی، ویستەکانی، ئارەزووەکانی، بۆ شاردنەوەی ماهیەتی راستەقینەی خۆی هەتا ماوەیەکی زۆر، دەشارێتەوەو دەتوانێ کتومت کەسایەتییەکی پێچەوانەی کەسایەتی خۆی بنوێنێ. ئێمە پێمانوایەلەبەرچاوگرتنی تەواوی ئەو راستییانە بۆ ستالینو کەسانی وەکو ستالین لەمێژووی کۆنو نوێدا، لەناو تەواوی میللەتاندا کارێکی هەرە پێویستە بۆ هەڵسەنگاندنیان. ئەگەر مرۆ بیەوێ خاڵی وەرچەرخانی ژیانی ستالینو دەرکەوتنی ماهیەتی راستەقینەی ئەو پیاوە بزانێ، دەبێ بگەڕێتەوە بۆ رۆژانی پێش مەرگو پاش مەرگی لینین ئا لەوێوە دەتواندرێ قامک بخرێتەسەر دەرونی دردۆنگی ساڵەهای ستالین.

ئاشکرایە لینین پێش مەرگی رەخنەی زۆری لە ستالین لەسەر ئاکارو رەفتارەکانی لەناو حیزبدا هەبووە. پێش مەرگیشی لە وەسیەتنامەکەیدا خوازیاری هەڵنەبژاردنی بۆ رێبەری حیزب بووە. تەنانەت ئەمەی بۆ پاشەڕۆژ هێندە لاگرنگ بووە، لەگیانەلاشدا کە پزیشکەکان لێیان قەدەغە کردووە بنووسێو بخوێنێتەوە، ئەو گوێی نەداوەتێو قەناعەتی خۆی لەسەر نووسین (ستالینو ترۆتسکی بەتایبەتی). بەڵام ستالین پاش مەرگی لینین، دەستبەجێ وەسیەتنامەکەی ژێرپێی خۆپەرستیناو بەهەر نرخێک بووە دەسەلاتی خۆی بۆ مسۆگەرکردنی رێبەری حیزب و جێنشینی لینین بەکارهێناو سەریش کەوت. رەنگەپێش ئەمە، لەساڵانی رابردوودا رووداوی گەورەو گچکەی زۆر پێچەوانەی خواستی ستالین رووبەرووی بووبێو بەناچاری دانی بەخۆیدا گرتبێ، پشووی درێژ بووبێ، بەڵام مەرگی ناوەختی لینینو زۆران لەپێناوی دەسەلاتدا لەو دووڕیانە مێژووییەدا، بۆ یەکێکی وەکو ستالین کە کەمتواناتر بووە لە خەڵکانی وەکو ترۆتسکیو بوخارینو هەرئەوانیش لەبەرامبەریدا دەستنیشان

کراوی ڕێبەرایەتی بوون، زانیویشیەتی ئەو هەلەی لەکیس بچی تازە بە زوویی هەلی وای بۆ هەلناکەوێتەوە یان دوور نیبە تووشی شکانی نالەباریش نەبی. بۆیە چاری لەبەردەمدا نەماوە دەرخستنی ماهیەتی خۆی نەبی کە سالەهای سال لە خەباتی نهێنی و پەنامەکی داو لەبەرامبەر لینین دا شاردوویەتیەوە. ئیدی ستالین، ستالینیەتی لەسەر ئەو زەمینە کۆمەلایەتی و سیاسییەی لەناو شورەوی و حیزبی کۆمۆنیستدا کە پاش مەرگی لینین، سەرئەنجامی باری دژواری ئابووری ولاتەکە رەخسابوون، پیادەکردو کەوتە ویزەی نەیارەکانی و جێبەجێ کردنی نەخشەکانی.
تێکرا نەخشەکانیشی لەسێ قۆناغدا جێبەجێ کرد :
- پێش جەنگی دووەمی جیهان.
- لەکاتی جەنگدا.
- پاش جەنگەکە.
لەپێش جەنگدا، بەبیانوی پاراستنی یەکەمین دەولەتی سۆسیالیستی و جێبەجێ کردنی سوسیالیزم لەیەک ولاتدا، ئۆپۆزیسیۆنە ڕاست و چەپەکانی پاکتاو کردوو بەپێی سەرژمێرێک لەسەری مالە، زیاتر لە نیومیلیۆن کادرو ئەندامی حیزبی سەرنگوون کردووەو (١٦) ئەندامی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی کوشتووە.
زیاتر لەسێ هەتا پێنج ملیۆن خەلکیشی کوشتووە، بەتایبەتی لەناو جووتیاراندا.
لەپێش جەنگدا، بەبیانوی پاراستنی یەکەمین دەولەتی سوسیالیستی و پیادەکردنی سوسیالیزم لەیەک ولاتدا، بەرهەلستە ڕاست و چەپەکانی پاکتاو کردو دەیان هەزار کادرو ئەندامی سەرنگوون کردووەو (١٦) ئەندامی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی کوشتووە (لە کۆنگرەی حەڤدەهەمی حیزبدا سەرژمێری ئەندامانی حیزب بە (٢,٨,٩,٧٨٦) کەس سەرژمێردراوە لەحالێکدا لە کۆنگرەی هەژدەهەمدا سەرەرای وەرگرتنی (٤٠٠) هەزار ئەندامی نوێ لە حیزبدا سەرجەمی ئەندامانی حیزب و ناو نووسینی ئەندامان لە (٦٦٦ , ٤٧ , ٢) کەس تێنەپەڕیوە. ‹١٣›.واتە زیاتر لە . . . . ٧٥ ئەندامی حیزب کوژراوون و پاکتاوکراوون*

‹١٣› از لینین تا گورباتشف. ترجمە: نگارش محمود طلوعی،سازمان انتشارات هفته، چاپ اول ١٩٦٧،ص:٢٢٢.

* سەرنگوون کراونکی زۆری سەرەدەمی ستالین لە دەورانی خرۆشۆفدا دووبارە شایانی سیاسی و دلسۆزیان بۆگێردرایەوە. لە دەورانی گۆرباچۆفیشدا بایەخی ڕاستەقینەی (کامینیف، زینۆڤیف، بوخارین) گێردراوەتەوەو هی دیش لە توێژینەوەدایە.

پاش ئەوەی بەحیسابی خۆی ئۆپۆزیسیۆنەکانی لەناو حیزبدا پاکژ کردووە، بۆ ئەوەی دژایەتی دیموکراسی بۆ بچێتەسەرو خۆی بە شێلگیر لەسەر ڕێبازی کۆمۆنیزم نیشان بدات، ستالین لە کۆنگرەی پازدەهەمی حیزبدا (١٩٢٧) لە وتارێکدا پێشنیاری کردووە بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شورەوی خێراتر ڕووەو سەرخستنی کۆمۆنیزم بەرێ ببردرێ بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجەیشی، بایەخی زۆری بە پیشەسازی گەورەو میکانیزمەکردنی بێ‌ڕێ‌و جێی وڵات‌و سەپاندنی سۆسیالیزم لە بواری کشتوکاڵدا، داوە. بۆئەوەی مەبەستە چەواشەکانی بەتەواوی بۆ بچێتەسەر، لەهەمان کۆنگرەدا بەتێکڕای ئۆپۆزیسیۆن دەڵێ: «دوژمنی لینینزمن‌و هاوکاری ئیمپریالیزم دەکەن.»

دوای ئەوەی لە کۆنگرەکەدا مەبەستەکانی چۆتەسەر، ئینجا کەوتە سەپاندنی «سوسیالیزمی ستالینی!» لە گوندو لەناو جووتیارانەوە تێهەڵچوو. بەزۆرەملێ، بیست‌و پێنج ملیۆن خێزان جووتیاری لە (٢٥٠) هەزار کۆمەڵی کشتوکاڵی پەستاوت. ئەو جووتیارانەی بەمەش ڕازی نەبوون بە تاوانی ناپاکی قەلاچۆ کران... ژمارەشیان بەپێی دوا سەرژمێری بڵاوکراو لە شورەوی‌دا دەگاتە (٢٥-٣٠) ملیۆن قوربانی، واتە چوار بەقەدر نەتەوەی کورد لەوسەردەمەدا (کەمە...!) لەو هەلومەرجەدا ڕاستە ستالین ئینتەرناسیۆنالیزم‌و خەباتی ناوکۆیی ڕەت نەکردۆتەوە، بەڵام بەکردەوە گرنگترین سیاسەتی ستالین پەرەپێدانی ستالینیەت بووە لەناو شورەوی‌و دەرەوەی شورەویدا، چ لەڕووی ئابووری‌و پیشەسازییەوەو چ لەڕووی سیاسی‌و ئایدیۆلۆژییەوە. ئەوانەش پێشەکی لەناو شورەوی‌دا گیانی شۆڕشگێڕیەتی دامرکاندووە پاشان لە دەرەوەی شورەویدا تەوژمی شۆڕشی نیشتاندەوە.

لەناوخۆدا پێش ستالین هەتا ڕادەیەکی دیار ئازادی دابین دەکرا*. بەڵام ستالین: نەیارەکانی کوشت‌و گرت‌و سەرنگوون کرد. ئەوانە هەموو بویستری‌و نەویستری سەرەڕای داپۆشینیان لەلایەن حیزب‌و نووسەرانی ئەو سەردەمە، مارکسیزمی نابوود کرد، هیچ نەبێ هەتا دەرکەوتنی ڕاستییەکانی ستالینیەت. وتەیەکی بوخارین، شایەتییەکی ڕاستگۆیانەی ئەو ڕۆژگارە دژوارەیە کە لە ڕۆژانی کۆتایی ژیانی‌دا ئاڕاستەی هاوژینەکەی کردووە:

---

* تازە دەرکەوتووە کەوا لە زەمانی لینینیشدا هەندێ فشار بۆ سەر دیموکراسی هەبووە. تەنانەت بۆسەر کرێکارانیش.

---

وژیانم کۆتایی دێت، ئەوەتانێ سەرم لەژێر تەوری جەللاددا نەوی دەکەم، تەوری پرۆلیتاریاش نیە کە پێویستە بێبەزەیی بێ. لەبەرامبەر ئەم ئامێرە دۆزەخیەدا هەست بە بێتوانایەکی ڕەها دەکەم کە دەسەلاتێکی گەورەی لەڕێی شێوازێکی زۆرەوە هێناوەتەدی کە دزێوی بێ ئاپەروانە، بەپەرواوە هەڵدەبەستێ، ئەگەر هەڵەم لە شێوازەکانی بیناکردنی سوسیالیزمدا کردبێ هیوادارم حوکم لەسەردانم سەختتر نەبێ لەو حوکمەی ڤلادیمیر ئیلیچ دەری‌کرد. هەرەو یەک ئامانج دەرۆیشتینو ڕێبازەکەش نە نەخشێندرابوو، هەموو ڕۆژگارێک ڕەوشتی خۆی هەیە. لەوکاتەدا پراڤدا لاپەڕەی تەواوی بۆ مشتومڕ تەرخان دەکرد، هەمووانیش لەسەر باشترین ڕێو شێواز دەکەوتنە گفتوگۆ، ئاکۆک دەبوون دیسان کۆک دەبوونەوە. دیسان پێکەوە دەرۆیشتن. من بانگتان دەکەم. ئەی نەوەی نوێ سەرکردایەتی حیزب کە لە ئەرکە مێژوویەکانتان لەم شەپۆلە ترسناکەی تاوان کە حیزب دەشێوێنێو دەخنکێنێ، بتۆزێنەوە. هەموو ئەندامانی حیزب بانگێشە دەکەم.‹١٤›.

خۆزگە، بوخارینو کەسانی دیکەی وەکو وی خۆیان دەمانو مێشکو قەڵەمی خۆیان بەهەرزەخێک بێ، تاوانو لادانو بادانو ناپاکییەکانی ئەو سەردەمەیان بە هێمنی دەنووسیو بە هێوریش لە سەریشیان دەنووسرا، ئەوسا بەڵێ هەر ئەوسا ڕاستییەکان وەکو هەن دەزاندران، نەک ئێستا زیندوو لەبری مردووەکان ڕووداوەکان هەڵسەنگێنێ. بەڵێ... جگە لە بوخارینو چەندین ڕێبەری بەناوبانگی دیکەی شوورەوی، لە دەرەوەی شۆڕەویشدا لەسەر جیاوازی بیروڕا، ستالین لەناو کۆمنترندا (بلاتن) ڕێبەری بەناوبانگی سویسراو (گانتکی) ی پۆلۆنیاو هەروەها ی ئۆکراینای ڕۆژئاواو بلروسیاو ستونیاو لیتوانیا، چەندین سەرکردەی یۆگسلاڤیو بولگاریو هیندیو هەنگاریو ئێرانی... تاد. لەناوبرد.

کە مەترسی جەنگی نازییەکانیش کەوتە ئارا باشترین هەل بوو ستالین لەژێر پەردەی پاراستنی دەوڵەتی سوسیالیزم مانۆڕی سەمەرەو سەودای سیاسی لەسەر

‹١٤› جان اللنشتين. تاريخ الظاهرة الستالينية. ترجمة جوزيف سماحة ص: ١٢٠و١٢١.

حیسابی ئینتەرناسیۆنالیزم بکات. لەلایەکەوە هەموو جۆرە هەڵوێست دەربڕینێکی جیاوازی ناوخۆ بە تاوانێکی گەورە دەژمێردراو هەچ جۆرە سەربەخۆییەکی ئایدیۆلۆژی بە بیانوی تێکدانی بەرەی گەلان ڕەسوا دەکرا. ئەمە لەکاتێکدا دەکراو ڕاستییش وابوو کرابا ؛ە دژایەتی نازیزم بکرێو سەربەخۆیی ڕێکخراوەیش بپارێزرێ. کلکایەتی ڕەت بکرێ بەتایبەتی گلکایەتی دیکتاتۆرێک کە زەمانە هەڵیبڕیبوو، ئەو پایەی پێی لەسەر دادەگرت.

لە کۆنگرەکانی کاتی جەنگیش (تاران، یالتا، پۆتسدام) وەکو پێشتر ئاماژەمان کردوو، ستالین لەسەر حیسابی کرێکاران و گەلان بەشارەزووی نەخشەی جیهانی لەگەڵ سەرۆکی وڵاتە سەرمایەدارەکان دەکێشایەوە. تەنیا لەو شوێنانەی مەترسیان لەسەر سیاسەتەکانی ستالینییەت و سنووری قەڵەمڕەوی شورەوی هەبوو، ستالین پێی دادەگرت و بڕیاری لیبراوی دەدا وەکو: پۆلۆنیاو ئەڵمانیاو دەوڵەتانی دیکەی ئەوروپای ڕۆژهەڵات. لەو شوێنانەی ئەو مەترسیانەی لەئاردا نەبوون یان بیانزانیبایە مەترسیشیان هەبەو ناتوانێ ڕای خۆی بسەپێنێ بۆ ئەوەی مەترسیەکانی دیکەی لێ نەورووژێنن نەرم خۆی دەدا بەدەستەوە. هەرکە پۆلۆنیاو ئەڵمانیای وەکو دەیویست بۆ مسۆگەر کرا، بەئاسانی دەستی لە ئیتالیاو یۆنان و نەمسا هەڵگرت. لە ئێرانیشدا دوای سەرپێچی کردنێک کە بەڵێنی نەوت دەرهێنان لەلایەن (قوام السلطنه)وە درایە ستالین دەستبەجێ بە بیانوی گوێگرتن لە ئۆلتیماتیمی ئەمریکا لەشکری سووری کشاندەوەو پشتی کردە ئازەربایجان و کۆمارە تاقانەکەی کوردستان. ئەوانە جگەلەوەی پێش جەنگ نەک یارمەتی ڕاپەڕینی چەکدارانەی کوردستانی تورکیای دژی ئەتاتورکە فاشیەکان نەدا کە بە ئاشکرا مافی کوردیان پێشێل و کوردستانیان کاول و سەدان هەزاریان قەلاچۆ دەکرد، بەڵکو پارەو چەکیشیان دەدانێ (وەکو ئێستای شورەوی و عێراق).

تەنانەت داکۆکی لە شۆڕشی چینیش نەدەکردو کەمتر چارەنووسی حیزبی

کۆمۆنیستی چینی لامەبەست بوو کە ئەوسا خاوەن سەدان هەزار پێشمەرگەو چارەکێکی چینی بەرێ دەبرد. بۆیە بە ئاسانی رازی بوو رژێمی کۆنەپەرستی شانکایشیک وەکو ئەندامێکی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان هاوشانی ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنساو شورەوی، وەربگیرێ کە بێگومان ئەمە بۆ شۆڕشی چین هیچ نەبێ لەرووی سیاسیو دپلۆماسییەوە لەو کاتەدا زیانێکی کاریگەر بووە. دیارە بۆ پاش جەنگیش ستالین بە تەما نەبوو شۆڕشی چین سەربکەوێ بۆیە رازی بوو دوژمنەکەی بخرێتە ریزی دەوڵەتە زلهێزەکان.

لەکۆریاش‌دا: پێش بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهان بە پازدە ساڵ شۆڕش بە رێبەرایەتی (کیم‌ئیل‌سۆنگ) دژی ژاپۆن هەڵگیرسا بوو. لەکاتی جەنگیشدا کە ژاپۆنیش چووە پاڵ نازیو فاشییەکانی ئەڵمانیاو ئیتالیا هەلێکی گەورە بۆ گەلی کۆریا کە هەتا ئەوکاتە یەکپارچە بوون هەڵکەوت سەربکەوێ. هەڵبەتە ئامانجی وا بەدڵی ئیمپریالیستەکان نابێو پێشتر، ساڵی ١٩٤٣ لە کۆنگرەی قاهیرەدا (رۆزفلت، چێرچل، شانکایشیک) بەپێی خواستی خۆیان چارەنووسی کۆریایان نووسی بوو. ساڵی ١٩٤٥یش لە کۆنگرەی پۆتسدام‌دا ئەمریکاو شورەویو بەریتانیاو چین (پێش سەرکوتنی شۆڕشی چین) باسی چارەنووسی کۆریای پاش جەنگیان کردبوووەو لەوێدا بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا باسی دابەشکردنی کۆریا کراوەو شورەویش بێ راوێژ پێکردنی نوێنەری گەلی کۆریا مەمە رازی بوون. گوایە مەبەستەکەش ئەمە بووە کۆریا بەجۆرێک رێکبخرێ ئەمریکاو شورەوی پاش رێکەوتن لە جەنگدا بە کەمترین کێشە هێزەکانی ژاپۆن چەک بکەن. لەوەبەدوا کۆریای باکور (٩میلیۆن دانیشتوو ـ دواکەوتووی مەزرایی)و کۆریای باشوور (٢١ میلیۆن دانیشتوو-خاوەن پیشەسازی سەنگین) دروست بوون. دیارە شۆڕشگێرانی کوریا بەمە رازی نەبوونو زۆریشی نەبرد سیاسەتی ئەمریکا دەرکەوت، تەنیا لەچوار ساڵدا ١٩٤٦-١٩٥٠، راستەوخۆ (٢٥٠) هەزار شۆڕشگێری گەلی کۆریایان شەهید کرد، ژیان لە کۆریادا بوو بە دۆزەخی ژێر دەسەڵاتی ئەمریکاو کۆنەپەرستان. ئیدی گەلی کۆریا بەمە رازی نەبوونو درێژەیان بە شۆڕشدا. چین بەهەموو توانایەک بەهانایانەوە چوو و ستالینیش ناچار لەرووی چەکو پێویستی جەنگییەوە کەوتە یارمەتیدانی بێدرێغیان. واتە گەلی کۆریا بەو سیاسەتەی شورەویو دەوڵەتانی دیکە رازی با دەبوو سەرشۆڕی بۆ ئەمریکاو

کۆنەپەرستان هەڵبژێری، وەکو یۆنان‌و کوردستان‌و ئازەربایجان‌و ئیسپانیا.

جگە لەوانە، لە مەڵبەندەکانی دیکەی جیهانیشدا ڕەوتی ڕووداوەکان بەعەزرە زلهێزەکان تێنەپەڕی‌و ستالینیش بەو سیاسەتەی نەیتوانی پێش لە خەباتی کرێکاران‌و گەلان بگرێ وەکو:

١- گەلی فەلەستین‌و عەرەب دژی ئیسرائیل‌و بەریتانیا ١٩٤٨-١٩٤٩.
٢- گواتیمالا-هیندۆراس ١٩٥٤.
٣- ڤیێتنام-فەرەنسا ١٩٤٦-١٩٥٤.
٤- لاوس-فەرەنسا ١٩٤٦-١٩٥٤.
٥- ئیندۆنیزیا-هۆلاند ١٩٤٦-١٩٤٩.
٦- مالیزیا-ئینگلیز ١٩٤٨-١٩٥٧.
٧- کینیا-ئینگلیز ١٩٥٢-١٩٥٣.
٨- جەزائیر-فەرەنسا ١٩٥٤-١٩٦٢.
٩- فیلیپین ١٩٤٩١٩٥٤.
١٠- کۆلۆمبیا ١٩٥٣.
١١- کوردستان-عێراق ١٩٥٨-١٩٦١.

لەو ڕووداوانەدا شورەوی سەردەمی ستالین ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەدەبینی. شایانی باسە لێرەدا بگوترێ کەوا: لەودەمە ناسکەی خەباتی گەلی چین‌و کۆریاو گەلانی دیشدا (ماوتسیتۆنگ‌و کیمئیل‌سۆنگ) یان ستالینیان باش ناسیووەو لەترسی ئەوەی نەکا خراپتر بچی بەگژیاندا چاویان لە سیاسەتە سازشکارییەکانی‌و دیکتاتۆریەکەی پۆشیوە، یان ئەوەتانێ باشیان نەناسیووە. هەرکام لەوددوو بۆچوونانەش بێ، ئەگەر لەو هەلومەرجە ناسکەی پیایدا تێپەڕیوون جۆرێ لە بیانووی عەسکەری‌و سیاسی پاساوی ئەو بێدەنگییەیان بداتەوە، ئەوا پاش ڕزگاربوونی گەلی کۆریاو چین‌و دەرکەوتنی ڕاستییەکان، هیچ بیانویەک پاساوی بێدەنگیان هەتا مردنی (ماو)و دوای ئەوەش هەتا ئێستا (کیمئیل‌سۆنگ) ناداتەوە. ئەوە نەبێ بڵێین: ئەوانیش یان براگماتین یان خۆشیان وەکو ستالینن! چۆنیەتی بیناکردنی سۆسیالیزمیش، لەچین‌و کۆریادا، نموونەیەکی دزێوی ئەم قۆناخە مێژووییەیە تیزی سێ جیهان‌و هەڵەی کوشندەی زووتر گواستنەوە لە قۆناغی دیموکراسیەوە بەرەو سوسیالیزم‌و (شۆڕشی نوێ!)و گوێنەدانە داخوازییەکانی (گەلی تبت)و پەرستنی خودی ماو. هەرکە هەموویان بە زیانی دژایەتی سوسیالیزم

گەڕایەوەو ئەنجامیش گەیشتۆتە گەڕانەوەو گێڕانەوەی سەرمایەداری‌و قەلاچۆکردنی هەزاران خۆپیشاندەر تەنیا لەسەر مافی ئازادی‌و دیموکراسی.

لەکۆریاشدا، جگەلەوەی ئاستی ژیانی خەڵک لەچاو کۆریای سەرمایەداریدا، ئێجگار نزمترەو سۆسیالیزم بەناو هەیەو کرێکاران تەنیا بە رواڵەت فەرمانڕەوان‌و دیموکراسی هەر بوونی نییە. جگەلەوانە (کیمئیل‌سۆنگ) کە خۆی بە (کۆمۆنیست!) دەزانێ لەدەستووری ولاتەکەیدا بە بڕیار چەسپاندوویەتی کەوا هەتا دوارۆژی ژیانی ڕێبەری حیزب‌و سەرۆکی کوریا بێت، خراپتریش لەمە بەتاقی تەنیا مافی هەیە کابینەی ولاتەکەو بڕیاری ئەنجومەنی بەرزی پاسادانان‌و تەنفیزی هەڵبوەشێنێتەوە! مەگەر (سەدام حسێن) وابێ. ئەویش لەبەر ڕای گشتی جیهان نەیانووسیوە بەلام بە کردەوە خراپتریشە.

بەوشێوەیە ستالینیەت زیاتر لە چارەکە سەدەیەک، وەکو ڕێبازێکی سەرکرتکەرانە لە شورەوی‌و دەرەوەی‌دا گەوهەری مارکسیزم‌و گیانی شۆڕشگێڕانەی شەمزاندو شێواند. ئەم ڕێبازە دیکتاتۆریە کەمتر لە ریڤیزیۆنیزمی کاوتکی‌و برنشتاین، زیانی بۆ فەلسەفەی مارکسیزم نەبوو. چونکە جگەلەوەی:

- سۆسیالیزمی شێواند
- دیموکراسی پێشێل کرد.
- ملیۆنەهای کوشت.
- حیزبی بۆلشەویکی تێکدا.
- خەباتی کرێکاران‌و گەلانی ساردکردەوە.

جگەلەهەموو ئەوانە، مەترسی ئەم ڕێبازە دوو زیانی کاریگەرتریشە کە هەتا ئێستاش بوونەتە مایەی تاوان‌و تانەی گەورە بۆ مارکسییەکان:

١- لەسەر ئاستی جیهان پڕشنگی دووربغای مارکسیزم خامۆشکراو سەرمایەدارە کۆنەپەرستەکان هەتا ئێستاش ستالینیەتیان کردۆتە نووکی ڕمی ژەهراوییان بۆ دژایەتی مارکسیزم، هەتا ڕادەیەکی زۆریش تاوانەکانی ستالین مارکسیزمی لەناو خەڵکی ئۆروپاو ئەمریکاو باقی ناوچەکانی جیهانیش کەم بایەخ کردووە.

٢- دیکتاتۆریەتی ستالین، لەبەر ئەوەی بەناوی مارکسیزم‌و چەسپاندی سۆسیالیزم لەیەک ولاتدا لە بەرامبەر ئیمپریالیزم‌دا پێڕەودەکرا بە ملیۆنەها خەڵکی بێ‌ئاگا چەواشەکران‌و سەرکوتاندنی ئۆپۆزیسیۆنی شۆڕشگێڕیش بەحەلاڵ دەزانرا، هەر ئەمەش وایکرد لەبەرامبەر ستالینیەتدا کرێکاران‌و ڕۆشنبیرانی شۆڕشگێڕی

شورەوی‌و جیهانیش درێژە بە ململانێی ئایدیۆلۆژی‌و چینایەتی نەدەن.
کەواتە: مەترسی راستڕەوی لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە کەمترە لە مەترسی ستالینیەت‌و هاوڕێبازەکانیان لەناو بزووتنەوەی کرێکاران‌و گەلانیشدا. چونکە لەبەرامبەر راستڕەوەکاندا مەترسی دژایەتی کردنی باوەڕی چینایەتی‌و مارکسیزم زوو دەزاندرێ. لەکاتێکدا لە بەرامبەر ستالینیەتدا نەک زوو نازاندرێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی ستالینیەتەکە خۆی لەژێر پەردەی ئەو باوەڕەدا دەشارێتەوە، بۆیە دژایەتی کردنی پێڕەوانی مارکسیزم توند دەبێ، بەتایبەتی لەلایەن ئەو حیزبانەوە کە لەدەرەوەی دەنگی دەهۆڵی ستالینیەتیان لەژێر کارایی سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو لینیندا پێ‌خۆش بووە.
ئەم هۆیەش لەڕووی یاسای خۆیی خەباتی چینایەتییەوە کارایییەکی ناڵەباری کردۆتە سەرخەباتی کرێکارانی جیهان‌و تێکۆشانی گەلانی رزگاریخواز. لەبەر ئەمەشە دەبینین لەو سەروبەندەی مێژوودا، بزووتنەوەی چینایەتی کرێکاران ڕەوتی جارانی تەپیوەو لەدوای جەنگەوە لەسەرانسەری جیهاندا تاکە راپەڕینێکی چینایەتی گەورە بەرچاو ناکەوێت کە بووبێتە ناوەندێکی نوێی خەباتی چینایەتی. هۆیەکی خۆیی هەرە گرنگیشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا ستالین لەگەڵ وڵاتانی سەرمایەداریدا بۆ راگرتنی لەنگەری ناکۆکی بنچینەیی‌و سەرەکییەکانی جیهان‌و ناوچەکان‌و میللەتان‌و هاوئاهەنگی کردووەو لەپێناوی بردنە سەری ئەم مەبەستەش بە دەستکەوتەکانی پاش جەنگ لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا رازی بووەو بەس. مەگەر میللەتی، یان ڕێبەرایەتی حیزبێک بە پێچەوانەی خواستی ستالین سوور بووبێ لەسەر ڕێبازی سەربەخۆیی‌و شۆڕشگێڕێتی. لەو هەلومەرجەی جیهان‌و شورەویدا کە گۆڕانکارییەکی گەورە لە جیهاندا ڕووی نەدا، ستالین مردو جێنشینێکی ریڤیژنیستی دیکە هاتە سەرکار.

## ٢/٥- خرۆشۆف: هەڵگەڕانەوە لە ستالین

نیکیتیا سەرگێیڤیچ خرۆشۆف (١٨٩٤-١٩٧١) لەپاش شۆڕشی بۆرژوای ڕوسیاوە پێوەندی ڕێکخراوەیی بە بۆلشەویکەکانە هەبووە. ئەزموونی سیاسی لەوە بەدوا دەست پێدەکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ناوبراو لەناو بۆتەی کێشە ئایدیۆلۆژی‌و تیۆری‌و سیاسییەکان قاڵ نەبووەو یەکسەرە لەژێر کارایی سەرکەوتندا تێکەڵاوی سیاسەت بووە. دیارە شۆڕشی ئۆکتۆبەر سەرکەوتنەکەی کارێکی

پڕۆوپی بوو بەڵام زۆری نەخایاند دووچاری هەڵەو تەنگۆچەڵەمەی قووڵو دوژمنی ڕەمەجۆرەی سەرسەخت هات. ئەو دوژمنو تەنگوچەڵەمانە بوونە کۆسپی گەورە گەورە لەبەردەم بەدیهێنانی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسیو سۆسیالیزمدا.

دیکتاتۆرێکی دڕندە جڵەوی کەوتە دەست کاتێک دیکتاتۆریش سەردەکەوێ دیارە دیموکراسیەتیش نامێنێ، کەواتە: ئازادیش نامێنێو باقی ڕێبەرو کادرو خەڵکی بەتواناى شۆڕشیش ناتوانن ئازادانە بیر لە چارەنووسی شۆڕشەکەو چارەسەرکردنی کێشەکانی بکەنەوە یان کە بیریشیان لێ کردبێتەوە توانایان نابێ بڕیارو پێشنیارەکانیان پیادە بکەن، چونکە (هاوڕێ ستالین) ڕێی نەداوون. نەبوونی ئازادیو سەپاندنی دیکتاتۆریەت یەکێک لە زیانە گەورەکەی بە قوتابردنی توانستی خەڵکە بەتواناکانی کۆمەڵە، لە هەموو ڕوونکەوە بەتایبەتی لەڕووی ئابووریو تیۆریو ئایدیۆلۆژیو سیاسیو عەسکەرییەوە. هەربۆیە ئەو زەمانو زەمینەیەی کادرە نوێکانی ئۆکتۆبەرو پاش مەرگی لینینو لەناو گەرمەی کێشە ئاڵۆزەکاندا پێگەیشتوون، چۆنیەتی پەروەردەیان جیاواز بووەو لەچاو پەروەردە دیموکراسییەکەی کاتی ڕێبەرایەتی لینین بەرەو خراپی گۆڕاوە، بەتایبەتی بۆ دەزگای ڕێبەرایەتی، ئەگەر ستالینو دەزگا تایبەتیەکانی لێی دڵنیا نەبووبن لەبەر ئەوەی ستالین یەکەم پێشێلکەری دیموکراسیو پێڕەونەکەری پرینسیپەکانی بووە. ناکرێ خۆی وا بووبێو کادرو هاوڕێکانی پێچەوانەی خۆی پەروەردە کردبێ. کادرەکان، بەوشێوەیەش لەناو حیزبو دەوڵەتدا پێشکەوتبنو پێش خرابن، هەڵبەتە بەدەرنابن لە سیاسەتی ستالینیانە.

خرۆشۆف لەو کادرانە بووە لە زەمانی ستالینو لەناو قوتابخانەی ستالینیەتدا پەروەردە کراوە، پێشخراوە، گەیەندراوەتە ڕێبەرایەتی حیزبو دەوڵەت. هەر لەوکاتەوەی لە کۆنگرەی چواردەهەمی حیزبدا ساڵی ١٩٢٥ بەشداری کردووە، بووە بە دڵسۆزێکی ستالینیەتو دژی نەیارەکانی بەگەرمی تێکۆشیووە. متمانەی ستالینی لەڕێی دۆستانی نزیکی ستالینەوە بۆ مسۆگەر کراوەو پلەبەپلە پێشخراوە هەتا لە کۆنگرەی حەڤدەهەمدا (١٩٣٤) کراوەتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی. ساڵی ١٩٣٨ کە ساڵی خوێناوی لەناوبردنی نەیارانی ستالینە، کراوەتە سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی ناوەندی لە ئۆکراینادا. پاش ساڵێک کراوەتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی. بەوشێوەیە خرۆشۆف حیزبایەتی کردووەو هەتا ئەو ڕۆژەی ستالین زیندوو بووە، لەبەرامبەر ئەو هەموو تاوانە، کوشتار، سەرنگوونکردنە... کوشتنی هەڵکەوترین

ڕێبەرانی حیزب‌و نەبوونی لایەنی کەمی ئازادی‌و دیموکراسیدا، خۆی مت کردووەو ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە. ویژدانی کردۆتە خۆراکی بێ ویژدانی ستالین‌و لە کەلەبەری ڕۆژگاردا خۆی بۆرژوی خۆی مەلاس‌داوە* تەنانەت ئەوەندە جێی باوەڕی ستالین بووە بەدرێژایی سالأنی مسئولیەتی خرۆشۆف لێی نزیکبووەو یەکێک بووە لەوکەسە کەمانەی لەنزیکەوە ستالین پشتی پێ بەستوون. ئەو ڕۆژەی ستالینیش مردووە، خرۆشۆف لە یادداشتەکانی خۆیدا نووشیویەتی کە: نەمتوانیوە خۆم کۆنترۆڵ بکەم‌و گریان، دەشبێ بڵێم لەمەرگی ستالیندا ڕاستگۆیان گریام!

لەبلاوکراوەی کۆمیتەی ناوەندیش‌دا بەبۆنەی مەرگی ستالین کە بێگومان بە ڕێنوێنی خرۆشۆف نووسراوە، وەفاداری بۆ ستالین دووپات کردۆتەوەو گوتوێتی: «هاوڕێ لینین‌و درێژەپێدەری ڕێبازەکەیەتی‌و ڕێبەرو مامۆستای ووردبینی حیزبی کۆمۆنیست‌و خەڵکی شورەوییە ‹١٥›».

کە خرۆشۆف ڕێبەرایەتی شورەوی کەوتەدەست، لەلایەک خۆی پەروەردەی قوتابخانەی ستالینیەت بوو، لەلایەکی دیشەوە دەیزانی شورەوی لەژێر چ بارێکی سەختدا دەناڵێنێ. ئەرکە جیهانییەکانیش کەمتر لەو دوولایە باری خرۆشۆف‌و ڕێبەرایەتی نوێی شورەوییان قورس نەکردبوو. حیزب، لە ئاستەنگی نەبوونی دیموکراسی‌و ئازادی‌دا دەژیا. سەدان هەزار کادر سەرنگوونن. هەزاران تێکۆشەر دوورخراوەی ناوچە دوورەکانن. دەوڵەت، ئاستی پێشکەوتنی نزم‌و پیشەسازی پاشکەوتووە. کشتوکاڵی کەمفەرە. بژێوی خەڵک کەمەو پەرسەندنی کۆمەلأیەتی شێواوە. لەسەر ئاستی جیهانیشدا، کرێکاران‌و گەلان، هەروەها حیزبە بەناو کۆمۆنیست‌و کۆمۆنیستەکانیش چاوی ئومێدی گەورەی ئایندەیان بڕیبووە شورەوی کە بتوانێ پاش جەنگی دووەم‌و پاش ئەوەی بۆتە خاوەن چەکی ئەتۆم لە بەرامبەر دەوڵەتانی ئیمپریالیزم‌دا یارمەتی سەرکەوتنیان زیاتر بدات. سەرکەوتنی چین‌و کۆریای باکوریش ئەو ئومێدەیان گەشتر کردبوو.

---

* ئەم خۆپەرستی‌و لەپەرێزدا مەلاس‌دانە، لەناو زۆربەی شۆڕشەکانی جیهاندا دووپات بوونەتەوەو تاوانی گەورەش لەو ڕێڕەوەدا کراوون.

‹١٥› از لینین تا گورباتشف. ترجمە: نگارش محمود طلوعی، سازمان انتشارات هفتە، چاپ اول ١٣٦٧ ص: ٢٦٨.

ئیمپریالیزمیش، ئەمریکای کردبووە پێشەنگی نوێی و ئەمریکاش، وەکو وڵاتێکی خاوەن توانای ئابووری بێ‌شومار، دەیویست گوایە بە سیاسەتێکی هاوچەرخانە، بە ئەزموون لێوەرگرتن لە بەریتانیای کۆنە پێشەنگی ئیمپریالیزم، دابەزێتە مەیدان‌و هەتا ڕادەیەکیش گفتی دیموکراسی‌و بەڵێن بردنەسەری پەیمانی (ئەتلانتی) لە قازانجی گەلاندا دەدایە گوێی دانیشتوانی گۆی زەوی. لەناوەڕۆکیشدا بەربەرەکانێ کردنی توندی کۆمۆنیزم‌و کۆمۆنیستەکان، ئەرکی هەرە گرنگیان بوو. داگیرکردنی گەلان‌و سەرکوتکردنی کرێکاران. هەر لەو سەروبەندە مێژوودا بوو کە ئەم کێشانە هەبوون:

- جەنگ لە هیندو چین‌دا دژی فەرەنسا.
- لاوس (پانت - لاتو) دژی فەرەنسا ١٩٤٦-١٩٥٤.
- مالیزیا دژی ئینگلیز١٩٤٨-١٩٥٧.
- کینیا (مائو مائو) دژی ئنگلیز ١٩٥٢-١٩٥٤.
- ڕاپەڕینەکانی تونس دژی فەرەنسا ١٩٥٢-١٩٥٦.
- شۆڕشی جەزائیر دژی فەرەنسا ١٩٥٤-١٩٦٢.
- قوبرس دژی ئینگلیز ١٩٥٥-١٩٥٩.
- کامیرۆن دژی ئنگلیز ١٩٥٧-١٩٦٠.
- دەستتێوەردانە عەسکەرییەکەی سویس ١٩٥٦.
- دەستتێوەدانی ئەمریکا لە لوبنان ١٩٥٨.
- گواتیمالا-هیندوراس دەستتێوەردانی سیا ١٩٥٤.
- دەستتێوەردانی فەرەنسا لە مۆریتانیا ١٩٦١.
- دەستتێوەردانی فەرەنسا لە بیروت ١٩٦١.

هەروەها :

- شۆڕشی سەرکەوتووی میسر ١٩٥٣.
- مانگرتن‌و هەژانی میللی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات ١٩٥٣.
- مانگرتنی کرێکارانی پۆلۆنیا ١٩٥٦.
- ڕاپەڕینی هەنگاریاو دەستتێوەرداتی چەکدارانی شورەوی ١٩٥٦.

تەواوی ئەو ڕووداوانە، یەک لەدوای یەک، هاوکات لەسەردەمی خرۆشۆفدا ڕوویاندا. خرۆشۆفیش لەناو شورەویدا دووچاری ئەو دۆخە بوو بوو خۆیشی توانایەکی دیاریکراوی ڕێبەرایەتی هەبوو کە پاشان دەرکەوت تواناکەی بۆ ئەو

پلەوپایە گەورەیە، کەم بووە، بەوحاڵەشەوە، خۆی لەیادداشتەکەیدا دەڵێ: «هێشتا دڵی چالاکییەکانی دەورانی ڕێبەرایەتی ستالیـن بووینو نەمانتوانی بەو خۆمان لە دەسەڵاتی ئەو- تەنانەت دوای مەرگیش- ڕزگار بکەین. تەنیا لە ساڵی ١٩٥٦دا توانیمان خۆمان لە پاشماوەی سایکۆلۆژی شێتانە کە لە ماوەی ڕاوکردنی دوژمنانی خەلکدا پەروەردەی کردبووین، ئازاد بین (هەتا ئەوکاتە) هەروەها ئێمە دڵی خەیاڵیوا وگومانی هەمیشەیی ستالینیەت بووین لە گەمارۆی دوژمناندا بووینو ناچاربووین دژایەتییان بکەینەوە...

لەسەر هەمان یادداشتدا درێژە بەباس دەدرێ کەوا: «بۆ ئێمە قابیلی تەسەور نەبوو کە ئەم هەمەوو ئیعدامـاتو دەورانی لەناوبردندا ڕوویاندا بوولەڕووی یاساییەوە جۆرێ لە تاوان بژمێردرێ، بەلاّم ڕاستییەکەی ئەوەیە کە جۆرێ لەتاوانە ستالین تاوانێکی کردبوو (بەپێی یاسا)ی تەواوی وڵاتانی جیهان- وەکو دەوڵەتە فاشییەکانی مانەندی ئەڵمانیای هیتلەرو ئیتالیای مۆسۆلینی - قابیلی سزادانە-».<١٦>

کەواتە: خروشۆف هەتا سێ ساڵ دوای مردنیشی باوەڕی بە ستالینیەت هەبووە. ئەمەش بە ڕوونی ئەوە دەسەلمێنێ کە لەکاتی ستالیندا هەرگیز ناوبراو دژایەتیکردنی ستالین یان بەرهەڵستی کردنی سیاسەتەکانی بە خەیاڵیشدا نەهاتووە. کە مردووشە بەڕاستی بۆی گریاوە. ئەو بلاّوکراوەیەی لەکاتی مردنیشیدا بۆیان نووسیوە بە فێڵیان نەبووە. بەلاّم دوای سێ ساڵ لێکۆڵینەوەو توێژینەوە، خروشۆفو هاوبیرەکانی بۆیان دەرکەوتووە ستالین نەک: هاوڕێی لینینو درێژەپێدەری ڕێبازەکەیو مامۆستای وردبینی حیزبی کۆمۆنیستو شۆڕەوی نییە بەڵکو یەکێکە وەکو گەورەترین تاوانبارەکانی مێژووی هاوچەرخ: مۆسۆلینیو هیتلەر... ستالینیشیان چووەسەر. چاکە: خروشۆف لە ئەندامی کادرو ڕێبەرایەتیشدا پەروەردەی قوتابخانەی ستالینیەت بووبێو بە متمانەی ستالینیش بۆ ڕێبەرایەتی بەرزکرابێتەوەو هەتا سێ ساڵ دوای مردنیشی دڵسۆزی بووبێ، داخۆ پاش لێکۆڵینەوەو ناسینی ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ستالین کە دەرکەوت تاوانبارێکی وەکو هیتلەرە، داخۆ دەشێ قوتابی قوتابخانەی (هیتلەری سوسیالیزم) تەنیا لە ساڵێکدا، یان دەستبەجێ دوای زانینی ڕاستییەکان، بە ئاسانی ببێتە کۆمۆنیست؟

---

<١٦> ادوارد کرانشکاو. خاطرات سیاسی خروشوف، ترجمه محمد رفیعی مهرآبادی ص: ٨٠.

هەڵبەتە نەخێر. بوون بە کۆمۆنیست‌و ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی هەروا ئاسانبا، ڕەنگە بە ئاسانی سەرمایەدارە گەورەکانی جیهانیش کرابانە کۆمۆنیست‌و لە سەراپای جیهاندا، کۆمۆنیزم هاتبایەتەدی.

پرۆسەی ڕووداوەکان گەوا بوون‌و خرۆشۆف لەناو ئەو ڕووداوانەوە بووبێتە ڕێبەر، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئاشی نەزان خوا گێراویتی! نەخێر ئەویش لە تەمەنی سیاسی خۆیداو لە بزتەی حیزبایەتی‌دا لەناو ئەو هەموو ڕووداوانەدا بەتایبەتی لەکاتی جەنگ‌داو لە ئەزموونی ئەو پلەو پایانەی وەریگرتوون، بووە بە سیاسەتمەدارێکی گرنگی شورەوی‌و جیهان (بەڵام نەک ڕێبەری بزووتنەوەی کۆمۆنیستی) بەپێی عەقڵی ئاوەزی خۆی‌و دەوروبەرەکەی جیهانی بینیوەو نەخشەی کێشاوە. لە ڕوانگەی ئەو هەلومەرجەشەوە هەوڵیداوە باری گرانی ستالینیەت سووک بکاتەوە. ئەمەش کارێکی باشە. دیارە ئەمیش دەیتوانی وەکو مامۆستاکەی میراتگری دیکتاتۆریەتەکەی بێ، یەکێک لە شانازییە گەورەکانی پەردە هەڵماڵینیەتی لە ڕووی تاوان‌و کردەوە دزێوەکانی ستالین.

هەر لە زەمانی خرۆشۆفدا بۆیەکەم جار، موشەکی کیشوەرتێبەڕ بەرهەم هێندراو ساڵی ١٩٥٧یش یەکەمین مانگی دەستکردی شورەوی، بە تەوژمی ئەنێرژی هەمان موشەک، هەڵفڕێنرایە ئاسمان. لەدوای چەند مانگێکی هەمان ساڵ دووەمین مانگی دەستکرد بەڵام شەش جار قەبەتر لەوی پێشوو بەسەرنشینی سەگێک هەڵفڕێنراو جیهانی بەجاری حەپەساند. ئەم داهێنانە گرنگانە بۆ کرێکاران‌و گەلان مایەی دڵخۆشییەکی بێ وێنەو بۆ سەرمایەدارانیش بەتایبەتی ئەمریکای پێشەنگیان کە لەڕووی تەکنۆلۆژیاوە بالادەست بوو، هۆی ماتەمیەکی سیاسی‌و پیشەسازی‌و عەسکەری گەورە بوو. چونکە ئیتر ئەمریکای دوورە دەستیش لەو موشەکە کیشوەرتێبەڕانە کە دەتواندرا بەسەر ئەتۆمیش تەیار بکرێن، پارێزراو نەبوو، ئەمەش تەرازووی هێزی عەسکەری زلهێزەکانی لە جیهان سەنگەو لار کردو لەوە بەدوا شورەوی زاڵ بووە. بۆ یەکەمجار ئیمپریالیزم پاش جەنگێکی جیهانی بێ‌وێنە، بەڵکو دوای ئەوەی لە جەنگی دووەمدا دژی دوژمنی مرۆڤایەتی نازیەکان ڕۆڵی یەکجار گەورەیان لەسەرکەوتن‌دا هەبووە، پێچەوانەی جەنگی یەکەمی جیهان، ئاوەها خۆیان لەژێر باری نا بەرابەرێکی عەسکەریدا دۆزیەوە، تەنانەت پێشەنگە نوێکەشیان کە گەورەترین لاقی تەکنۆلۆژیای سەردەمەکەی لێدەدا، دواکەوت. جیهانیش بەهۆی تێکشکاندنی نازیەکان چاوی کراوەترو بیری ئازادی‌و ڕزگاری

فراوانتر پەرەیسەند. کورتیەکەی دۆخی قوڵکردنی ڕێبازی شۆڕشگێڕانە لاپارو باری سەرخستنی کرێکاران‌و گەلان ڕەخسا بوو، دەکرا دوای ڕیسواکردنی ستالینیەت لەو بارودۆخە هەڵکەوتوەدا وەکو دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئوکتۆبەر، خەباتی ئینتەرناسیۆنالیزم بگەشێنڕێ‌و قووڵتر بکرێ، ئەرکی ڕزگاری‌و دیموکراسی باشتر بەرێندرێتەدی؛ بەلاّم ڕێبەرایەتییەک خۆی دیموکراسی نەبێت، هەرگیز پشتیوانی دیموکراسیەتی گەلان نابێ. هەروەکو پێشتر باسکراوە، خرۆشۆف لەبارودۆخێکی جیهانی نوێدا کەدەتواندرێ بگوترێ ڕوداوە سیاسییەکانی لەسەردەمی ستالینیش جیاوازتر بوو، هاتەسەر کاروکایە. خەسڵەتی دیاری ئەم جیاوازییەش ئەو بزووتنەوە بەرهەڵستییە نیشتمانی-سیاسییە کە لە ڕۆژهەلات‌و ئەفریقاو ئەمریکای لاتیندا دژی کۆلۆنیالیزم بە ڕێبەرایەتی وردە بۆرژوای (نیشتمانپەروەر) دەتەقینەوە.

لەپاش جەنگی دووەمی جیهانەوە، چوار چەشن ناکۆکی توندوتیژ لە جیهاندا سەریان هەڵداو لەسەردەمی خرۆشۆفدا گەیشتنە لوتکەی جۆشان:

١- درێژەکێشانی جەنگی کۆنینە (کلاسیک).

٢- جەنگی ڕزگاریخوازی دژی کۆلۆنیالیزم.

٣- جەنگی ناوخۆی چینایەتی، نەتەوایەتی، مەزهەبی.

٤- جەنگی سایکۆلۆژی.

قوربانی ئەو جەنگانە لە سالأنی ١٩٤٥-١٩٨٢ دەگاتە (١٢،٥) ملیۆن کەس، واتە سالأنە (٣٥٠٠٠٠) هەزار* تەنیا کوربانییەکانی ئەو جەنگانەی لەسەر کێشەی سنووری دەوڵەتان تەقیونەتەوە، ١٠ ملیۆن کەسە، ئەمانەش بریتین لە:

- جەنگی نێوان هیندستان‌و چین ١٩٤٦-١٩٧٥.

- جەنگی نێوان هیندستان‌و پاکستان ١٩٤٧-١٩٤٩-١٩٧٩**

زۆربەی ئەو جەنگە گەورەو جەنگینە ناوخۆیانە، یان دژی ئیمپریالیزم، یان بە دەسیسەی ئیمپریالیزم هەڵگیرساون. بەشێوەیەکی گشتیش جەنگە ئازادیخوازەکان ڕاستەوخۆ دژی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم بوون، وەکو: کوبا، لاوس، هیندوچین، مالیزیا، کینیا، تونس، جەزائیر، قوبرس، کامیرۆن، کۆنگۆ، ئەنگۆلا،

---

* اطلس استراتژیک جهان، ژاررشالیەم-ژان پیراژو ل:٤٧.

** هەمان سەرچاوەی پێشو، هەمان لاپەرە.

یەمەنی باشوور، گینیابیساو، فەلەستین، مۆزەمبیق، کاتانگا، کوردستان، ئەریتیریا... تاد.

لە هەلومەرجێکی ئاوەهای جیهاندا کە شورەوی بوو بووە خاوەن کاریگەرترین چەکی گەورەو لەسەرانسەری جیهاندا کرێکارانو گەلانیش وەکو شورەیەکی پۆلاین دژی ئیمپریالیزم هاوپەیمانی بوون. هێشتا شورەوی وەکو قەلای سۆسیالیزمو ئازادیخوازان تەماشا دەکرا. لەکاتێکدا تەواوی ئازادیخوازان کەمترین ئاگایان لە تاوانەکانی ستالین نەبوو بگرە ئەو دەنگوباسانەی لەسەر ستالین دەبیستران. هەتا خرۆشۆف تاوانە داپۆشراوەکانی ئاشکرا نەکرد، هەموو جۆرە رەخنەیەک دەربارەی سیاسەتە دیکتاتۆرییەکانی ستالین بە بوختانی ئیمپریالیزم دەژمێردرانو بە توندی بەرپەرچیش دەدران؛ خەڵکی جیهان زۆرتر سەرگەرمی پێشکەوتنو داهێنانو داهێنراوەکانی شورەویو هاوپەیمانەکانی بوون، چاوئەندازی هیوای ئازادی برا بووە، ئەندازەی کاریگەری شورەوی لە جیهاندا بەلام خرۆشۆف پاش ئەوەی خۆی سەپاندو برێک لە نەیارەکانی کوشتو لابرد. دەسەڵاتە گرنگەکانی شورەوی گرتەدەستو لە خۆیو دەوروبەرەکەی دڵنیا بوو، ئەوسا لە جیهانبینی خۆیەوە لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی شورەوی (شوباتی ١٩٥٦) بەدواوە کەوتە پیادەکردنی سیاسەتی خرۆشۆف. کە لەرووی تیۆرییەوە ئەوەی پێوەندی ئۆرگانیکی بە باسەکەوە هەیە دوو راستییە:

١- سیاسەتی هاوژینی ئاشتییانە لەنێوان سۆسیالیزمو سەرمایەداریدا.

٢- دامەزراندنی سۆسیالیزم بە رێبازی گەشەکردنی ناسەرمایەداری بە رێبەرایەتی وردە بۆرژوا*

ئەم دوو تێزە پێکەوە بەستراوی قۆناخێکی چارەنووس‌سازن. قۆناخی دەرکەوتنی راستییە: ئابووریو کۆمەلایەتی، تیۆریو سیاسییەکانی شورەوی. کە لەسەردەمی ستالیندا دەمێک بوو کەڵەکە بوو بوون. بەلام بە رێبازی چەواشەی مارکسیزم، داپۆشرا بوون. ئیدی لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمەوە ستالین وێرای کەللە رەقییەکەی، ستراتیژی پێکەوە ژیانی لەگەڵ سەرمایەدارانا لەسەر ئەم بنەمایە لە کۆبوونەوەی رۆژی شەشەمی شوباتی ١٩٤٤ی ئەنجومەنی بەرزی شورەوی دارشت:

* کاتێک دەڵێن دامەزراندنی سۆسیالیزم، مەبەستمان هەمان پلاتفۆرمە کە شورەوی پێرەوی لێدەکرد نە دانان بە سۆسیالیزمی شورەوی.

«بۆئەوەی شورەوی دەرفەتی پێویستی بۆ بیناکردنەوەی ویرانیەکانی جەنگی هەبێ، پێویستیمان بە دەورانێکی دووورودرێژی سولح هەبو بە قازانجی ئیمپریە که (جیهانی سەرمایەداری، نەک بۆ هەمیشە بەڵکو بۆ ماوەیەکی هەتا رادەیەک درێژ لە سولح و جێگیردا بەرنسەر <١٧>.

لەم گوتەیەدا بەروونی دەوبات کراوەتەوە کەوا شورەوی دەستبەری پاراستنی قەوارەی سەرمایەدارییە هەرچەند بەمەبەستی بیناکردنەوەی ولاتەکەش یان هەر بیانوویەکی دیکەبێ. بێگومان بیناکردنەوەی ولات لەپاش جەنگێکی کاولکارانە ئەرکێکی گرنگی رێبەرانی ولاتانە. هەروەها هەرچەشنە رێککەوتننامەیەکی سیاسی و تاکتیکی دیکەش، بەلام ئەمە نابێ لەسەر حیسابی بنەماکانی پرنسیپی شۆرشگێرانە بێت. بۆ دەستبەری ئەوە بکرێ سەرمایەداری بێ کێشە، بێ سولح و جێگری هەردەبێ بە فشار خستنە سەر کرێکاران و گەلانی شۆرشگێر بێ، ئەم فشارەش دەبەسترێتەوە بە یارمەتی نەدان، دژایەتی کردن، هان نەدان و سارکردنەوەی خەبات و فیداکاریش که هەڵبەته بۆ یەکێکی وەکو ستالین کوشتن و کوشتاریشی دەچێتەسەر.

ئەوجۆرە سیاسەتەی لای ستالین هێندە مەبەست بووە، تەنانەت لە کۆنگرە جیهانی و لەبۆچوون و بڕیارەکانیدا بەجۆری بەریتانیاو ئەمریکای دڵنیا کردووە. سەرۆک رۆزڤێلت لە خۆی رایەنیوە بڵێ: «من دەربارەی بیروڕای ئێوە باس ناکەم. قسەکانی ئێوە لۆژیکە، بەلام بەش بەحاڵی خۆم هەست دەکەم ستالین ئەو پیاوە نییە کە ئێوە تێیگەیشتوون. هاری هاپکنزیش هەمان باوەڕی هەبو دەڵێ هیچ جۆرە سوورپوونێکی لەسەر بڕوای خۆی نیەو جگەلە ئاسایشی ولاتەکەی هیچی دیکەی ناوێ... تەنانەت من وای بۆدەچم کە هەرچییەکم لە توانادایە بیخەمە بەردەستی ئەو لەباتی ئەوەش هیچی لێنەخوازم، ئەویش ئەم کارانە بەبێ بڕاردنەوە ناهێڵێتەوەو بۆ دروستکردنی جیهانێک کە لە سولح و ئازادیدا بژی هاوکاریم دەکات <١٨>».

ئەمە بەڵگەی دڵنیابوونی ئەمریکایە لە سیاسەتی ستالین کە جیهانی پاش جەنگ بەوپێیە دابەشکراوەتەوەو میراتەکانی ئەلمانیاش بەدڵی خۆیان دادەبەشرێتەوە کە دیارە مەبەستی هەرە سەرەکی ئیمپریالیزم پشتگیری نەکردنی خەباتی

<١٧> ارتور کند. یالتا یا تقسیم جهان، ترجمه محمد طلوعی، چاپ اول ١٣٦٥ ص: ١٨١.

<١٨> هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل: ١٨١.

شۆڕشگێڕانەی کرێکارانی جیهان‌و تێکۆشانی ڕزگاریخوازانەی گەلانی داگیرکراوە.

لە بەندی (٩)ی بەیاننامەی کۆتایی کۆنفرانسی یالْتاش‌دا بە ڕاشکاوی لەژێر ناونیشانی (یەکێتی لە زەمانی ئاشتیدا وەکو زەمانی جەنگ) بڕیاری لێبڕاوی پاراستنی دۆستایەتی‌و هاوکاری جیهانی بە: ئەرک‌و قەرزێکی پیرۆز دووپاتکراوەتەوەو بە بەیانی (ئەتلانتیک)ەوە بەستراوەتەوە.

> ئەو بڕیارانە، هی زەمانی ستالین‌و پاش جەنگی دووەمی جیهانە، بۆیە بەهیچ شێوەیەک ئەو بیرو بۆچوونانە ڕاست نین کە دەگوترا: خرۆشۆف بناخە دارێژی ئاشتی هەمیشەیی‌و ڕێڤیژیۆنیزمە لە شورەویدا. کە بەزۆری ئەم بۆچوونانەش لەلایەن (ماو)یەکانەوە بلاو دەکرایەوە. ئەوەی خرۆشۆف کردی درێژە پێدانی هەمان سیاسەتە، بەلاّم بە دوو تایبەتمەندی خۆی: یەکەم دیکتاتۆریەتەکەی ستالینی داماڵی‌و دووەمیش بە ئاشکرا ئەو سیاسەتەی تیوریزە کردو لەناو تەمومژی لاف لێدانی شۆڕشگێڕیتی نەهێشتەوە.

پێش ئەو تێزە تازانە چیدیکە تاوانەکانی ستالینی لە گۆشەی نهێنی مێژوودا نەهێشتبۆوە سەرەڕای بەرهەڵستیەکی توند توانی وردە وردە بڕیارەکانی لەسەر ڕیسواکردنی ستالینیەت بچەسپێنێ‌و بۆیەکەم جار ئەو ڕاستیانەی پێشتر بە بوختانی ئیمپریالیزم لە قەڵەم دەدران، ئاشکرا بکات.

تێزی هاوژینی هەمیشەیی‌و گەشەکردنی ناسەرمایەداری دوو مەسەلەی ئابووری، ئایدیۆلۆژی، سیاسی جیهانگیر. هەر یەکەیان بەجۆرێک‌و هەردوو جۆرەکەش بە جیاو پێکەوە کاریان کردە سەر ڕەوتی ڕووداوەکان، سیاسەتی جیهان، خەباتی کرێکاران‌و گەلان.ناوەڕۆک‌و ئاکامی بەدیهێنانی هەردوو تێزەکەیش ڕاستەوخۆ پەیوەستن بە ڕێبازی شۆڕش‌و خەباتی شۆڕشگێڕانە یان ڕوونتر بڵێین دۆزینەوەی ڕێبازێکی ڕێڤیژیۆنیستەکەیش. بەپێچەوانەی ڕێڤیژیۆنیزمی پێشتر،خراوەتە قاڵبی بەرژەوەندی ڕزگاری کرێکاران‌و گەلان گوایە سوسیالیستیشە. سەرچاوەی ئەم تێزانەش جگەلەو بارودۆخە دژوارەی ناو شورەوی‌و ڕادەی تێگەیشتن‌و ئەندازەی ئاستی خرۆشۆف‌و هاوبیرەکانی‌و بێ باوەڕیان بە مارکسیزم. دەڵێن جگەلەوانە،

ئەومەرجەی لەناو گەلانی داگیرکراودا دژی ئیمپریالیزم لە ڕووی سیاسیو عەسکەرییەوە لە جیهاندا خولقا، هاندەرێکی هەرە کاریگەری خرۆشۆفو لەسەردەمی ئەویشدا، هی (سۆسلۆف) کە بە تیۆریسێنی گەشەکردنی ناسەرمایەداری دەژمێردری، بووە بۆ دارشتنی ئەو تێزانە. بەحسابی خۆشیان پاش ئەوەی بتوانن کاژی ستالینیەت لە جەستەی شورەوی هاوپەیمانەکانی تور بدەن، دەشتوانن ئەو هەلومەرجە سیاسیو عەسکەرییەی جیهان لە جیهانبینی خۆیانەوە بەرەو ئەو ئامانجەی بەرن کە خۆیان مەبەستیانە. ئەویش لەبری ڕێبازی شۆڕش، لە ڕێرەوی ڕێبازی پێچەوانەی شۆڕشەوە، خەباتی سیاسی-عەسکەری بۆرژوای بچووکی گەلانی ژێردەستەو دەوڵەتانی سەربەخۆییخواز. لەرێی گەشەکردنی ناسەرمایەدارییەوە بەشێنەیی‌و پشتیوانی ئابووریشەوە ڕووەو سۆسیالیزم بەرن کە مەسەلەکەش شۆڕشو شۆڕشگێڕێتی نەبێ، ئیدی ئیمپریالیزم باشتر داپێن دەکرێ، بۆ ئەوەی ئەمەش بچێتە سەر کاردانەوەی ئیمپریالیزمیش دەستەبەر بکرێ، سازشی هاوژینی هەمیشەیی ئاشتیانە پێشکەش کراوە.

تێزی گەشەکردنی ناسەرمایەداری پێچەوانەی بنچینە چینایەتیەکانی سۆسیالیزمی زانستی مارکسە. چونکە پەیامی بینای سۆسیالیزم لە کرێکاران سەندراوەتەوەو خراوەتە ئەستۆی وردە بورژوا کە لەبنەڕەتدا دژو دوژمنی سۆسیالیزمی کرێکارانە. لەسەر ئاستی جیهانیش، ڕێسای فراوانی ئیمپریالیزمە کە لەم چینەوە، لەبەرهەمهێنانی بچووکیانەوە هەم چوارچێوەی ئابووری سیستەمی سەرمایەداری تەواو دەکەنو هەم لەڕووی ستراتیژەوە لەمپەرێکی سیاسی کاریگەرن بۆ ڕێگرتن لە پەرەسەندنی خەباتی چینایەتی کرێکارانی شۆڕشگێڕ ئەگەرچی بەهۆی هەلومەرجی تایبەتیو هەستی ناسیۆنالیشەوە لە قۆناخێکی دیاریکراودا وزەی نیشتمانیو نیشتمانپەروەریشیان تیادایە.

ئەوەتەی مارکسیزم، زیاتر لەوەش ئەوەتەی خەباتی شۆڕشگێڕانە سەریهەڵداوە، هیچ تێزێک بە ئەندازەی تێزی گەشەکردنی ناسەرمایەداری قازانجی بە وردە بورژواو زیانی بە کرێکاران نەگەیاندووە. هەرچی ریڤیژنیزمی برنشتاینو کاوتسکیو هاوبیرەکانیتی، ڕاستەوخۆ لە خزمەتی سەرمایەدارییو ئیمپریالیزمدا بوون. بەڵام ئەم تێزە ڕێکو ڕەوان وردە بورژوای لەحوکمدا پاراستو مەترسی لەناوبردنیانی ڕەواندەوە. لە ئەنجامیش ئیمپریالیزم بەدڵی خۆی قۆزتیەوە. هەردەبێ بشیقۆزێتەوە، چونکە ناوەرۆکی تێزەکە ناڕاستەوخۆ لەخزمەتیدایەو دەشویسترا وردە بورژوا بەم

شێوەیەی خوارەوە بەرەو سۆسیالیزم ڕاکێشن: «لەتەزەکانی وردە بۆرژوا کە هەروەکو دیارە لە سەر شانۆ سالانی دووڕو درێژ لەچەندین وڵاتی ئافرو ئاسیاوەدا وون نابێ. مارکسیەکان جۆری سۆسیالیزمی ڕاستەقینە دەدۆزنەوەو پشتیوانی دەکەن. لەوباوەڕەشدابن ئەم هێڵە بەتایبەتی زۆر ڕاستە. ئەمەش لەوەوە هەڵدەقوڵێ کە حیزبە دیموکراسیە نیشتمانیەکان بەتایبەتی جڤاتیە چەپەکانیان کە لە سۆسیالیزمی "ناسۆسیالیستی" تا مارکسیانە تێهەڵچوون، دەتوانن بەرەو سوسیالیزمی زانستی بڕۆن لەدوا ئەنجامیشدا لە ڕێڕەوی خەباتو سەرکەوتن بەسەر ناکۆکیەکاندا، پێشی گوش بن ‹١٩›.»

ئیدی... لەتەواوی ئەو وڵاتانەی وردە بۆرژوا جۆری لە حوکمی سیاسی سەربەخۆی بەخۆی کردەتا یان ڕاپەڕینی نیشتمانی خەڵکەوە تیا بەدیهێناوە بەتایبەتی لە ئاسیاو ئەفریقیادا هەوڵی پیادەی ئەم تیزە بێ پێزە دەدراو دەشتواندری بە بەڵگەشەوە دووپات بکرێتەوە کە سەرجەمیان ئاکامەکەیان ناکامیەکی گەورە بوو بۆ سۆسیالیزم. لەوساشەوە کە لەسەرەتای شەستەکانەوە دەستپێدەکات، هەتا هاتووە حیزبە کۆمۆنیستەکان پتر پاشەکشەیان کردووە، زیاتر لەوەش ئەم ڕێبازە ڕیڤیژنیستیە لەناو هەناوی بزووتنەوەی کرێکارانو زەحمەتکێشاندا، بزووتنەوەکەی لاواز کردووە، وردە بۆرژواش لەو چارەکە چەرخەدا کە خەباتی کرێکاران لاواز کراوەو مەترسی شۆڕشو ڕاپەڕین کەم بۆتەوە سەرکەوتنی سۆسیالیزم دوورخراوە، هەلومەرجی ئابووریو سیاسی پێشکەوتووی جیهانو ڕادەی بەرزی داهاتوو دراوی بۆ چەسپاندنی خۆیو لەناوبردنی نەیارەکانی بەکارهێناوە هەتا ڕۆژگار گەیشتۆتە ئەم دۆخەو لە نەبوونی خەباتی شۆڕشگێڕانەی کرێکارانو زەحمەتکێشاندا ڕژێمە فاشیستو کۆنەپەرستەکانی وەکو عێراق، میسر، ئەندەنوسیا، سۆماڵ، هیندستان، جەزائیر و باقیشیان بە قەرزاریو ژێردەستەیی ئابووری ئیمپریالیزم درێژە بە چەوساندنەوەی چەوساوەکان دەدەنو مافە چینایەتیو دیموکراسیەکان پێشێل دەکەن لەبەرامبەریشیاندا هەتا ئەوکاتەی تیزی گەشەکردنی ناسەرمایەداری باوی بوو، ڕێبازەکانی ئۆپۆزیسیۆن چ ئەوانەی بەردەوامن لەسەر ڕێبازی ڕیڤیژنستیو چ ئەوانەی بە ڕواڵەت ڕێبازێکی جیاوازتریان لە ڕیڤیژنستەکان گرتەبەر، بەڵام لە ناوەڕۆکدا بەهەمووینی ئەوان سیاسەتی بەناو شۆڕشگێڕیان لەناو بزووتنەوەی

‹١٩› اولیا تونسکی-بافلوف. آسیا تختار. دار التقدم موسکو ص: ٢٦١.

چینایەتی‌و نیشتمانیدا کردە پێناوی رزگاری‌و ئازادی، لە شکست بەولاوە چیدیکەیان نەهێنایەدی.

سیاسەتی گەشەکردنی ناسەرمایەداری زیانەکەی زیاتر لەناو بزووتنەوەی کرێکاران‌و لەناو دەروونی حیزبە کۆمۆنیستەکان‌دا لەو وڵاتانەی وردەبۆرژوا حوکمی سیاسی دەکردن، کاری نالەباری کردە پاشەڕۆژیان، بەڵام وەکو دی، کەمتر لەناو خەباتی رزگاریخوازانەدا تیژەکە جێگیر بوو. سەیریش ئەوەیە وردە بۆرژوای حوکمران ئەم سیاسەتە ریڤیژیۆنستیەی لەلایەکەوە بۆ مسۆگەرکردنی پشتیوانی شوورەوی‌و دەوڵەتانی هاوپەیمانی بەکارهێناو لەلایەکی دیشەوە لەناو خۆیشیدا مەترسی کرێکاران‌و بەرهەڵستی حیزبە کۆمۆنیستەکانی لەسەر نەخشەکانی خۆی کاڵکردەوە. کەچی لەناو میللەتانی داگیرکراوی ئیمپریالیزمدا ڕێبازی گەشەکردنی ناسەرمایەداری ئەگەر لەلایەن حیزبە پرۆ شوورەوییەکانیشەوە پێڕەوی لێکراهێت ئەوا وردە بۆرژوای میللەتلنی ژێردەستە بەهۆی هەڵوێستی رزگاریخوازانەی نەتەوایەتیەوە کە لە ناوەڕۆکدا هەڵوێستی سەرکەوتنی پاشەڕۆژی چینەکەیانە، زۆر کەمتر گوێیان دەدا بەرێبازەکەو بگرە بەهۆی پێڕەوکردنی ئەو ڕێبازە هێزە وردە بۆرژواکان توانیان حیزبە بەناو کۆمۆنیستەکان بخەنە پەراوێزی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەو خۆیان پێشەنگەکەی داگیربکەن. لەتەواوی ئەو وڵاتانەی وردە بۆرژوا توانی داگیرکەران دەربەڕێنی‌و بە خەباتی چەکدارانە یان ڕاپەڕین یاخود کودەتا سەرکەوێ، حیزبە بەناو کرێکارییەکانی کە کۆنترو خاوەن شانازی مێژوویی گەورەتریش بوون، بوونە چەپڵەلێدەر بۆ هێزە بۆرژوازییەکان‌و ئێستاش تەپەی پاش ڕووداوەکانیان دێت: عیراق، جەزائیر، میسر، سۆمال، ئەنگۆلا...تاد. لە نموونە زەقەکانیانن. ئەمەش باشترین بەڵگەیە کە وردە بۆرژوا بۆ بەرژەوەندی چینایەتی خۆپەرستانەی کە لەسەر حوکم‌دابێ تیژەکە دەسەلمێنێ‌و کە لەسەر حوکمیش نەبێ نایسەلمێنێ. نەک لەپێناوی سۆسیالیزم کە دەویسترا بە زۆری زۆرداری لەو قاڵبە بدرێ. نەشدرا. بۆ ڕاستی زیاتری ئەم ڕاستیەش دەبینین هەمان هێزی وردە بۆرژوایی میللەتانی داگیرکراو کە تیزی گەشەکردنی ناسەرمایەداری لەژێر دەستەییدا قەت پێڕەو ناکات، کە دێنە سەرکار بە ئاسانی پێڕەوی لێدەکەن چونکە: کەژێردەستە بن سەریان‌ناخات‌و کە سەریش کەوتن سەرکەوتنەکەیان لە بەرامبەر کرێکارانی شۆڕشگێڕدا دەپارێزرێ. ترسی گەشەکردنی ناسەرمایەداری لەمەدایە. وا ئێستاش دەبینین تەواوی ئەو وڵاتانەی یارمەتی ئاراستەی سۆسیالیستی دەدران هاوپەیمانی ئابووری‌و سیاسی

سەرمایەدارانن، بەڵکو زۆربەیان بەتوندی دژی کرێکارانو سۆسیالیزمن. شۆڕشو شۆڕشگێڕێتیش لەناو کرێکارانو ئەو میللەتانەدا دووچاری شێواندنێکی قووڵ هاتوون*.

ئەنجامیش: شورەویو ئەو دەوڵەتانەی ئۆروپای ڕۆژهەڵات کە جارێ لەسەر ئەو سۆسیالیزمەی باوەڕیان پێیەتی (نەک ئەوانەی وازیان لێهێنا) لەدوای کرێکارانو گەلانی وڵاتە ڕزگاریخوازەکان کە گەشەکردنی ناسەرمایەداریان پێ ڕەوا دەبینرا. بەهۆی شکستی ئەو سیاسەتەوە زیانیان وێکەوت. ئێستا ئیمپریالیزم بەجۆرێک گەشەکردنە ناسەرمایەدارییەکەی کرد بە گەشەکردنی سەرمایەداری ڕاستەقینە، هەرگیز لە مێژوودا بەم چەشنە تۆکمەیە ئیمپریالیزم:

بازاڕی دابین نەبووە، کاڵای نەفرۆشراوە، سودو سوی زۆر نەکردووە، لەوەش زیاتر کەم تەنگوچەڵمەی ئابووریو سیاسیشە. هەربۆیە دەبینین لەهەموو کاتی زیاتر کەوتۆتە وێزەی فەلسەفەی کرێکارانو ژارئاژنی دەکات، سەرباری ئەوانەش بوونەتە ئاڵاهەڵگری دیموکراسیو ئازادی. بۆ پشتیوانی بۆچوونەکانیشیان، دیکتاتۆریەتی ستالینو نەبوونی دیموکراسی لە شورەویو دەوڵەتانی مانەندی دەکەنە دەسکەلا. ناحەقیشیان نییە. پاش ٤٤ ساڵ بە حیساب لە دامەزراندنی سۆشیالیزم لە ڕۆمانیادا میللەتەکە دژی سەرکردە کۆمۆنیستەکان بەجۆرێک ڕاپەڕین، دەستبەجێ ڕێبەرەکەیان (شاوشیسکۆ)ش دەکوژن، تەنانەت ڕێگەنادەن گۆڕی خۆیو ژنەکەیشی لە وڵاتەکەدا بێنن.

لەبەرامبەریشدا... (جیمی کارتەر) کۆنە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناوبژیوانی خۆی دەکاتە ناوەندی گفتوگۆی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەریتیریاو ڕژێمی ئەسیوپیا بۆ وەرگرتنی مافی چارەنووسی گەلی ئەریتیریا! ئەمە لەکاتێکدایە فڕۆکەو تانکو بۆمبو تۆپە قورسەکانی شورەوی بەخەستی خەریکی بۆردومانی میللەتو پێشمەرگەکانی ئەریتیریان، هەتا بتوانن لەڕێی یارمەتیدانی (مەنگیستۆ ماریام)ەوە سۆسیالیزم بەبێ پێوانی قۆناخی سەرمایەداری دامەزرێنن!

ئەو تیزانەی خرۆشۆف، جگەلە زیانە ئایدیۆلۆژیو سیاسیەکەی، زیانی تیۆری کاریگەریشی لە بزووتنەوەی ئینتەرناسیۆنالیزمداو لەوساوە هەتا ئێستا

---

* دوای چاپی یەکەمی ئەم کتێبە، بەمەنی دیموکراسی کە کرابووە نموونەی دیموکراسی شۆڕشگێڕو گەشەکردنی ناسەرمایەداری، بەزۆرو لەگەڵ یەمەنی بۆرژوازیدا یەکی گرتەوە.

ئینتەرناسیۆنالیزم دووچاری قەیرانێکی قووڵ هێندراوە. لەدوای ڕووخستنی تیزەکان، چینو ئەلبانیا بە توندی هەڵوێستیان دژی وەرگرتو ناکۆکیەکی دژوار لەنێوانیاندا تەقیەوە. ئەمە لەسەر ئاستی جیهانیش، لەناو کرێکارانو حیزبە کرێکاریەکاندا ڕەنگی تیۆری دایەوەو زۆری نەخایاند ئەوحیزبانەی لەسەر بزووتنەوەی ئینتەرناسیۆنالیزم ماڵ بوون، بوونە دوو ئاقارو جەمسەری هەردوو ئاقارەکەش شورەوی‌و چین بوون. ماوەیەکی زۆر چین وەکو پێشەنگی ڕێبازی شۆڕشگێرانەی گەلان لەناو زۆربەی چەپەکانی جیهاندا ناسران. بەتایبەتی لەناو گەلانی داگیرکراوی رزگاریخوازدا:

- ئەوکاتەی شورەوی هاوژینی هەمیشەیی لەتەک سەرمایەداری‌دا هەڵبژارد، چین دروشمی لەناوبردنی ئیمپریالیزمی بە درێژەپێدانی جەنگی شۆڕشگێرانە بەرزەکردەوە.

- کە شورەوی گەشەکردنی ناسەرمایەداری دەکردە پێناوی وڵاتانی ژێردەستەی پەرەسەندو، چین ئاڵای شۆڕشی درێژخایەنی لە جیهانبینینی ماویزمەوە دەشەکاندەوە.

بێگومان ئەو دوو جیهانبینینە سەراپا جیاوازن. ئەودەمەش نە ئاستی تیۆری خەڵک بەرزو نە ڕاستیە سیاسیەکانیش بەم چەشنەی ئێستایان دەزاندران. چینیش هێشتا بەهۆی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی بەدەستی هێنابوو، پایەیەکی کاریگەری هەبوو لە جیهاندا، بگرە زۆر خۆشەویستیش بوو. هەربۆیە کە هێشتا کێشەکانی چین نەتەقیبنەوە، ڕاستیەکان نەزاندران، ئاستی هۆشیاری تیۆری نزم بوویی، مونازەرە (پۆلێتن) بایەخی نەدرابێتێ کەواتە پرۆسەیەکی سروشتیە چین بتوانێ لەبەرامبەر شورەویدا ڕاوەستێ‌و ببێتە جەمسەر. کاریگاتە سەر چەپەکان‌و چەپیشیان لە دووردا کۆبێتەوە.

مێژوو پشویەکی دێژی لەبەرامبەر ئەوکێشانەدا هەبوو، ساڵەهای ساڵ نەوکێشانە، مشتومڕەکان بۆچوونە چینایەتیە جیاوازەکان کە دوور لە لۆژیکیش مامەڵیان لەگەڵدا دەکرا، ڕەوتی ڕووداوەکانیان شێواندو ڕاستیە بابەتیەکانیان چەواشەکرد.

## ٢/٥- ماو: شۆڕشی هەڵگەڕاو

پێشتر ڕۆشنمان کردۆتەوە کەوا، ماو باڵی چەپی شۆڕشی درێژخایەنی ناو حیزبی کۆمۆنیستی چین بووەو سەرکەوتووانەش تیۆری شۆڕشەکەی گەیاندە

سەرکەوتن بکرە-کاریکردە سەر بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی میللەتانی ژێردەستەو چەپەکانیش. ئەو سەرکەوتنەی لەچیندا هێندرایەدی، هیچ نەبێ لەرووی سیاسی‌و عەسکەری‌و ئابورییەوە زیانێکی مێژوویی‌دا لەکۆنەپەرستانی چین‌و ژاپۆن‌و ئیمپریالیزم. هەربۆیە بەهەموو توانایەک دژایەتی شۆرشەکەیان دەکرد.

هەمیشە هەموو میللەتاندا، میللەتان هێندە رقیان لە داگیرکەرانە، هێندە پەرۆشی رزگاری‌و سەربەستین، ئەگەر رێبەرایەتی پێشرەویشیان نەبێ ئامادەن رێبەرایەتی بورژوایش قبول بکەن‌و بۆ دەرپەراندی داگیرکەرانیان، قوربانی بێ‌ژمارەش بدەن. ئەمە حالەتێکی سایکۆلۆژی هاوبەشی تەواوی میللەتلنی ژێردەستەیە وا ئاوێتەی هەستە نیشتمانی‌و نەتەوایەتیەکە دەبێ هەموو رێبەرایەتیەک، تەنانەت هی خێڵەکی‌و دواکەوتوویش دەتوانن لە هەلکەوتەی سیاسی خۆیدا سودی لێوەربگرن‌و بۆ بەرژەوەندی چینایەتیان بیقۆزنەوە. نمونەی زەقی ئەم راستیەش زۆرن، دوور نەرۆین کوردستان بەلگەی زیندووی بەردەستە. کە بەداخەوە لە سودی بورژوازیەت‌و لەزیانی کرێکاران، یەکێک لە زیانەکانی ریڤیژنیزم لە ولاتانی دواکەوتوودا، دەرک نەکردنیانە بەو-راستیەو گوێ نەدانیانە بە خەباتی نەتەوایەتی.

ماو و هاورێکانی، جگەلەوەی دواکەوتوو نەبوون لە زەمانی خۆشیاندا کە ئالای رزگاریان بەرز کردەوە ریڤیژنیزنیستیش نەبوون، جگەلەوانە ماو زرنگانە دەرکی بەئەرکە نیشتمانیەکان کردو ئالاکەی شۆرشگێرانە دژی داگیرکەران‌و کۆنەپەرستان‌و بالی راستەرەوی حیزبەکەی بەرزکردەوە. زیاتر لەوەش لەهیچ جۆرە تۆمەتی نەپرێنگایەوەو بە کردەوەش کەوتە پیادەکردنی رێبازەکەی. ئەمە لەکاتێکدا تەنانەت ستالین‌و لەناو کۆمینترنیش‌دا، بۆچوونی جیاواز لەسەر رۆلی حیزبی کۆمۆنیستی چین هەبوو. لایان مەبەست بوو حیزبەکە لەناو حیزبی کۆمینتانگ‌دا بمێنێتەوەو درێژە بە خەباتی هاوبەش‌و پێشخستنی کۆمەلایەتی هەتا رەخسانی شۆرشی کۆمەلایەتی بدات.

کە حالو حالەتەکەش وابوویی‌و زیاتر لەسێ سەد ملیۆن خەلکی ئەوسای چین، لە ژیانێکی کولەمەرگی‌و کوێرەوەری‌دا ژیابن، دیارە رێبازی ماو دەبێتە رێبازی زۆرینەی بزووتنەوە گەلییە جۆشخواردووەکان. رێبازەکەش وەنەبێ هەرمەکی دارێژرابێ‌و کوێرانە پێرەوی کرابێ، بەلکو بۆ زەمانی خۆی‌و لە زەمینە کۆمەلایەتیە چینیەکەدا ئەوپەری پێشکەوتووش بووە: «کە شۆرشمان بوویێت دەبێت پارتیەکی

شۆڕشگێڕمان هەبێت، بەبێ پارمەتیەکی شۆڕشگێڕ بەبێ پارتیەک کە بەپێی تیۆری شۆڕشگێڕانەی مارکسی لینینی دامەزرابێت، لەتوانادا نییە ڕابەری چینی کرێکارو جەماوەری فراوانی گەل بکرێت بۆ سەرکەوتن بەسەر ئیمپریالیزم‌و نۆکەرەکانیدا .<٢.>

ماو: بەوشێوەیە ڕێنوێنی تیۆری خەباتە رزگاریبەکەی نواندووەو خەڵکی گۆشکردووە. ئیدی چۆن خەڵکی لەگەڵدا نابێت. خەڵکیان هەتا سەرکەوتنیش لەگەڵ بوو. حیزبەکەش بەڕاستی جڵەوی خەباتەکەی بە دەستەوە گرتبوو، توانی بەرگەی دژوارترین قۆناخەکانی خەباتیش بگرێ‌و دوژمن ببەزێنێ. دەسەلاتیش بگرێتە دەست.

لەوکاتەوەی، باڵی چەپی حیزبی کۆمۆنیستی چین دەستیدایە خەباتی چەکدارانە، لەقۆناخی بەرهەڵستی‌و لەڕێڕەوی خەباتی شۆڕشگێڕانەدا، هەتا سەرکەوتن توانی هێزێکی شۆڕشگێڕی خەڵک بێت، بەلام کە گەیشتە ئاکامی سەرکەوتن‌و مەیدان بۆ بەدیهێنانی بە کردەوەی بەرنامە کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و سیاسیەکانی چۆڵ بوو، ئیدی لەوساوە ئەو کێشانەی لە قۆناخی خەباتی بەرهەڵستیدا، بەهۆی زاڵی دوژمن‌و پەرۆشی ئازادی خەڵک پاش ئازاندرێن‌و دەرناکەون، بەرەبەرە دەرکەوتن‌و لەگەڵ کێشە نوێکانی پاش سەرکەوتن، دەیگوشین‌و گەوهەری ئایدیۆلۆژی دەردەخستن. گوشین‌و دەرکەوتنی ئەم گەوهەرەش، هەروا زوو ساغ نەکرانەوە. بگرە لە خەڵکیش دەشاردرانەوە. یەکێک لە هۆ گرنگەکانی دەرنەکەوتنی ڕاستیە تیۆری‌و جیهانیەکانی حیزبی کۆمۆنیستی چین، ریفیژنیزمی ستالین‌و خرۆشۆفە کە چین ساڵەهای ساڵ ستالینی بە پێشەوایەکی مەزن دەزانی‌و ریفیژنستیەتی خرۆشۆفیش هێندە ترسناک بوو، هەڵوێستی بەرهەڵستی لێکردنیان لەلایەن چینەوە کارایبەکی گەورەی هەبوو، واتە حیزبی کۆمۆنیستی چین ماوەیەکی زۆر گیرۆدەی لافی شۆڕشگێرێتی ستالین بوون‌و لەبەرامبەر خرۆشۆفیشدا، بەدەستەبەری سەرنەکەوتنی ریفیژنیزم زاندران. ئەمەش پایەی سیاسی‌و تیۆری ئەندێشەی ماوتسیتۆنگی بەرز ڕاگرت، بەلام: لەژیانی کۆمەلایەتیدا لەناو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەدا زۆرجار هەڵەی سیاسی‌و عەسکەری، لۆجستیکی‌و دارایی، سایکۆلۆژی‌و ڕۆشنبیری، بایی خۆیان زیانێکی کەم، یان زۆر دەگەیەنن‌و دەتواندرێ زووش هەستیان پێبکرێ‌و

<.٢> چەپکێ لە قسەکانی سەرۆک ماوتسی‌تۆنگ. کتێبخانەی بیری نوێ. بەغدا ١٩٧٣ ل: ١.

لەرەبووش بکرێنەوە، بەڵام هەڵەی تیۆریو ئایدیۆلۆژی وانین. هێڵەو ڕاستیەکانیان زوو دەرناکەون. بگرە ماوەیەکی دوورو درێژیش دەبنە سەرچاوەی هەڵەی دیکەش. هەموو حیزبەو دەوڵەتو گروپو کەسێک، ئەگەر تۆزێک نەرم بێتو هەڵە لەبەرامبەرەکەی بسەلمێنێ، بۆی هەیە بە ئاسانی هەڵەی لابەلا ڕاست بکاتەوە. بەڵام بۆ مەسەلەی تیۆریو ئایدیۆلۆژی وانابێ، ئەگەر زۆریش نەرم بێت هێشتا گرانتر لە هەڵە لابەلاکان هەڵەی تیۆریو ئایدیۆلۆژی ڕاستدەکاتەوە. چونکە ئایدیۆلۆژیەت: بڕوایە. بڕواش زوو دروست نابێو زوویش دەستی لێ هەڵناگیرێ. لەپاش تەقینەوەی کێشەی ئایدیۆلۆژی لەنێوان شورەویو چیندا، شۆڕشگێڕانی جیهان دووچاری کێشەی هەڵنسەنگاندنی بابەتیانەی کێشە ئایدیۆلۆژیەکە بوون. کەم لاو کەم کەس هەبوون بتوانن سەربەخۆ، دوور لە تیۆری کێشەکە، ئەندێشەی خۆیان دابڕێژن. وێڕاش زۆر بەداخەوە هێشتا کێشەکان بابەتیبانە سەرەڕای دەرکەوتنی زۆربەی ڕاستییەکان هەڵنسەنگێندراوون. ئێستاش هەزاران هەزار تێکۆشەر گێژی ناو گێژەنگی کێشە کۆنەکانە. ناتوانن هۆشیارانە لەبەر ڕۆشنایی ڕاستیەکان سەرلەنوێ بیرێک بکەنەوە.

پێشتر باسێکی جێگۆڕکێ چینایەتییەکانی کۆمەڵمان، بەپێی دیاردە ئابوورییە نوێکان، بەتایبەتی دیاردەی باڵای ئیمپریالیزم (کۆمپانیا فرە ناسنامەکان) کرد. گوترا کە ئەم دیاردانە، جووتیارانی لە ناوەڕۆکی شۆڕشی ڕزگاری دەرهاوێشتو چیدیکە شۆڕشی ڕزگاری ناتوانێ چەشنی کۆن جووتیاران بکاتە زۆرینەی لەشکری شۆڕشی درێژخایەن. بۆرژوای نیشتمانیش بڕستی بەرەنگاری سەرمایەی ئیمپریالیزمیان لێبڕاوەو بە کاڵای سووک ناتوانن ڕێ لە فرۆشتنی کاڵای باشتری مۆنۆپۆلە مۆدێرنەکان بگرن. دەمێکیشە کراونەتە پاشکۆی لاوازی سەرمایەداری مترۆپۆلی جیهان. لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستییە ئابووریو کۆمەڵایەتییە هاوچەرخاندا ئەگەر بنچینەی ئەندێشەی مارتسیتۆنگ هەڵسەنگێنین وای لێدێت:

## ٤/٥-بەرەی یەککگرتووی چین

لەدووتوێی باسەکەدا بەزۆری باسی ڕێبازی جەنگی درێژخایەنمان کردووە کە چۆن گەیشتۆتە بنبەستو چیدیکە ڕێبازی سەرەکی خەبات لەم هەلومەرجە جیهانییەدا لەبەرامبەر تەکنۆلۆژیای هاوچەرخدا، ئیتر ناگاتە ئاکامی سەرکەوتن. مەگەر لەحاڵەتی تایبەتیو لەبەرامبەر ڕژێمی کەمتواناو ئابووری لاوازی بێ

پشتیواندا نەبێ یان لەخزمەتکردنی ڕێبازی شۆڕشگێڕانەی دیکەدا لەدۆخی تایبەتیدا پێڕەو بکرێ. بۆیە دیسان ناچینەوە ناو ئەم باسەو باسەکەیش بەزۆری ڕێبازی ماویزمی پێ ناسراوە.

بۆ سەرخستنی شۆڕشی درێژخایەن، بەرەی یەکگرتوو لە ولاتانی دەرەبەگ‌و نیمچە دەرەبەگ‌و داگیرکراودا، چەکێکی کاریگەری ئەندێشەی ڕێبەری شۆڕشی چین‌و سەرکەوتنی شۆڕشەکەشە کە پێشتر بەرەی یەکگرتوو لە ئەدەبیاتی مارکسیزم‌و لەناو خەباتی گەلاندا، باسی کراوەو هەوڵیشی بۆ دراوە. تەنانەت لە مانیفێستی کۆمۆنیستەوە تۆوی ئەم بیروڕایە بەشێوەیەکی سەرەتایی بەم شێوەیە وەشێندراوە: «کۆمۆنیستەکان لەپێناوی بەرژەوەندی‌و ئامانجی ڕاستەوخۆی چینی کرێکار تێدەکۆشن... هەروەها لەناو هەموو دەوڵەتێکیشدا پشتیوانی ئەو بزووتنەوانە دەکەن کە دژی ڕژێمی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی باون... کاریش بۆ یەکێتی‌و گونجان لەنێو حیزبە دیموکراتەکانی تەواوی دەوڵەتاندا دەکەن ‹٢١›.

ئەودەمەی مانیفێست نووسراوە باس لە (یەکێتی گونجان) لەنێو کۆمۆنیستەکان‌و باقی حیزبە دیموکراتەکان کراوە. ئەمە سەرەتای سەرەتاکانی هاوخەباتی‌و یەکێتی خەباتی کرێکاران‌و چینە ئۆپۆزیسیۆنەکانی دیکە بووە. لینینیش پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر، لەکاتێکدا شۆڕشەکە کەوتبووە بەر پەلاماری ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستان لە کۆنگرەی دووەم‌و سێیەمی حیزبدا گرنگی هاوکاری تەواوی لایەنە شۆڕشگێڕەکانی دووبات کردبووەوە. هەرچەند لینین پاش شۆڕشی ئوکتۆبەر بەتایبەتی لە کۆنگرەی دووەمی پاش شۆڕشی ئوکتۆبەر بەتایبەتی لە کۆنگرەی دووەم‌و سێیەمی ئینتەرناسیۆنالیزم (١٩ی تەمموزی ١٩٢٠) بیروڕای شوراکانی جووتیاران‌و ڕەنجدەرانی خستەڕوو، پێی‌وابوو ئەگەرچی ئەو شورایانە کرێکاریش نابن، بەڵام سووربوو لەسەر سەرکەوتنی. واتە: لای لینین ئەودەمە مەسەلەی هاوکاری‌و پێکەوە ژیانی شورای جووتیاران‌و ڕەنجدەرانی دیکە باشترین شێوەی خەباتی چینایەتی‌و سیاسی کرێکاران بوو، نەک بەرەی نیشتمانی. دەریشکەوت بیروڕای وا بۆ ئەو زەمان سەرەڕای شۆڕشی ئوکتۆبەرو هۆشیاربوونەوەی سیاسی ڕزگاریخوازانەی گەلانی ڕۆژهەڵات، جێگیر نابێ. ئەودەمە خەباتی ڕزگاری دژی کۆلۆنیالیزم لە چین، هیندستان، ئێران، تورکیا، عێراق، میسر

‹٢١› كارل ماركس ـ فردريك انجلس. البيان الشيوعي، دار دمشق للطباعة و النشر ص١: ٩٩.

و کوردستان... تاد. تەقیبوونەوە. لینین و کۆمینترن دڵنیکی گەورەیان بەو بزووتنەوانە (کوردستانی لێدەرچی) خۆش بوو کە بتوانن پایەکانی ئیمپریالیزم بەدابڕانی سامانی ئەو وڵاتانە لەمۆنۆپۆلەکان لاواز بکەن. ئیمپریالیزم لە قەیرانەکانی ناوخۆیدا بخنکێ. بەڵام لەو وڵاتانە خەباتی شۆڕشگێڕانەی چینی لێدەرچی، ئەوانی دیکە شکان. تورکیاش هەر زوو دەرکەوت چ شۆڕشێکی بۆرژوایی ناتەواوە، واتە ئەو شۆڕشە دیموکراتیە شۆڕشگێڕە نەبوو کە لینین‌و کۆمینترن کردبویانە مەرجی پشتیوانی کردنی. (هەرچەند پشتیوانیشیان هەر کردو یارمەتی کەم وێنەشیان لەو کاتەدا داوە. ئەویش دژی کرێکاران‌و کوردو گەلانی دیکە بەکاریهێنا) کە لەو شۆڕشانە شکابن، شوراکانیشیان بێگومان سەرناگرێ. پێشمان‌وایە ئەگەر لەباقی وڵاتەکانیش وەکو تورکیا، شۆڕشە بۆرژواییەکان سەریش کەوتبان حاڵیان لە شۆڕشەکەی تورکیا باشتر نەدەبوو. نموونەش پاش تێپەڕبوونی نزیکەی چل ساڵیش بەسەر ئەو ڕووداوانەدا، سەرکەوتنی شۆڕشەکانی میسرو عێراق باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستیەن. ئەمەش لەکاتێکدا دوای ئەو ماوە زۆرە لە عێراق‌و میسردا کرێکاران خاوەن چینی خۆیان‌و بزووتنەوەی چینایەتین‌و حیزبیش بەناوی کۆمۆنیستەوە بوون چ جای شۆڕشی بۆرژوایی پێش چل ساڵ سەرکەوتبا. هەرچەندە دەتواندرێ بگوترێ لە وڵاتێکی وەکو عێراق‌دا کە شۆڕشی بۆرژوایی کرا بزووتنەوەی کرێکاران‌و زەحمەتکێشان هێندە بەهێزو هێندەش لە دەوری حیزبی (شیوعی) عێراق کۆبوونەوە دەیانتوانی شێوەیەکی گونجاوی شوراکان لەگەڵ دۆخی کۆمەڵایەتی عێراقدا پێکەوەبنێن‌و هەر حیزبێک خاوەنی ئەو جەماوەرەش بێ کە حیزبی ناوبراو لەپاش شۆڕشی بۆرژوایی (١٩٥٨) هەیبوو لایەنی کەم دەیتوانی وابکا بۆرژوا وا بەئاسانی لە دیموکراسی هەڵنەگێڕێتەوەو زۆرترین ئەرکی قۆناخەکە دابین کرابا، بەکێشەی نەتەوایەتی کوردیشەوە. بۆلشەویکەکان لەیەکەمین هەڵبژاردنی شوراکاندا زۆربەی دەنگیشیان نەهێناو نەیارو دوژمنیشیان زۆر بوو، بەڵام چونکە ڕێبەرایەتی لێبڕاویان هەبوو، هەروا بەرنامەی دیموکراسی لێبڕاویان هەبوو بۆیە ئاکام زۆرینەی کرێکاران‌و زەحمەتکێشان‌و خودی شوراکانیشیان ڕاکێشاو سەریشکەوتن.* کە لینین باسی پێکەوەنانی شوراکانی لەوڵاتە ژێردەستەو

---

* مخابن دوای سەرکەوتنی لینین‌و بۆلشەویکەکان بەرنامە دیموکراسیەکەیان زوو پێچایەوەو بەمەش بناغەی شکستیان دارشت.

دواکەوتووەکاندا کردووە، سێ مەبەستی هەبووە:
- فۆرماسیۆنی شوراکان بکاتە چەکی دەستی شۆڕشگێڕەکان بۆ ئەوەی بۆرژوازی میللەتانی ژێردەستەو توێژە کۆنەپەرستەکان نەتوانن بە دروشمی چەواشەی ناسیۆنالیستی‌و نیشتمانی دیکە، کرێکاران‌و زەحمەتکێشان فریو بدەن.
- ئەو شورایانە بکرێنە دەستەبەری بەرەبەرەی پەرەپێدانی خەباتی شۆڕشگێڕانە بۆ ئەوەی کرێکارانی ڕوو لە گەشەکردوو بتوانن خاوەن دەسەڵاتی سیاسی ئوتۆپین لە پاشەڕۆژدا تەواو سەربکەون.
- لەخەیاڵی لینین‌دا شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەسەدا سەد سۆسیالیزم سەردەخات‌و شۆڕشی سۆسیالیستیش لە جیهاندا ڕوو دەدات. بەپشتیوانی ئەم شۆڕشانەش شوراکانی میللەتانی ژێردەستە دەتوانن شوراکانیان بگەیەننە ئامانجی شۆڕشگێڕانە.

بەداخەوە هیچی ئەوانە نەهاتەدی! چینی بۆرژوا لە ڕۆژهەڵاتدا سەرکەوت. کرێکارانیان کردە پاشکۆی ڕووداوەکان. ئەو حیزبانەی بەناوی کرێکارانیشەوە هەبوون‌و بەهێزیش بوون لەباشترین هەڵکەوتی جەماوەریشدا کە بۆیان هەڵکەوت نەیانتوانی نەک شورا بۆ کرێکاران‌و میللەتەکانیان بگرە شورایەکی ڕێک‌وپێکیان بۆ حیزبەکانیشیان پێ پێکنەهێندرا. لەبری شوراکان ڕێگای ڕیفۆرمو پاشان بەرەی نیشتمانی گیرایەبەر. بەرەی نیشتمانیش بە چەمکە زانستەکەی زیاتر لە هەلومەرجی مەترسی بەرپاکردنی جەنگی جیهانیی لەلایەن کۆمینتەرنەوە بۆ وڵاتانی ژێردەستە کەوتۆتە ئارا. ئەگەرچی جاروبارێش پێشتریش حیزبە کرێکاریەکانی دیکە باسیان لێوەکردبێ بەڵام وەکو تیۆری بەرەی نیشتمانی کۆمینتەرن دایهێناوە... ئیدی لە وڵاتانی وەکو عێراق‌و مانەندەکانیان کە حیزبی شیوعییان تێدابووە دروشمی بەرەی نیشتمانی بەرزکرایەوە بۆ کۆکردنەوەی چینەکان دژی مەترسی نازیزم بەتایبەتی لەدوای پەلاماردانی شورەوی.

ئیتر بەرەی نیشتمانی دوای جەنگیش بوو بەپێناوی حیزبە ئۆپۆزیسیۆنەکان، لەوانە حیزبە شیوعییەکانیش. ناوی شوراکان‌و... دیموکراسی شۆڕشگێڕ ئەسڵەن نەدەهێندران. لەڕاستیشدا شوراکان‌و دیموکراسی شۆڕشگێڕ ئامرازی سیاسی شۆڕشگێڕانەی پرۆلیتاریا بوون دژی ئامرازەکانی بۆرژوا لەناو خەباتی نیشتمانی-دیموکراسی‌دا. بەتایبەتی بۆرژوا دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو بەرزکردنەوەی دروشمی دیموکراسی شۆڕشگێڕو شوراکان بۆ میللەتانی ژێردەستە*... زۆرتر لە قۆناخی پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر مەترسیان لەخۆیان پەیدا کردو کەوتنە

توندتر دژایەتیکردنی کرێکارانو کۆمۆنیزم. واتە: بۆرژوای میللەتانی ژێردەستەو داگیرکراوی پێشو پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر دوو ڕوانگەی جیاوازیان لەسەر کرێکاران هەبووە خۆ کە خەباتی کرێکاران پەرەیسەندو مارکسیزم بەتەواوەتی لەڕۆژهەلاتدا بلاوبووەوە ئەم مەترسیە گەورەترو ترسناکتر بووە. ئەم ڕاستیە لەسەر بۆرژوا نەک وەکو بنەمای ئابووریو نە وەکو ڕاستیەکی سیاسی ئەسلەن لەبەرچاو نەگیراوە. بۆیە تاکە حیزبێکی چینایەتیش لە ڕۆژهەلاتدا نییە زانیبێتی، بۆرژوای نیشتمانی لە ڕوانگەی چینایەتی شۆڕشگێڕانەوە هەلبسەنگێنێ. هەمیشە وەکو چینێکی دژ بە ئیمپریالیزم تەماشا کراوونو بەپێی ئەم ڕاستیەش داوای هاوکاریو بەرەی نیشتمانیان لەگەلدا کردوون. کەداوای بەرەشیان لەگەلدا کردوون لەبەرئەوەی حیزبە شیوعیەکان ئامانجی ڕوخاندنی ڕژێمە کۆنەپەرستەکانیان نەبووەو دروشمی هاتنەسەرکارو بەرنامەی لایەنی کەمی دیموکراسی شۆڕشگێڕیان نەبووە، بۆیە بایەخیشیان بەوە نەداوە (بەرەی نیشتمانی) دەبێ نوێنەری سیاسی کام چین ڕێبەرایەتی بکات. ئەوان کە هاتنە سەرکاریان نەکردبێتە پێناو، شتێکی سروشتییە ڕێبەرایەتی بەرەش نەکەنە ماکی سیاسەتەکانیان، چونکە بەرەیان بۆ حوکم نەویستووە.

لە چیندا، لەسەرەتای شۆڕشەوە هەولی پێکهێنانی شوراکان بەپێی ڕێنوێنی کۆمینتێرنو باوەڕی سەردەمەکە درا. توانای زۆریشی بۆ تەرخانکراو ڕێو شوێنی چۆنیەتی کارپێکردنیشی داڕێژرا بەلام کە شۆڕشی بۆرژوایی کۆدەتای کۆنەپەرستانەی کرایەسەرو بە شۆڕشی چەکداری درێژخایەن درێژە بە شۆڕشەکەدرا، شوراکان بەوپێیەی لە شورەوی چووەسەر، لە چیندا نەچووەسەر. هۆیەکەشی جیاوازی چۆنایەتی تەواوکردنی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسی بوون لەو دوو ولاتەدا: شورەوی لە شارو چین لە شاخدا.

شۆڕشیش کە سەنگەرەکانی لە شارەوە گواستەوە بۆ شاخ، جۆرێک لەو شورایانە لەناو جووتیاراندا هەولی بۆ دراو هێنرا. بەلام ئەو فیدراسیۆنە کۆمەلایەتییە ڕێبەرایەتی حیزبی کۆمۆنیستی چینیش کە دلسۆزی لینینیزمو پیادەکەری بڕیارەکانی کۆمینتێرنیش بوون، وەکو شورەوی بگرە بە ئەندازەی چارەکێکی شورەویش سەری نەگرت. باری بابەتی ولاتی چین، پێکهاتنی چینایەتی

↔ * چەمکی دیموکراسی شۆڕشگێڕ ئێستا پاساوی نەماوە.

چین‌و ئەو بزووتنەوە چەکدارییە درێژخایەنە پێویستی بە بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو هەبوو، چ بۆ خەباتکردن دژی ژاپۆن، چ بۆ دوورخستنەوەو خستنەگەڕی هێزە نیشتمانپەروەرەکانی چین لە کۆمینتانگ بۆ دژایەتی کردنیان لەبەرئەوەی: چین ولاتێکی داگیرکراوی نیمچە دەرەبەگ بوو، هەر بۆیە هەرچوار چینەکەی کۆمەڵی چین (کرێکاران جووتیاران، بۆرژواو بۆرژوای گچکە) لە ڕووی بابەتییەوە لەبەرەی گەلدا دژی بەرەی کۆنەپەرستانەی دوژمنان بوون. بەرەی نیشتمانی سەرکەوتنی باشی لەو زەمینە کۆمەلایەتی‌و زەمانە سیاسییەدا هێنایەدی. دوای ئەوەش لە ولاتانی ماننەدی چین هەمان ڕێبازی سیاسی قازانجێکی گەورەی گەیاندە خەباتی ڕزگارییان‌و شێوەیەکی شۆڕشگێڕی خەباتەکەیان بوو. لەکاتی جەنگی دووەمیشدا هەمان ئامرازی سیاسی لە جیهاندا بە تایبەتی لە ئەورووپای ڕۆژهەلات‌و هەندێ لە میللەتانی ژێردەستەدا وەکو عێراق، میسر، جەزائیر، یەمەن، ئێران‌و سوریا...تاد. کە ڕێبازی جەنگی درێژخایەنیشیان پێڕەو نەدەکرد، بەچاکی لەگەڵ ڕەوتی خەباتی نیشتمانییاندا گونجا.

ئاخۆ: بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو هەتا ئێستاش سەرەڕای گۆڕانکارییە ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌و سیاسییەکان، سەرەڕای جێگۆڕکێی چینایەتی بنەڕەتی جووتیاران‌و خیانەتی بۆرژوای نیشتمانی سەرەڕای بەدیهاتنی کۆمەڵێک لەو ئامانجە سیاسی‌و چینایەتییانەی کاتی خۆی ئەرکی چینایەتی ناوکۆییان لەڕێی بەرەوە دەهاتەدی... ئاخۆ پاش گۆڕان‌و گۆڕینی زۆربەی ئەو دیاردەو دەرکەوتانە بەرە هێشتا وەکو جاران چەکی بنچینەیی چینە پێشکەوتنخوازەکانی گەلانە یان ئامرازی سەرەکی تەواوکردنی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسییە، بێگومان نەخێر.

هەر ئامرازێکی سیاسی کرێکاران‌و گەلان، بنەمای ئابووری کۆنی نەمێنێ، پاساوی تیۆریشی نامێنێ. لێکدانەوەی سیاسی بۆ دیاردە سیاسییەکان ئەگەر نەبەسترێتەوە بە بنەما ئابوورییەکان، وەکو هەورە هاوینە وایە، پرشە بارانیشی لێ‌داپکا نابێتە هۆی پەڵەدانی زەوی خەبات. لەبەر ئەو ڕاستییانە سووربوونی (مار)یەکان لەسەر تەلاری سیاسی بەرەی نیشتمانی بەناو میللەتانی داگیرکراودا کە ئێستا پێوەندی سەرمایەداری زاڵە تیایاندا (نەک دەرەبەگایەتی یان نیمچە دەرەبەگیش) جۆرێکە لە دۆگماتیزمی سیاسی زیانبەخش کە پێویستە بە هۆشیاری تیۆری بەرپەرچ بدرێتەوەو لە ڕوانگەی بەرسەندنی ڕووداوەکانەوە هەڵبسەنگێنن.

ئەگەرچی بزووتنەوەی پڕ لە کێشەی سیاسی-عەسکەری میللەتانی

ژێردەستەی وەکو: کورد، بلوچ، ئازەری، ئەرمەنی، ڕێکخراوە مارکسیەکان دووچاری تەنگوچەڵەمەی سیاسی دژوار هاتن، وردە بورژواو نوێنەری توێژەکانی دیکەیش دژی دوژمنی هاوبەش لەسەر هەندێ ئامانجی سیاسی ناوکۆیی لە خەباتدا بوون، ئەوا پێویستە مارکسیەکان ئێستاش وەکو هەمیشەی پێشووی خەباتیان شێوەی هاوکاری نوێی خەباتیان لەگەڵدا بهێنن‌و بەرەی گەل دژی بەرەی دوژمنی بێ هێزتر بکەن بەمەرجێک لەهەموو حاڵەتێکدا هەر شێوەیەکی گونجاوی خەباتی شۆڕشگێڕانە بدۆزنەوە.

### ٥/٥- دیکتاتۆریەتی چوار چینی... چینی!

دیکتاتۆریەتی چوار چینی کۆمەڵ، گەوهەری دیموکراسی نوێی شۆڕشی چینە. ئەم تێزەش لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بەراستی نوێ بوو بگرە ڕێبازێکی سیاسی نامۆ بوو لە ئەدەبیاتی بزووتنەوەی مارکسیزم-لینینزمدا. ماوتسیتۆنگ، تیۆریسێنی ڕێبازەکە لە ڕوانگەی باری کۆمەلایەتی چینەوە وەکو وڵاتێکی داگیرو نیمچە داگیرکراو، ئەندێشەی دیموکراسی بزووتنەوەی تەواوی ئەو میللەتانەی باری کۆمەلایەتی‌و دۆخی سیاسی‌و هەلومەرجی مێژووییان هاوچەشنی چین. لەبنەڕەتیشدا بیروڕاکە وەکو ڕێبازی سێیەمی دیموکراسی لەبەرامبەر دوو ڕێبازە دیموکراسیەکەی پێشتردا:

- دیکتاتۆریەتی کۆماری دیموکراسی بورژوا.
- دیکتاتۆیەتی کۆماری پرۆلیتاریا «

داڕێژرا ....

هەڵبەتە: جۆری یەکەمی دیموکراسی کۆنینەو جۆرەکەی دووەمیش هی وڵاتی شورەوی بوو. سێیەمیش ماو دەڵێ: «بەڵام جۆری سێیەم شێوەیەکی گوێزراوی دەوڵەتە کە پێویستە شۆڕشی وڵاتانی کۆلۆنی‌و نیمچە کۆلۆنی پێڕەوی لێ‌بکەن. دیارە هەموو شۆڕشێک لە شۆڕشەکانی وڵاتانی کۆلۆنی‌و نیمچە کۆلۆنی بە هەندێک تایبەتمەندێتی دەناسرێن، بەڵام ئەم تایبەتمەندێتییانە جگەلە جیاوازی سادە لەچوارچێوەی وێکداچوونا چیدیکە نییە. مادام شۆڕشەکان شۆڕشی وڵاتانی کۆلۆنی‌و نیمچە کۆلۆنن لەسەدا سەد پێکهاتنی دەوڵەت‌و پێکهاتنی دەسەلاتی سیاسی لەم وڵاتانەدا بە شێوەیەکی بنەڕەتی هاوچەشن دەبێ، واتە دەوڵەتێکی دیموکراتیکی نوێی ملکەچی دیکتاتۆریەتی هاوبەشی چەند چینی بەرهەڵستکاری

ئیمپریالیزم »<۲۲>.
کەواتە: دیموکراسی نوێ نەک بۆ چین، بەڵکو کراوەتە ئامانجی هاوبەشی میللەتانی وەکو چینیش. ئەمەیان ئەگەر لە ڕووی تیۆرییەوە زانستیانە بسەلمێندرێ‌و لەبۆتەی پراکتیکیشدا لەناو چەندین میللەتی وەکو میللەتی چینیشدا ڕاستیەکەی سەلمێندرابێ، مایەی خزمەتێکی شۆڕشگێڕانەیە بەڵام ئایا وایە یان نا؟ ئەمەیان لێکۆڵینەوەیەکی دوورو درێژی گەرەکە، ئێمە لێرەدا کورتەیەک لەسەر پێچەوانەکەی باس دەکەین.
چین وەکو وڵاتانی دیکەی ژێردەستەی ئیمپریالیزم، لەڕێی ڕاستەوخۆی ئیمپریالیزمەوە سەرمایەو پێوەندی سەرمایەداری لەناویدا تەشەنەی ئابووری‌و کۆمەڵاتی سەند. بزووتنەوەی کۆنەپەرستانەش لەناو چیندا دەمێک زاڵ بوو بەحوکمی ئەوەی مەڵبەندێکی جیۆپۆلیتیکی ئیجگار گرنگەو لەڕووی (تۆپۆگرافی دیوگرافیەوە*) بایەخێکی زۆری هەیە. سنووری دەریایی‌و زەمینی بایەخداری هەیە. بۆیە لەمێژە ناوەندێکی بازرگانی گرنگ بووەو لەوساشەوە چینە داراکانی چین بەرژەوەندی ڕاستەوخۆیان وابەستەی سودو سامان کردووە. ئەو سودو سامانە لەهەر لایەک‌و لەهەر کوێیەکەوە هاتبێت باپاندا وەتەوە لای.کە ئیمپریالیزمیش دەستی وەردایە وڵاتەکە دەستبەجێ بازرگان‌و سەرمایەدارانی چین، چینی سەرمایەداری وابەستەو کۆمپرادۆریان تێدا پێکهات‌و بەمەش بۆرژوای پیشەسازی لە قاڵبدرا، هەروەکو زۆربەی وڵاتانی ژێردەستە چینی بۆرژوای نیشتمانی هێندەی لەگەڵ ئیمپریالیزم‌و دژی خەباتی نیشتمانی-دیموکراسی بوون، نیوە چارەکی ئەوە دژی ئیمپریالیزم‌و لەگەڵ سەرکەوتنی خەباتی نیشتمانی‌دا نەبوون.
لەسەرەتای نووسینی نامیلکەی (دیموکراسی نوێ)دا، خودی ماویش باسی لەسێ چین کردووە، نەک چوار چین کە زیاتر ستالین لەناو میللەتانی کۆلۆنیدا باسی چوار چینی دەکرد، پاش چاپکردنی هەڵبژاردەکانی ماو لە ساڵی ۱۹۵۱دا لەبری سێ چینی کۆمەڵ، باسی چوار چین هاتووە. کە باسیش لەو چینانە دەکات

<۲۲> ماوتسی تونغ. المؤلفات المختارة، المجلد الثاني ص:٤٨٨. دار النشر باللغات الاجنبية بكين ١٩٦٩

* تۆپۆگرافی: زەمینناسی. دیمۆگرافی: پێشتر باسێکی کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام ئێستا زاراوەی سیاسیەو کۆمەڵناسی دەگەیەنێ.

هاوبەشی بەرەی نیشتمانی بکەن. بۆ دیاریکردنی سروشتی چینایەتی، ناوی بۆرژوازیەت دەهێنیٚ نەک بۆرژوای نیشتمانی، ئەوەمە لەناو کۆمینترنیش‌دا مشتومڕی زۆر لەسەر ڕۆڵی بۆرژوای نیشتمانی هەبوو لەناو بزووتنەوەی رزگاری-دیموکراسیدا دژی ئیمپریالیزم‌و دەرەبەگایەتی. بەتایبەتی نوێنەری هیندو ئەندەنۆسیاو ئەفریقای باشوور دژی بایەخ پێدانی چینی ناوبراو بوون لەناو خەباتی نیشتمانیدا چونکە لای ئەوان ئەم چینە وابەستەی ئیمپریالیزم‌و دژی شۆڕش بوو.

گرنگترین مەسەلە لە شۆڕشدا، مەسەلەی دەسەڵاتە، دەسەڵاتی چینایەتیش لە ڕوانگەی چینایەتی جیاوازە دەردەبڕیٚ. هی کرێکار، وردە بۆرژواو بۆرژوای نیشتمانی جیاوازن. ستەمە بتواندریٚ دیکتاتۆریەتی چوار چینی ناکۆکی کۆمەڵ لەیەک دەسەڵاتی سیاسیدا بگونجێندریٚ. دەسەڵاتەکەش کۆماری دیموکراتی نوی‌و داهێندراوی کۆمۆنیستیش بیٚ.

لە دونیای سیاسەتدا بۆی هەیە جۆرێک لەتاکتیکی سیاسی بدۆزیتەوەو پێڕەویش بکریٚ. بەڵام لەڕووی ئابووری‌و ئایدیۆلۆژییەوە تێکەڵاوکردنی بەرنامەی دیموکراسی جیاوازی چینەکان لەیەک قالبی سیاسی‌و دیموکراسیدا کە دیموکراسیەتیش وەکو باقی ئامانجەکان مۆرکی چینایەتی تایبەتی خۆی هەیە، لادانە لەڕێبازی دیموکراسی شۆڕشگێڕی کرێکاران کە تەنانەت لە وڵاتانی دواکەوتووشدا ژێردەستەو نیمچە داگیرکراویشدا، بۆ شۆڕشی چین‌و هاوچەشنەکانیشی ئەگەر لە قۆناغی چەکدارانەدا بەکردەوەش نەچووبێتەسەر، بەڵام بە پروپاگەندە تیژەکە ڕاگیرابیٚ، ئەوا پاش سەرکەوتنی زوو نابات دەردەکەویٚ بەرنامەی خواروخێچی وا جێی جێبەجیٚ‌کردنی نابێتەوە. هەروەکو ئێستا چین بەدەست کێشە تیۆریەکانی کۆنەوە دەناڵێنیٚ. ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش کە هەوڵیاندا شێوەیەکی گۆڕدراوی دیموکراسی نوێی چینی کە بەوە زاندرا تایبەتە بەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی میللی، لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا بەناوی (دیموکراسی گەلی) لەپاش جەنگی دووەمی جیهان جیٚبەجیٚیان بکەن لەبەر ئەوەی لەم ئەزموونانەشدا هەروەکو چین، دیموکراسیەتەکە کە سروشتی پۆپۆلیستی ڕاستەقینەی هەبوو، سنووری چینەکانی بە پاساوی تیۆری سڕییەوە، ململانێی چینایەتیانی شاردەوە... لەم وڵاتانەشدا دەبینین بە حیساب پێشکەوتریش بوون لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات، بەرنامەی دیموکراسی جیٚبەجیٚ نەکرا، پاش ئەوەی ژیان دەورانی خۆی گۆڕی‌و گۆڕانی قوڵ بەسەر جیهان هات. دەرکەوت: ئەگەر قۆناغە کۆمەڵایەتیەکان لەڕووی ئابووری‌و کۆمەڵایەتییەوە،

سیاسی‌و ڕۆشنبیرییەوە، مێژوویی‌و شارستانیەتەوە، پێویستە ماتریالیستەکانی‌و پێداویستە مێژوویەکانی بە زیادیشەوە دابیت‌نەکرێ. هەرگیز ناتواندرێ نەبەیارمەتی دەوڵەتانی سۆسیالیزم ولاتێک قۆناخی سەرمایەداری نەبڕێ بگوێزرێتەوە بۆ سوسیالیزم‌و نە بە تیۆری تێکەڵاوکردنی چینەکان‌و شێلانی بەرژەوەندییان لە قالبی دیموکراسی نوێ یان دیموکراسی گەلیدا، دەشێ قۆناخی دیموکراسی کورت بکرێ‌و زووتر سۆسیالیزم بهێندرێتەدی. ئەو پرۆسانە لە مێژوودا باجەکەی ڕەنجی خەباتی چل ساڵ زیاتری کرێکاران‌و زەحمەتکێشان‌و گەلان بوو. دەردی قسەی باوی خەڵکی سادە: قازانجەکەیان سەری مایەشیانی خوارد. دیارە مەبەست لەمایەی تیۆری کە ئەم ئەزموونانە گوایە بەنیازی پەرەپێدانی داهێندران، بەلام شکان.

ئەو هەڵە تیۆریانە، یان با بڵێین بۆ بردنەسەری ئەو هەڵە تیۆریانە کە وەکو ئایدیۆلۆژیەتێکی نەگۆڕ سەیر دەکران، دۆگماتیزمانە خرانە بۆتەی کارو کردەوە... پاش سەرکەوتنی شۆڕشی چین، شۆڕشی سەرکەوتووی چین دووچاری ئاستەنگی ئاشکرا لە بوونی ماوتسیتۆنگ خۆید اهات.

## ٦/٥- شۆڕشی ڕۆشنبیری!!

کەم ڕووداو هەیە، پاش دیاردەی ستالینیەت بە ئەندازەی ئەم (شۆڕشە ڕۆشنبیرییە!) بایەخی درابێتی‌و باسکرابێت‌و لەسەری نووسرابێت.

کاتی بەرپاردانی شۆڕشەکە ١٩٦٦ چین‌و شوورەوی کێشەیان لەنێواندا تەقیبووەوەو ڕەنگی کێشەکەیش ڕۆچوو بووە ناو کرێکاران‌و گەلان‌و ئەو حیزبانەی ئەوسا نوێنەرایەتیان دەکردن، لەسەرێکەوە دەوڵەتی چین بەگەرمی داکۆکیان لێدەکرد. لەسەرێکی دیکەشەوە شوورەوی‌و پێڕەوانیان بەتوندی دژی بوون، لە بەرامبەریشیاندا کامپی سەرمایەداری هەلەو بۆیان هەڵکەوتبوو. چەندیان سود لە ئەزموونی دیکتاتۆریەتی ستالین بۆ دژایەتی کردنی کۆمۆنیزم وەرگرتبوو، هەوڵیاندا لەم شۆڕشە ڕۆشنبیرییەشدا زیاتر بۆچوونەکانیان لەمێشکی ڕای گشتی جیهاندا بچەسپێنن‌و دەریخەن کە سۆسیالیزم هەرگیز نایەتەدی.

شۆڕشەکە گوایە: داهێنداروێکی نوێی سەردەمی سۆسیالیزم بوو لەکاتی پەرەسەندنی ڕیڤیژینیزمداو هەڵگەڕانەوەی شوورەوی بۆ سۆسیال ئیمپریالی‌و دەستبەجێ پاش ئەو بۆچوونە چینیە، ماو گەیشتبووە ئەو باوەڕە کە پێش ئەوەی چینیش دووچاری هەڵگەڕانەوە لادان‌و بادان ببێت‌و بۆنەوەی بۆرژوا نەتوانێت

هیوای گەڕانەوە بکاتە هەوڵی گەڕانەوە سەرحوکم، هەروەها لەپێناوی ڕیشەکێش‌کردنی بیرۆکراتیەتی سەرهەڵدراوی سیستەمی سۆسیالیزم، شۆڕشی ڕۆشنبیری کراوە.

لەم شۆڕشەدا خەباتکراوە بەتەواوەتی نەریتی بۆرژوازیەت، کەلەپوورو کلتوری، ئەدەب‌و هونەری، فەرهەنگ‌و شارستانیەتی بەشێنجگارەکی ڕیشەکێش بکرێ‌و بۆ هەمیشە مەترسیەکانیان بڕەوێنەدرێنەوە. ئەگەر ئەو بۆچوون‌و بیروڕایانە داپڕاو لە ڕووداوە سیاسی‌و مێژوویەکان سەیر بکرێن، بە ئەندێشەی شۆڕشگێڕانە دێنە بەرچاو. بەلام ئەگەر بە قووڵی لێبتۆژرێنەوەو هەمەلایەنە لێبکۆڵدرێنەوە دەردەکەوێ بنەما تیۆریەکەیان بەتاڵە. ئەنجامە مێژوویەکەیشی حوکمی نالەباریان لەسەردرا. لە ئەدەبیاتی کلاسیکی مارکسیزمدا، بۆچوونی‌وا بەرچاو ناکەوێ .

دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا* لەبەرامبەر چینەکانی دیکەدا کراوەتە دەستەبەری هەڵنەگەڕانەوە لە سۆسیالیزم‌و بەدیهێنانی ئامانجە چینایەتی‌و ڕۆشنبیریەکانی کرێکاران. باپێڵێین مارکسیزم-لینینزم فەلسەفەیەکی دۆگماتیزم نییە هەتا بگوترێ: مادام لە ئەدەبیاتی کلاسیکی فەلسەفەکەدا شۆڕشی‌وا باس نەکراوە، ئیدی بۆی نیە شۆڕشی وا بکرێ. لەڕووی تیۆریەوە پەرەپێدانی فەلسەفەکە لەسەر زەمینەی ئابووری‌و زەمانی کۆمەلایەتی ڕاستەو دروستە بەلام لەو شۆڕشەی چیندا ئایا فەلسەفەکە پێش یان پاش کەوت؟

جلۆێ لەڕووی تیۆریەوە لێکدانەوەی چەمکی زانستیانەی شۆڕش، دەکاتە گۆڕینی بنەڕەتانەی کۆمەڵ، کۆمەڵیش ناگۆڕدرێ هەتا چینی نوێ، چینی کۆنی کۆنەپەرست لەناو نەبات. ئەمەش ئەوکاتە ڕوودەدات کەوا چینی کۆنەپەرست لەڕێگای پێوەندی بەرهەمهێنانی کۆنەوە ببێتە کۆسپی بەردەم هێزەکانی بەرهەمهێنان‌و ناکۆکیەکان پەتەقنەوە، ئەوسا شۆڕش دەبێتە سەرئەنجامێکی بێ ئەملاوئەولا.

لە چینی شۆڕشی ڕۆشنبیریدا وانەبووە... بەڵکو بە پێچەوانەشەوە، چینی دەسەلاتدار ئەوانەی دەزگا گرنگەکانی دەوڵەتیان بەدەستەوە بوو، ئەمانە شۆڕشیان کردووە نەک ئەمان بووبنە ڕێ لێگرتنی شۆڕش واتە: ئەوجارە مێژوو هەڵگێڕدراوە،

* دیاردەکانی ژیان‌و دەرکەوتە نوێکانی پاش جەنگی سارد، دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاشیان ڕەتکردەوە.

جاران خوارەوە دژی سەرەوە شۆڕشیان دەکرد، ئەم جارە، سەرەوەو خوارەوە دژی کەمایەتیەکی کەمبایەخ شۆڕشیان کردووە.

ماو، هێندە نفوزی هەبووە، بەئاسانیو ئاسایی دەیتوانی هەر تاقمێک، هەرکەسێک مەبەستی با، لێیان بخات. چۆنیشیان مەبەست با، دەیانتوانی نەخشەی ڕۆشنبیری بکێشنو بیچەسپێنن، کەچی هیچی ئەوانە نەکراون... تێکەوڵنیکەیەک سەری هەڵدا نەبێتەوە: سەدان هەزار کادرو ئەندام بەخۆیانو خاوو خێزانیانەوە بۆ دوورگەکان دورخرانەوەو دەیان هەزار کەس گیران، سەدان ڕێبەرو کاربەدەستی حیزبو دەوڵەت کرانە بووکە بەبارانەو لەناو سەدان هەزار کەسدا، گاڵەو گاڵتەیان لەژێرپەردەی شۆڕشی ڕۆشنبیریدا پێکراوە. ئەمە لەکاتێکدا لەو ڕێبەرو کاربەدەستانە هەبوون دژوارترین ڕۆژانی شۆڕشیان بردۆتەسەرو سەختترین قۆناخەکانی خەباتیان دیبوو، هەمیشەش مایەی شانازی شۆڕشو حیزبو دەوڵەتەکە بوون. لەو شۆڕشەدا! دەویسترا سۆسیالیزم لەسەر زەمینەی کۆمەڵایەتی دواکەوتوودا لە ولاتێکی کشتوکاڵ کە هێشتا قۆناخی دیموکراسی نەبردۆتەسەرو خەڵکەکەی ئاشنای ئەندێشەی سۆسیالیستی نەبوون، بسەپێندرێو بچەسپێندرێ. هێشتا لەو ولاتەدا، کێشەی نەتەوایەتی، پیشەسازی، ئافرەتان، نەخوێندەواری، نەهێشتنی جیاوازی شارو گوند، چارەسەر نەکرا بوون. دەشویسترا سۆسیالیزم بەزەبری شۆڕشی ڕۆشنبیری بێ بناخە بێتەدی.

باڵی توندڕەوی ناو حیزب، وەکو هەموو شتەکانی دیکە پێیان وابووە دەکرێ بەبڕیار (مادام دەسەلات بەدەستەوەیە)چۆن لەکاروباری عەسکەریدا سەرکەوتوون، ئاواش لە چەسپاندنی هەرچی زووتری سۆسیالیزمدا بەئارەزوو سەرکەون. ڕاستە دەسەلاتیان بەدەستەوە بووە، ڕاستیشە هەتا هاتووە پەرەیان سەندووەو پێویستیەکانیان دابینکردووە، بەلام هیچی ئەوانەو زیاتریش لەوانە بایی ئەوەنین سیستەمێکی کۆمەلایەتی نوێ بە ئارەزوو یان وەکو ماو لە ساڵی ۱۹۵۸دا پێشنیاری کردووە بە (قەڵەمبازی گەورە) بچەسپێندرێ کە هێشتا پێکهاتنە کۆمەلایەتیو ئابووریو سیاسیەکانی ئەو سیستەمە (سۆسیالیزم) نەڕەخسابێت. کرێکارانو زەحمەتکێشان لەڕووی چینایەتیو سیاسیو ئامادەیی سایکۆلۆژییەوە نەگەیشتبنە ڕادەی بەدیهێنانی.

ڕەنگە لەودەوڵەتە گەورەو گرانەدا، بەڕاستی هەبووبن دژی سۆسیالیزم تێکۆشابن، ڕەنگە ڕاستڕەوی زۆریشیان هەبووبن. بێگومان خەڵکانی بیرۆکراتو

کۆنەپارێزیشیان زۆر بوون بەڵام هەموو ئەوانە ئەگەر سزاش هەڵبگرن هێشتا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ تەواوی ئەوانەی هەڵوێستی جیاوازیان لەو سەرکردایەتیە توندڕەوە هەبوویێ یان وا خێرا سەپاندنی سۆسیالیزمیان بە (قەڵەمبازی گەورە) پێ ڕاست نەبوویێ یان دژی شۆڕشی ڕۆشنبیری دوابن، ئیتر هەموویان خائینو خۆفرۆش یا دژی سۆسیالیزم بوون. شۆڕشیش گوایە لەپێناوی سەرکوتانی کۆششی سەرلەنوێی بۆرژوا بەرپا کرابێ،لەناو هەموو حیزبەکەدا چەند کەسێک نەبێ بە شۆڕشگێڕو دڵسۆزی بزاندرێ، باقیان بە هەڵگەڕاوە لە سۆسیالیزمو دژی کۆمۆنیزم بناسرێن. شۆڕشی وا لەناو دەوڵەتێکدا سەدان ڕێبەرو هەزاران کادرو کاربەدەستی گەورەی بوویێ، چۆن ئەوانە دژی شۆڕشی واناین کە سەدان هەزار کەسیان بکا بەگژداو بیانکەنە داهۆڵی زەمانە. بۆنموونە با گوتەیەکی وەزیری دەرەوەی ئەوسای چین (شانئای) بخوێنینەوەو بزانین چ زوخاوێک کراوەتە ناخیانو چۆن بێ سڵەمینەوە هەڵوێست دەردەبڕێ: «بڕوانەبوون تەنیا بەسەرۆک ماوو،لین پیاوی جێگریو سەرۆک وەزیرانو شینبورتاو کانگشیانگ شینگ نەبێ واتە شەش کەسو پێنج یاریدەدەری سەرۆک وەزیرانیشیان بخەینەسەر، کەواتە هەموویان پازدە پیاو، ئایا ئەمەیە حیزبی مەزن! لە پازدە کەسی پێگەیشتوو بەولاوە کەسی دیکەی نییە؟ من نامەوێ لەسەر ئەو ڕێیە بڕۆمو ببمو پێشانی جەماوەرم بدەن <٢٣>».

وەزیری وا هەڵوێستی جوامێرانەی وادەربڕێت چۆن دەشێ بە ناپاکو دژ بە سۆسیالیزم بزاندرێ؟ ئاکام مێژوو قسەی کورتی وا بۆزێر دەنووسێو دەمێکیشە ئەوانەی (شینئای)یان ڕاکێشایە دادگای کاری کاتوری سۆسیالیزم، شەرمەزاری مێژوون.

دەرکەوت ئەوەی هەڵگیرسێنەرانی شۆڕشی ڕۆشنبیری بە ڕۆشنبیری دەرەبەگو سەرمایەدارییان لەقەڵەم دەدانو دەیانویست لەدەمو دەستێکی مێژوودا، ڕۆشنبیریو نەریتێکی پرۆلیتاریانە، بێ پێشینەی مێژوویی، بێ نەریتو کەلەپووری مرۆڤایەتی، بێ دەسکەوتە کلاسیکیەکانی ئەدەبو هونەرو کولتوورو فۆلکلۆرو سەرگوزشتەی پێشکەوتووی ڕابردوو، هەروەها بەبێ زانستو زانیاریو شارستانیەتی سەرمایەداری بینا بکەن. دەرکەوت بەبێ سوودلێوەرگرتن لەهەموو ئەو شارستانیەتو ڕۆشنبیرییە کۆنانە، ستەمە بتواندرێ ڕۆشنبیری پرۆلیتاریو سۆسیالیستی پوختو خاوێن بینا بکرێ.

---

<٢٣> جان اسمین. الثورة الثقافية الصينية. ترجمة ذوقان قرقوط، ص: ١٢١و١٢٢.

## ٧/٥- تیزی سێ جیهان.

ئەم تیۆرە لە دوا تەمەنی ژیانی (ماوتسیتۆنگ)دا ڕەنگی ڕژاوە، وەنەبێ ڕەنگەکەیش وەکو دیموکراسی نوێ، یان بەرەی نیشتمانیو بۆچوونەکانی دیکەی ماو، گوتاری تیزیو ئابووریو ئایدیۆلۆژی لەو نووسرابێ. نەخێر هەتا هەنوکەش گوتاری وا دەرنەکەوتووە،

ئەوکاتە چین، وەکو لەڕووی سیاسییەوە بۆچوونی تیۆری تایبەتی لەسەر ئاستی جیهان: شۆڕشی درێژخایەن، لەشکری گەل، دیموکراسی نوێو بەرەی نیشتمانی بڵاوەکردەوە، دوای تەقینەوەی ناکۆکی توندی چین لەگەڵ شورەوی خۆی بەناوەندی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی شۆڕشگێڕ دەزانی. بۆئەوەی ئەم ناوەندییەشی بۆچێتەسەر، هاوشانی تیۆرە سیاسیو عەسکەرییەکانی پێویستی بە جیهانبینی فراوانتر دەکرد هەتا بە حیساب سەرلەنوێ ئینتەرناسیۆنالیزمی نوێ لە دەوری خۆیدا دژی ڕەوەو پێگۆزمی جیهانی (وەکو دەیانگوت) کۆبکەنەوە. ئەمەش پێویستی بە ·کدانەوەی باری ئابووریو ئەو ناکۆکیانەی لەو بارە ئابوورییە جیهانییەوە سەریهەڵداوە هەبووە، هەتا توانای سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئەو لایەنانەیان هەبێ بەپێی ڕێبازی خۆیانەوە ناکۆکیانەشیان بەم چوار چەشنەی خوارەوە دارشت:

١- ناکۆکی لەنێوان نەتەوە چەوساوەکان لەلایەکو لە نێوان ئیمپریالیزمو سۆسیالئیمپریالیزم لەلایەکی دیکەوە.

٢- ناکۆکی نێوان پرۆلیتاریاو بۆرژوای وڵاتانی سەرمایەداریو سەربە ریڤیژنیزم.

٣- ناکۆکی لەنێوان دەوڵەتانی ئیمپریالیو دەوڵەتی سۆسیالئیمپریالی لەنێو خودی دەوڵەتانی ئیمپریالیدا.

٤- ناکۆکی لەنێوان دەوڵەتانی سۆسیالیستی لەلایەکو لەلایەکو لەنێو ئیمپریالیزمو سۆسیال-ئیمپریالیزم لەلایەکی دیکەوە.

بەوپێیە شورەویو دەوڵەتانی پرۆشورەوی لای چین لە ئەمریکاو دەوڵەتانی ئیمپریالیو سەرمایەداری جیهان بۆ سەرکرێکارانو میللەتانی چەوساوە ترسناکترن.

ئێمە لێرەدا باسەکەمان ناخەینە بەرگری لێکردنی شورەوی یان هەر وڵاتێکی دیکەی هاوپەیمانی شورەوی... مەبەستەکەمان ئەوەیە کە: سەرچاوەی تیۆریو ئابووریو فەلسەفی هەر لایەک، دەوڵەت بێت یان حیزب، کۆمەڵی گچکە بێت یان تاکەکەس، بناخەی زانستی نەبێو بابەتیانە دانەڕێژرابێ، بۆچوونو

لێکدانەوەکانیشی چەوت دەردەچن. هەڵوێستی هەرلایەک ئەگەر هەلپەرستانە یان پراگمیتانە وەرگیرابێ‌و ماوەیەک بەچەک‌و پارە، پاساوی بدات... پاڵپشتی زمانە زوو یان درەنگ چەوتیەکەی دەسەلمێنێ‌و دەبێتە مایەی زیانی گەورەو کاریگەر بۆ ئەو لایەی هەڵوێستەکەی وەرگرتووە. جا ئیتر لای گەورە زیانی گەورەو لای بچووکیش زیانی گچکەی ونەکەوێ. دیاریکردنی ناکۆکیەکان لەسەر بنەما زانستی‌و پۆلێن کردنی ناکۆکیەکان بەشێوەی بابەتی‌و چلۆنایەتی هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەر لایەنە ناکۆک‌و کۆکەکان، ئەرکێکی چینایەتی هەرە گرنگە. ناکۆکی گچکە بە ئارەزوو دروست ناکرێ‌و ناشکرێتە هۆی بڕیاری لێبڕاو ئەگەر دروست بکرێ‌و بڕیاریشی لەسەر بدرێ لە زیان بەولاوە سوودی نابێ. ئەخرازەلا ناکۆکیە بنچینەییەکانی کۆمەڵێک ئادەمیزاد کە پێوەندیان بە چارەنووسی مرۆڤایەتیەوە هەیەو دەوڵەتە زلهێزەکانیش دیاریان بکەن ئەوەتانێ چین ساڵە خۆی بە ناو ... ی خەباتی شۆڕشگێڕانە بە توانای دووەمین دەوڵەتی گەورەی جیهان دەزانی . هەزاران نووسین‌و سەدان کتێب‌و لێکۆڵینەوە لەلایەن سەدان نووسەرو ئابووری زانییانەوە لەسەر حیزب‌و دەیان ڕێکخراوو دەیان گروپ‌و سەدان هەزار تێکۆشەریش لە جیهاندا پشتیوانی لێدەکردن کەچی چی دەرکەوت؟ دەرکەوت وانییە:

- قۆناغی دیموکراسی کۆتایی هاتبێ‌و سۆسیالیزم لەسەرکەوتن‌دا بێ.
- ناکۆکی نێوان کارو سەرمایە کۆتایی نەهاتووەو کرێکاران نەبوونەتە خاوەنی دەسەلاتی تەواوی خۆیان.
- پاشی چینەکان ماون‌و بەهێزیشن
- دیموکراسی‌و ئازادی دابین نەکراوە.
- کێشەی نەتەوایەتی ماوە.
- جیاوازی شارو لادێ زۆرە.
- نەخوێندەواری ڕیشەکێش نەکراوە:

ئەم ئەزموونە گەورەو کارنە، بەسە بۆ ئەوەی هەمور لایەکی سیاسی، بەتایبەتی چینایەتی، فێربن کە سەربەخۆیی ڕێکخراوەیی‌و ئایدیۆلۆژی لە جیهانی سیاسەتدا، چەند چارەنووس‌سازە. بەبێ پاراستنی سەربەخۆیی: بڕیاردان، هەڵسەنگاندن، دیاریکردنی ستراتیژو تاکتیک، بەرنامەی لایەنی کەم‌و دوور هیچ لایەک لەناو هەر میللەت‌و چینێک بێ، ناتوانێ لەژێر کاریی گەورەترین دەوڵەتدا یان بەچاولێکەری

باشترین حیزبدا بەرنامەی ڕاستەو دروست داڕێژێ... ناتوانێ کێشەکانی خۆیو جیهان زانستیانە گەلاڵە بکات. دۆڕاندنی سەربەخۆییو چاولێکەری تیۆری، دوو دیوی یەک ناوەڕۆکی زیانبەخشن، هەتا شۆڕشگێڕەکان خۆیانی لێ بپارێزن کەمترین گرفتیان تووش دەبێ.

مەسەلەی پەرستنی شەخسی (مائۆتسیتۆنگ)و تەقینەوەی کێشەکانی ناو چینو ئەنجامە نالەبارەکانی لەسەر سۆسیالیزم لەولاوە بووەستێ کە ئەمانەش بەزەقی دژی بنچینەکانی مارکسیزمو سۆسیالیزمن. سەرئەنجامی هەمووشیان ریفۆرمیزمی چەپڕەوی وردە بۆرژوازیانە بوو سالەهای سالْ بە (ئالای سوور) و ( (ئەستێرەی سوور) و (تفەنگ) شاردراونەوە. لە (٣٠) سالی ڕابردووشدا چین نەیتوانی لە جیهانبینی چەپی (ماو)بزەمەوە، کرێکارانی یەک وڵاتی سەرمایەداریش لە سەرانسەری جیهانداو هیچ گەلێکی داگیرکراو لە ئاسیاو ئەفریقیادا بگەیەنێتە سەرکەوتن، ئەو یارمەتییەی دەشیدایە هەندێک لە میللەتانی ڕزگاریخواز وەکو: ڤیێتنام، لاوسو کەمبۆج... تاد. زۆر هەڵوێستی لێکۆڕینو دووچاری شەڕی قورسیش لەگەڵ ڤیێتنامدا هات. چەندین میللەتی دیکەش بە خەباتی چەکداری ڕزگاریان بوو کە چین خۆی بە ئالاهەڵگری دەزانێ. پێوەندییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ چیندا نییەو ڕێبازی ئایدۆلۆژیشیان پێچەوانەی ڕێبازی ماوبزمە (نیکاراگوا، سلڤادۆر، ئەنگۆلا) ئەگەر بە دروشمو لاف لێدان بایە، دەبوو ئەو بزووتنەوە چەکدارانە دۆستی حەلالی چینەکانو دڵسۆزی ڕێبازەکەیان بان.

# ٦- پێشینەی ریفۆرم

جێنشینی ستالین (خرۆشۆف) ئەگەرچی دوورکەوتەوە لە دیکتاتۆریەتی ستالین بەلاّم نەک بەدرێژەی پێدانی لینینیزم، یان خولّقێنەرانە پەرەپێدانی مارکسیزم-لینینیزم، واتە: خرۆشۆف نە ستالینی بوو نە لینینی بوو. ڕێبازێکی نوێی سیاسی-ئایدیۆلۆژی خرۆشۆف- سۆسلۆڤی* داهێنا. ئەنجامیش تێکشکا. هەرچەند دەیویست یان وەکو خۆی باسی دەکرد، مەبەستی ڕزگارکردنی سۆسیالیزمە لە ستالینیەت لەسەرانسەری جیهانداو چاککردنی سیستەمی سۆسیالیستی شورەویە هەتا ئەو ڕادەیە لە بەرنامەی دە سالەدا لە بەرنامەکانی سالّ ١٩٥٦-١٩٥٩دا بەلّێنی‌دا شورەوی بسازێنێتەوە (کۆمۆنیزمی تەوا[illegible] بهێنێتەدی‌و میللەت لەڕووی: ئابوری، سیاسی‌و عەسکەرییەوە لەو بۆرژوا[illegible] هەبانە لەگەلّ ڕۆژئاوادا پێشتر بخات بەلاّم هیچی ئەو بەلّێنانەی بۆ نەچۆتە[illegible] سەرکەوتنی نەهێنایە دەست. بگرە وەکو شکستخواردوویەک تەختی ڕێبەرا[illegible] لەژێر کێشا.

دوای ئەو برێژنیێف هاتو ئەمیش بە گوێرەی خۆی، بڕێک تاوانی خ[illegible] (ستالین‌و خرۆشۆف)و بەلّێنی‌دا شورەوی لەهەموو ئاستەنگێک قورتا[illegible] بەتایبەتی لەباری ئابووری‌و سیاسیەوە. کەچی ئێستا بەرپرسی شورەوی[illegible] تەنانەت باری ئابوری ولاّتەکە بەرەو خراپتر ڕۆیشتووەو گۆرباچۆف [illegible]

---

* سۆسلۆڤ: تیۆرسێنی ڕێبازی ڕیفۆرمیستی گەشەکردنی ئاسەرمایەداریە.

میکانیزمی چەق بەستوو» ولاتی تەنیوەتەوە. سەیرتر لەوەش، راوێژکاری بەرزی شورەوی (ئابەل ئاڤانیگیان) کتێبێکی ئابووری بەناوی (ئابوری پرۆسترۆیکا) نووسیوەو تێیدا هاتووە کەوا: لە سالانی ١٩٦٦-١٩٧٠دا لەماوەی ٥ سالدا دەرهێندراوی میللی شورەوی ٤١٪ بووە کەچی لەوپەڕی دەسەلاتی برێژنیڤدا (١٩٨١-١٩٨٥)دا ئەو ڕێژەیە دابەزیوە بۆ ١٦.٥٪. سەیرتریش لەوە خودی ئابەل ئاڤانیگیان گومانی لەو ڕێژەیە هەیەو دەڵێ ڕاستیەکەی ئەوەیە بەرهەمی میللی دابەزیوەتە ڕێژەی (سفر). واشی ڕۆشن کردۆتەوە کەوا: نرخی پێگەیشتنی دەرهێندراوی میللی لەسەرەتای دەیەکانی ١٩٧٠وە ڕوو لە خوارەوە بووەو لەناوەڕاستی ١٩٨٠دا بەکەمترین رادەی رەسیووە. لەچوار خولی پێنج سالەی دەرهێندراوی میللی بەپێی دەستنیشانکراوی دروست، بەم پێیەی خوارەوە بووە: ١٩٦٦-١٩٧٠ لە دەوروبەری ٣٢٪، ١٩٧٠-١٩٧٥ دەوروبەری ٢٣٪، ١٩٧٦-١٩٨٠ دەوروبەری ١٢٪و ١٩٨١-١٩٨٥ گەیشتۆتە ١٪. <٢٤>.

واتە برێژنیڤ لەپاش لێخستنی خرۆشۆف هەتا مردنی خۆی ئەگەرچی لافی ریفۆرمو چاککردنی ولاتی لێداوە، بەلام ڕاستیەکەیشی ئەوەیە بەرهەمی میللی بەجارێک نابووت کردووە. وەکو بارە ئابووریەکەش وابووە، هەتا هاتووە بە نهێنیو ئاشکرا لەسەر حسابی ژینو ژیواری خەلک، چەکی ئەتۆمی جۆراوجۆری گرانبەهای [...]ستاوەتە دەبزخانەکان.

لە کۆنگرەی بیستو حەوتەمیشدا گۆرباتشۆف بە ڕاشکاوی (سیاسەتی [...]ست)و بە (هەلچوونی جۆراوجۆر)ی برێژنیڤی باسکردو ڕوونی کردەوە کە: [...] شورەوی تووشی شکستێکی گەورە کردووە. لەڕووی سیاسیشەوە لەهەمان [...]دا برێژنیڤی کردبووە بیرۆکرات، جا ڕێبەرێک ئابووری گەورەترین ولاتی [...]و خۆیشی بیروکرات بووبێ، دبارە مەحالە بتوانێ لەپاش خرۆشۆفدا [...]تە ولاتەکەیو ئازادی داین بکاتو سۆسیالیزم پێشبخات، ڕاستیەکەی [...]رەوی خۆیان دانی پێداه دەنێن، کەچی لە کۆنگرەی بیستو شەشەمی [...]ژنیڤ ئەو ڕاستیانە لە خۆیانو خەلکی جیهان بەم شێوەیەی خوارەوە [...]:

---

[...].١٩٦٧

(بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین قزناخی حەفتاکان بە هەنگاوی گەورەی پێشخستنی وڵات هەڵبسەنگێنین*) وەکو شورەوی دووچاری ئەم ئاستەنگە کردووە، دۆستانی شورەویشی تووشی گەورەترین نوشستی سیاسی-ئایدیۆلۆژی کردووە، هەڵبەتە لە وڵاتێکی وەکو شورەویدا، تەنگو چەڵمەی پەنگ خواردووی دەیان ساڵ هەتا سەر بە زەبری هێزو پڕۆپاگەندە ناشاردرێتەوە، ئەگەر لەڕووی دیپلۆماسیشەوە بشاردرێتەوە، ئەوا لە ڕووی کۆمەلأیەتییەوە پەنگخواردنی تەنگوچەڵمەکان لە دەروونی خەڵکدا جۆش دەخوات‌و جۆشیش پلەی دیاریکراوی کولأنی راپەڕینی هەیە. بۆیە دوای مردنی سازاندنەوەی کێشە

ئابووری‌و کۆمەلأیەتیەکانی شورەوی بۆ گوڕ خستنەوەی گیانی خەڵک ئامانجی سیاسەتی ئەندرۆپۆف (١٩٨٢-١٩٨٤) بوو. ئەمیش لەو دوو ساڵەدا بەشێنەیی هەوڵیدا ریفۆرم بخاتە ناو دەوڵەت‌و حیزب‌و کۆمەڵ، بەبێ ئەوەی ناویشی لێبنێ شۆڕش، یان پرۆسترۆیکاو گلاسنۆست؛ کەوتە پاککردنی دیاردەی بیرۆکراتیەت، قەدەغەکردنی پلەبەپلەی مەیخۆری‌و بەدمەستی کە هێزی کارو کرێکارانی لاواز دەکرد. هەوڵیدا دیسپلین لەکارکردن‌و هاندان بۆ بەرهەمهێنان پتر بکات. ئیتر ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستە پایە بەرزەکان لێخران‌و لە دوو ساڵەی حوکمی ئەندرۆپۆفدا جۆری ریفۆرم‌و گۆڕان بەرچاوکەوت. بەرهەمهێنان بەرزتر لە ٣,٥ گەیشت. بەلأم نەخۆشی ئەندرۆپۆفی کوشت‌و فریای بردنە سەری بەرنامەکانی نەکەوت (چێرنینکۆ ١٩٨٤-١٩٨٥) بۆ ماوەی چەند مانگێک بەگیانەلأیی ڕێبەرایەتی شورەوی کردو لەو چەند مانگەشدا نەک درێژەی بە سیاسەتی ئەندرۆپۆف لە ریفۆرم‌و پێشخستنی وڵاتدا نەدا بگرە هەوڵیشیدا تێکیان بداتەوەو دۆخی شورەوی بگێڕێتەوە بۆ دەورانی بیرۆکراتیەتی برێژنێڤ. ئەمیش مرد.

## میخائیل گۆرباتشۆف (هەتا ئێستا ٥٩ ساڵە)

پاش جەنجاڵێکی کەم لەسەر چۆنیەتی هەڵبژاردنی ڕێبەری تازە بۆ شورەوی، هاتە سەر کاروباری حیزب‌و دەوڵەت، لەساڵی ١٨٥٢وە چووەتە ریزی حیزبی کۆمۆنیستی شورەوییەوە واتە لە ئاخرو ئۆخری ژیانی ستالین‌و ستالینیەتدا، لەهەموو کاروبارێکدا کە پێی سپێردرابێ سەرکەوتوو بووەو لە ساڵی ١٩٧٠ لە (٣٩) ساڵییەوە بووەتە یەکێک لە سەرکردەکانی شورەوی‌و کراوەتە ئەندامی

* المنار، عدد:٤١ آيار:١٩٨٨.

ئەنجومەنی بەرزی وڵاتو ئەندامی ڕێبەرایەتی حیزب. کەواتە: لە دەورانی ستالیندا بۆتە حیزبیو لە گەرمەی دەورانی برێژنێفدا هەڵبژێردراوە بۆ ڕێبەرایەتی. هەڵبەتە دەورەی خرۆشۆفی لەوپەڕی چالاکیو چاپوکی ژیانی سیاسی خۆیدا بردۆتەسەر. ساڵی ١٩٧٨یش کراوەتە وەزیری کشتوکاڵ. ساڵی دوای ئەویش ١٩٧٩-١٩٨٠ بەرزکراوە بۆ ئەندامی مەکتەبی سیاسی (پولیت بورو). کورتیەکەی گۆرباتشۆف هیچ جۆرە لێپرسراوییەتێکی لە تاوانەکانی ستالیندا نەبووەو لەدەورانی ڕاسترەوێتی خرۆشۆفیشدا کادرێکی ئەوتۆ نەبووە بتوانێ ڕەوت بگۆڕێ. بەزۆری قاڵبووی زەمانی برێژنێفەو لە سێبەری سیاسەتەکانی ئەویشدا تێکەڵاوی بەرپرسیارێتی گەورەی شورەوی بووە. بۆیە قوڵتر ئاڵە لەو سیاسەتانەی برێژنێفو دەشزانێ بارو دۆخی وڵاتەکەی چۆن بووەو پێویستی بە چییە.

پێش ئەوەی بچینە ناو باسەکە، (پرۆسترۆیکا و شۆڕش)و پێوەندی چاکو خراپی ئەو دوو چەمکە ئایدیۆلۆژیەی ڕۆشن بکەینەوە، واچاکە کورتەیەکیش لەسەر پرۆسترۆیکا وەکو پێناسەو پێشەکیەک بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەمان، باس بکەین. پاشتر دێینە سەر ئەوەی داخوا پرۆسترۆیکا بۆ شۆڕشو شۆڕشگێڕێتی باشە یان خراپە، بۆ ئەوەی ئەمەش هێندەی دەتوانین بابەتیانە باس بکەین، کورتە باسێکی ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسی شورەوی لەسەردەمی تازە هاتنە سەرکاری گۆرباتشۆفدا پێویستە هەتا لەناو چوارچێوەی ئەو باسانەوە تابلۆی خۆمان بنەخشێنین.

سیستەمی سیاسی دەوڵەتانی جیهان، لەسەر بنەمای ئابووری هەموو وڵاتێک ڕۆنراوە. ئابووریش دوو بەشی گرنگی هەیە: کشتوکاڵو پیشەسازی. هەردوو ئەم دوو بەشەش پێوەندیان بە خاکو کەشو ئاوو هەواو سەرژمێری دەوڵەتانو میللەتانەوە هەیە. دیارە شورەوی چ وەکو خاکو ئاوو هەواو چ وەکو سەرژمێر یەکێکە لە دەوڵەتە زلەکانی جیهانو کەمو کورتیەکی لەم بارەوە نییە.

گۆرباتشۆف کە هاتۆتە سەر کاری ڕێبەرایەتی شورەوی کەوتووە بەسەر باری ئابووریو دۆخی کۆمەڵایەتی ڕێبەرایەتی پێشووی خۆی کە ئەگەر یەکێکیش بووە لە سەدان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیو پاشان هی مەکتەبی سیاسی حیزبەکەیش. بێگومان لەناو دەریای بیرۆکراسیەتی حیزبەکەدا، توانای دەربڕینی هەڵوێستی وەکو ئێستای هەرگیز نەبووە. ئەمەش لەناو ڕژێمی وەکو شورەویدا، هەروەها لەناو ڕژێمە هاوپەیمانەکانی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا، ڕاستیەکی زەقو ڕەقە کە نەک بۆ کەس

ئەچۆتەسەر بگرە لەولاتێکی وەکو چیکۆسلۆڤاکیاش کە ساڵی ١٩٦٧دا دەویسترا جۆرێک لە گۆڕان و گۆڕانکاری وەکو ئێستای شورەوی بهێندرێتەدی. شورەوی بە گەورەترین دەستێوەردانی چەکدارانە ئەو کۆششە ئازادیەی سەرکوت کرد. دیارە یەکێکی وەکو گۆرباتشۆف (پێشتریش ئەندرپۆف) سیاسەتی شورەویان لەم بارەوە باش دەزانی، بەتایبەتی ئەندرپۆف لە تەقینەوەی کێشەکەی (پراگ)دا سەفیری شورەوی بووە لەوێ. خۆ لە چیکۆسلۆڤاکیادا ئەوەی دەخوازرا هاوئامانجی ئەوەی ئێستای شورەوی بووە هیچی‌دیکە.

کە گۆرباتشۆف هاتە سەرکارو کاروباری ولاتی وەکو ڕێبەری یەکەمی شورەوی کەوتە دەست، کەوتە پیادەکردنی نەخشەکانی کە ڕەنگە دەمێک بووبێ بیری لێ کردبێتەوە، بەلام نەیتوانیبێ دەری ببڕێ. کاتی هاتنە سەرکاریشی، شورەوی باری ئابووری بەم شێوەیە بووە:

## پێگەیشتنی ساڵانەی ئابووری شورەوی لە ١٩٦٦-١٩٨٥

| | ١٩٦٦-٧٠ | ١٩٧٠-١٩٧٥ | ١٩٧٦-١٩٨٠ | ١٩٨٠-١٩٨٥ |
|---|---|---|---|---|
| دەرهێندراوی میللی | ٪٧.١ | ٪٥.١ | ٪٣.٨ | ٪٣.١ |
| بەرهەمی پیشەسازی | ٪٨.٥ | ٪٧.٤ | ٪٤.٥ | ٪٣.٧ |
| بەرهەمی کشتوکاڵ | ٪٣.٩ | ٪٢.٤ | ٪١.٧ | ٪١.١ <٢٥> |

ساڵی ١٩٦٠ شورەوی هێندەی پێویست بە کڕینی دانەوێڵە نەبووە، کەچی ساڵی ١٩٨٥ کە گۆرباتشۆف لەسەرکار بووە، ٥٥ ملیۆن تۆن دانەوێڵە هاوردراوە (استراد). ئەمەش کاری کردۆتە باری ژیانی خەڵکو داهاتی ساڵانەو سامانی ژیواریان. بەتایبەتی شورەوی بە حوکمی پایە ئابووری و پلە سیاسیەکەی لەمەوپێش، سەرڕای ئەو بارە ئابووریەیان بۆدجەی عەسکەریان ئێجگار بالایە. ئەمەش لەو دۆخە ئابووریەدا باری سەرشانی خەڵک سەنگین‌تر دەکات.

<٢٥> یان دریبشایر. تحولات سیاسی در اتحاد شوروی (از برژنف تا گورباچف) ترجمە: هرمز همایون پور، چاپ اول ١٣٦٧ تهران ص:١٣٦.

گۆرباتشۆف کە هاتە سەر حوکم ئەو ڕاستیە ئابوورییەی تێکڕا دەزانی... دەیشیزانی سەرچاوەی گرفتەکان لەکوێوە قوڵپ دەدەن. سەرەنجامی ئەو گرفتانەش: بیرۆکراتیەت، کەمکاری، تەمبەڵی، کەمبەرهەمی، کالای بێکەڵکو مەیخۆریو بەدمەستیش لەولاوە بووەستن. سەرباری ئەوانە نەفرەتی خەڵک لە نەبوونی دیموکراسیو ئازادی گەیشتبووە بینەقاقا. ئەوانەش تێکڕا کاریان کردبووە سەر: چینەکان، میللەتەکان، کشتوکاڵو پیشەسازی، شارستانیەتو ڕۆشنبیری... گۆرباتشۆف دڵنیا بووە کە ستەمە ئەو کێشانە هەتا سەر ڕێی تەقینەوەیان لێ بگیرێ، بەڵکو تەقینەوەی بێ وێنەشیان لە جۆشخواردندایە. خۆی بەم شێوەیە دان بەڕاستیەکاندا دەنێ: «دواخستنی پرۆسترۆیکا دەبێتە هۆی ئەوەی لە ئایندەی نزیکدا دۆخی ناوخۆ دووچاری ڕەچاو نەکراو بێتو بۆ ئەوەی دوور لە تێئاخنینو زیدە گۆیی بم، دەبێتە مایەی قەیرانێکی ڕاستی لە ڕووی کۆمەلایەتی، ئابووریو سیاسییەوە «٢٦».

لەبەر تەواوی ئەو ڕاستیانە، بەڵکو پتریش، گۆرباتشۆف بەوپەڕی ڕاشکاویو بەشێوەیەکی بێ وێنە لە مێژوودا دوو پرینسیپی کردە پێناوی ئامانجەکانی:

- پرۆسترۆیکا
- گلاسنۆست

یەکەمین بۆ سازدانەوەی سەرلەنوێی شورەویو دووەمیشیان بۆ ئاشکرایی (العلانیە) لەناوخۆو دەرەوەدا بەکار دێت.

لێرەدا بواری هەڵسەنگاندنی پرۆسەی ئەو دوو پرینسیپە نییە، بەڵکو پێمانوایە ئەرکیوا کاتی باشی گەرەکە هەتا بتواندرێ هاوزەمانی هەڵچوونی شەپۆلی بێ ئەمانی ڕاستیە داپۆشراوەکان، لێکۆڵینەوەی قوڵ پێشکەش بکرێو هەمە لایەنە دیاردەی جیهانی گەورەیوا لێکبدرێتەوە.

پێوەری پێوانەی دیاردەکان، گرفتەکان، حەزی ئەمو زرنگی ئەو یان ناوبانگی هیچ کەسو لایەک نییە. بەڵکو ڕادەی خزمەتکردنی کرێکارانو سەرکەوتنی سۆسیالیزمە بەسەر سەرمایەدارە چەوسێنەرەکاندا.

---

«٢٦» میخائیل گورباچف. پراسترویکا دومین انقلاب روسیە، مترجم عبدالرحمن صدریە. چاپ سوم، تاریخ نشر ١٣٦٦.

هەر دیاردەیەک، دەرکەوتەو پرۆسەیەک، نەبێتە مایەی پێشخستنی شۆڕشی کرێکارانو ڕەخساندنی سەرکەوتنی سۆسیالیزم لە جیهاندا ئەگەر بەشێوەیەکی کاتی سودی سیاسیو دەسکەوتی کۆمەڵایەتیو ئاسوودەی مرۆڤایەتیشی هەبێ، هەر بەقەد ئەوانە دەبێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێو لە ئەندازەی خۆیان زیاتر نەقەبڵێندرێن. ئەگەر وا نەکرا ستراتیژ دەخرێتە خزمەتی تاکتیکەوە، لەکاتێکدا دەبێ بە پێچەوانەبێ. پرۆسترۆیکایش هەر دەبێ لەناو بازنەی ئەم ڕاستییەدا بتوێژرێتەوە. ئەگەرچی لەدوای شۆڕشی ئوکتۆبەرەوە هیچ دیاردەیەکی سیاسی بە ئەندازەی پرۆسترۆیکا جیهانی نەهەژاندووە. ڕەنگە زیاتر هۆیەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە پێشتر گرفتەکانی ئەزموونی سۆسیالیزم بە قەبارەی ئێستا لێدوانیان لەسەر نەکرابێو بەقەد ئێستاش مەترسیان لەسەر چارەنووسی ئەزموونەکان پەیدا نەکردبێ . پرۆسەیەکیش مەترسی ڕوونبێ هەڵبەتە زووتر بایەخی دەدرێتێ جا ئاخۆ پرۆسەکە مەترسییەکە دەڕەوێنێتەوە یان نا ؟ وەڵامی ئەمەیان بەستەیە بە چارەنووسی سۆسیالیزم. سۆسیالیزمیش پێوەندی بە خەباتی لێبڕاوی کرێکارو زەحمەتکێشانەوە هەیە.

هەردیاردەیەکیش لەناو پێویستییە چینایەتیەکانی کرێکارانەوە هەڵنەقوڵێو نەبێتە ئامرازی ڕاستەقینەی دەستیان لەپێناوی سۆسیالیزم، ڕەنگە لەهەوارەکانی دیکەدا سەرکەوتن بەدەستبهێنێ، بەڵام نابێتە دەستکەوتێکی سۆسیالیستی زانستی. دەشێ بگوترێ: دەستکەوتێکی گرنگی پرۆسترۆیکا پێش ئەوەی دوا حوکمی لەسەر بدرێ، ئاوەڵەکردنی دەروازەی دیموکراسەتە. بەشێوەیەکی گشتیش، دیموکراسیەت بە چەمکە گشتیەکەی زۆر باشترە لە ژیانی بیرۆکراتیو سانسۆری سیاسیو پێشێلکردنی ئازادی. پێشتریش کورتەیەک سەبارەت بە بیروکراتیەتی سەردەمی برێژنێڤو زیانە جۆراو جۆرەکانی باسکراوە. چەمکی گشتی دیموکراسی زۆر باشترە لە بیرۆکراتیەتو نەبوونی ئازادی*.

---

* هەتا نووسینی بەرگی یەکەمی کتێبەکە باوەڕم بە دیموکراتی شۆڕشگێڕ هەبوو، بەڵام نەک دیموکراتی شۆڕشگێڕی گشە کردنی ناسەرمایەداری. ئێستا پێموایە دیموکراسی هەر یەک دیموکراسییە، بەڵام پێویستە کرێکارانو زەحمەتکێشان خەبات لەپێناوی بەدیهێنانی سەرجەم ئەرکەکانی دیموکراسیدا بکەن چونکە بۆرژوای وڵاتانی ژێردەستە ئەو ئەرکانەی پێ نایەتەدی.

گرفتێنکی هەرە گەورەی شورەوی‌و چین‌و دەوڵەتانی مانەندی هاوپەیمانیان، دەگەڕێتەوە بۆ پێڕەو نەکردنی سیاسەتی دیموکراتی‌و بەدینەهێنانی تەواوی ئەرکەکانی قۆناخی دیموکراتیەت. پشت بەوە بەستراوە مادام دەسەڵاتی سیاسی بەدەستەوەیە، ئیدی دەکرێ سۆسیالیزمیش بهێندرێتەدی، ئەمە بۆخۆی لادانێکی ترسناکە لەرێبازی دیموکراسی‌و ڕەچاوەنەکردنی پێویستنتە ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری‌و سایکۆلۆژیە دیموکراتیەکانی خەڵکە. ئەنجامەکەشی دیارە تا چەند سۆسیالیزم سەرخراوە!

ئەگەر لەچوارچێوەی دیموکراسی گشتیشدا سەیری پرۆسترۆیکا بکری‌و هەریەکێک خۆی بخاتە شوێنی کرێکاران‌و گەلانی شورەوی، هەموو یەکێک ژیانی لە سێبەری ڕژێمێکی بیرۆکرات‌و پێشێلکەری ئازادییەی دەورانی برێژنێڤ‌و ڕێبەرانی پێش ئەویش بەدۆزرێتەوە. بچێتە هەست‌و نستی خەڵکەکەوە، هەژاری‌و کەم دەستی خەڵکەکە لە یەکێک لە دەوڵەمەندترین وڵاتی سەرزەمین بخاتە بەرچاو ئەوسا دەتوانێ بزانێ دیاردەیەکی وەکو پرۆسترۆیکا قازانجی بۆ سەدان ملیۆن مرۆڤ هەیە. هیچ نەبێ باری ژیانی خەڵک‌و دۆخی سیاسی باشتر کردوون. مارکس‌و ئەنگلس‌و لینین، پشتگیری سیاسی دیموکراسی پێوەندیەکانی سەرمایەداری‌و ناردنی شارستانیەتی سەرمایەداریان بۆ وڵاتانی دواکەوتوو کردووە. تا خەڵکەکە لەژیانی سەدەکانی ناوەڕاست‌و کۆنەپەرستی ڕزگاریان بێ. پێوەندی سەرمایەدارییان بۆ نەهێشتنی دەرەبەگایەتی بە پرۆسەیەکی شۆڕشگێڕانە دەزانی. گریمان پرۆسترۆیکا لەسەردەمێکی گۆڕدراودا، بۆ کرێکاران‌و گەلانی شورەوی هەروەها بۆ دەوڵەتانی مانەندی شورەوی هەمان کاری سیاسی دژی بیروکراتیەت‌و نەبوونی ئازادی ئەنجام بدات. لەبەر ئەمەش بێ پێویستە پێشکەوتنخوازە ڕاستەقینەکان پرۆسترۆیکا و گلاسنۆستی پێ لە بیرۆکراتیەت‌و نەبوونی ئازادی باشتر بێت. پرۆسترۆیکا بۆتە مایەی دەرکەوتنی جۆرەها ڕاستی گەورە لەسەر:

- کێشەی لەرەگەوە چارەسەر نەکراوی (١٢٦) میللەت‌و کەمینەی نەتەوایەتی.
- ئاشکراکردنی نەبوونی دیموکراسی‌و ئازادی.
- نزمی ئاستی تەکنۆلۆژیا.
- نزمی پێویستی پزیشکی.
- قەیرانی ئابوری شورەوی‌و هاوپەیمانەکانی.
- بایەخ نەدانی پێویست بە ئەدەب‌و هونەر.

- هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی چین‌و شورەوی‌و کشانەوە لە ئەفغانستان‌و دان‌نان بە هەڵەکەی کۆششی کۆتایی‌هێنان بەشەڕو شۆڕشی کەمبۆج‌و ئێتنامیەکان‌و... تاد.

دەرکەوتنی ئەو ڕاستیانە کە ئێستا کەوتوونەتە ئارای بیرو ڕای جیاوازی قوڵ، خزمەتێکی کەم وێنەیەو هەر سەرئەنجامی دەرکەوتنی ئەو ڕاستیانەو مشتومڕ لەسەر کردنیان لەپاشەڕۆژدا دەتواندرێ ڕاستیەکان بە کۆبەندی گەلاڵە بکرێن‌و بخرێنەوە بەردەم خەڵکی جیهان. هەڵبەتە ئەو خەڵکەش لەباری بۆچوونی چینایەتی جیاوازەوە سود لەو ڕاستیە گەلاڵە کراوانە وەردەگرن‌و هەر چینێکیش لەپێناوی ئامانجی چینایەتی خۆیدا بەکاری دەهێنێ. هەروەها بۆ خەباتی میللەتانی ژێردەستە، رزگاری تەواوی سیاسی‌و ئابووریانە بە ڕێبازی دیموکراسی کە دەستەبەری تەواوکردنی ئەرکەکانی قۆناخی دیموکراسی بێ بەرەو سۆسیالیزمی زانستیش بیگوێزێتەوە.

## ١/٦- پرۆسترۆیکاو شۆڕشگێڕێتی

پرۆسترۆیکا وەکو کراوەتە دیاردەیەکی جیهانگیر، بێگومان یەکێک لەو ڕووداوانەی دەیگرێتەوە، شۆڕشە، بە حوکمی ئەوەش شورەوی یەکێکە لە دوو زلهێزەکەی جیهان، پرۆسترۆیکاش ئەمڕۆ ستراتیژی هەرە گرنگی دەوڵەتەکەیە، کەواتە: لەبەر ڕۆشنایی پرۆسترۆیکا دەبێ شۆڕشگێڕانی جیهان دەست بە ئەڵقەی پێوەندی شۆڕش‌و سیاسەتی شورەوییەوە بگرن، نەک لەخۆیانەوە خەمڵ لێبدەن.

بێگومان ئەمڕۆ لە جیهاندا جگەلە کرێکارانی دەوڵەتانی سەرمایەداری کە ئەگەرچی خەباتی چینایەتیان خامۆشکراوە، بەڵام ئایندەی ژیانیان بەستراوە بە سۆسیالیزمەوە، کرێکاران‌و زەحمەتکێشانی نەتەوە سەردەستەو نەتەوە ژێردەستەکانی وڵاتانی ژێردەستەی ئیمپریالیزمیش کە خەباتی چینایەتی‌و دیموکراسیان گەرمە لەناو بازنەی سیاسەتی نێو نەتەوایەتی‌دا، بگرە لەڕووی سیاسیەوە ئەمڕۆ خەباتەکەیان کڵپەی سەرەکی سەندووە. بۆیە ئەگەر پرۆسترۆیکا بۆ کرێکارانی وڵاتانی سەرمایەداری کە لەپاشەڕۆژدا خەباتەکەیان هەر دەگەشێتەوە، باسی ئاینده بێ یان ئێستا لەڕووی تیۆرییەوە مایەی باس‌و لە داهاتووشدا ڕووبەڕووی کاری شۆڕشگێڕانەیان بێ، ئەوا بۆ نەتەوە سەردەست‌و ژێردەستەکان هەریەکە بەجۆرێکی جیاواز، ڕاستەوخۆ لەم هەلومەرجەدا ڕووبەڕووی تیۆری‌و پراکتیکی پرۆسترۆیکا دەبنەوە. هەڵبەتە نەتەوە ژێردەستەکان دژخی سیاسیان لە نەتەوە سەردەستەکانیش

خراپتره. چونکه مەترسی نەمان هەرەشەیان لێدەکات. لەوانە بەتایبەتی ئەو نەتەوانەی وەکو کوردن. هەروەها میللەتانی ژێردەستەی دیکەیش.
پێشتر ڕۆشنمان کردۆتەوە لەپاش جەنگی دووەمی جیهانەوە کە ستالین گوایە مەرامەکانی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا هێنایەدی، دروشمی دۆستایەتی هەمیشەیی لەتەک سەرمایەدارانی جیهاندا بەرزکردەوەو دوای ئەمیش خرۆشۆف بە خەستی لەرێی هاوژینی ئاشتیانەی هەمیشەیی‌و گەشەکردنی ناسەرمایەداری‌و کۆمەڵێ بیرو ڕای ڕێڤیـژینستانەوە، خراپتریش درێژەی‌دایەو ئەمە لەسەردەمی برێژنیڤ‌و هاورێکانی دوای ئەویش نەگۆڕا، زۆری ئەو تێزانەش ئیمپریالیزم قازانجی گەورەی لێکردن‌و ڕژێمە بۆرژوا دواکەوتووەکانیش پێیان قەڵەو بوون‌و کرێکاران‌و گەلانیش، بەتایبەتی لە وڵاتە ژێردەستەکاندا کە دەویسترا لەرێی " دیموکراسی شۆڕشگێڕەوە " ئاراستەی سۆسیالیزم بکرێن، زیانی مێژوویبیان وێکەوت: داخۆ ئەو زیانانە، یان باشڵێین ئەو هەڵە تیۆریە زیانبەخشانە لە کاتی پرۆستریکادا چارەسەرکراوون‌و بە گیانێکی هاوچەرخانە لەپەرەپێدانی ئینتەرناسیۆنالیزم‌و پشتگیری‌کردنی خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلانی ژێردەستەدا، پێڕەوی پرۆسترۆیکانەی لێدەکرێ یان نا ؟ دەبا وەڵامێکی ئەمە بدەینەوە:
هەروەکو چۆن لە فەلسەفەی ماتریالیزمی دیالێکتیکدا هیچ جۆرە سازانێکی فەلسەفی لەنێوان میتافیزیکیزم‌و دیالێکتیک، هەروەها ئایدیالیزم‌و ماتریالیزم‌دا نییەو نابێ، ئاوەهاش هەرگیز ناشێ لە یاساکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتیدا، جۆرە سازنێکی هەمیشەیی لەنێوان کرێکاران‌و سەرمایەداردا ئیمپریالیزم‌و میللەتانی ژێردەستەدا بهێندرێ، چونکە ئەگەر سازانی وا ئێستا یان لە پاشەڕۆژدا بخوڵقێندرێ‌و زانستیانەش بسەلمێندرێ، ئەوکاتە بێ دوو دڵی پێویستە هەموو هۆشیارێک کە باوەڕی بە فەلسەفەی زانستی هەیە، بە فەلسەفەکەدا بچێتەوەو بگەڕێ بۆ سیستەمی فەلسەفی زانستی نوێی ژیان. چونکە بنچینەی فەلسەفەی مارکیزم لەسەر دژایەتی‌کردنی شۆڕشگێڕانەی ئەو چەشنە سازانە هەمیشەییە داڕێژراوەو جەمسەری ناکۆکیەکانیش لە ڕووی پرینسیپەوە تێکەڵاو کردن هەڵناگرن. ئەوەی مەبەستە پێوەندی سۆسیالیزم‌و سەرمایەدارییە لە لایەک‌و لەلایەکی دیکەشەوە پێوەندی ئەمانیشە بە شۆڕشی ڕزگاری گەلانەوە.
ئەم بۆچوونانە لەسەر ڕووداوی ڕاگوزەر یان دیاردەیەکی کاتی ڕۆنەندراوە هەتا بگوترێ پاشگوزەری ڕووداوەکەو نەمانی دیاردەکاتیەکە، بۆچوونەکەشی بەتاڵ

دەبێ. بۆچوونی وا لەسەر ناکۆکی بنچینەیی نێوان کارو سەرمایە، کرێکارو سەرمایەدار، کرادەتە بنچینەی خەباتی چینایەتی پرۆلیتاریا دژی سەرمایەدار، کە هەتا ئەو ناکۆکیە بمێنێ، بۆچوونەکانیش دەمێنن، ئەگەر بەپێی هەلومەرجی گۆڕدراویش گەشەپێبدرێن، گەشەکردنەکە ناکرێ لە سنووری لۆژیکی بۆچوونەکانیان بترازێن یان بۆچوونەکان لە ناوەڕۆکی شۆڕشگێڕانەوە بگۆڕدرێن بە ڕواڵەتێکی ریفۆرمیستانە.

ئاشکرایە کە سیستەمی سەرمایەداری لەم زەمانەیەدا لە کۆن پتر زاڵە، پێشەنگی سەرمایەدارانی جیهانیش وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. واتە مادام ناکۆکی بنچینەیی لەنێوان کارو سەرمایەدا ماوە، کەواتە دوژمنی بنچینەیی کرێکاران‌و گەلانی ژێردەستە سەرمایەدارەکانن بەسەرکردایەتی ئەمریکا. هەر ئەمانیش تەواوی توانای عەسکەری، ئابووری، سیاسی‌و ڕاگەیاندن‌و پرۆپاگەندەیان بۆ دژایەتیکردنی سۆسیالیزم‌و بیری شۆڕشگێڕانە دەخەنە کارو بەردەوام لەکاردان. بەم پێوانەشبێ ئەگەر پرۆستریکا لەپێناوی پاراستنی سۆسیالیزم‌و سەرخستنی سۆسیالیزمبێ لە تەواوی جیهاندا دەبێ لەبیری پەرەپێدانی خەباتی شۆڕشگێڕانەی کرێکاران‌و گەلاندا بێ دژی ئەمریکاو دەوڵەتانی هاوسیستەمی سەرمایەداری ئەمریکا. جا بۆ ئەوەی ئەمە بە ڕوونی ڕوونبکەینەوە وا پێویستە لە ڕوانگەی ستراتیژی پرۆسترۆیکاوە بڕوانینە هەڵوێستی پرۆسترۆیکا لەسەر خەباتی کرێکاران‌و گەلان.

سەراپای کتێبی پرۆسترۆیکا لە دەوری ئەو ڕاستیە نووسراوە کەوا: کێشەی ناوەندی جیهان چیدیکە خەباتی چینایەتی کرێکاران‌و خەباتی رزگاریخوازانەی گەلان نییە بەڵکو (کێشەی ناوەندی ئەمدەمەی جیهان) داماڵینی چەک‌و تێکوپێکدانی دەبۆی چەکە ئەتۆمیەکانە. هەموو کێشەکانی‌دی، دەخرێنە خزمەتی ئەو کێشە ناوەندییەوە. جاڕا سۆسیالیزم، یا شۆڕشی رزگاری گەلانیش بێ! بۆ ئەمەش لەسەر بەرژەوەندی ئەمریکاو شوروی‌و ئەورووپای ڕۆژئاواو ناوچەکانی: ئەمریکای لاتین، ئەمریکای ناوەندی، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەدوورو درێژی باسکراوەو لە هەموو ئەو ناوچانەشدا، گۆرباتشۆف، ئیمپریالیزم‌و دەوڵەتانی سەرمایەداری گەورەو تەنانەت ئیسرائیلیش بەوپەڕی ڕاشکاوی دڵنیا دەکات کەوا شورەوی بە بچووکترین مەترسی لەسەر خۆیان نەزانن. بەمەش ئەرکی ئینتەرناسیۆنالیزم وەکو خەباتی ناوکۆیی شۆڕشگێڕانەی کرێکاران پێشێلکراوە.

لەبەر ئەوەی ئەم ڕاستیە پەیوەستە بە (پرۆسترۆیکاو شۆڕش)ەوە، لە زمانی خودی گۆرباتشۆڤەوە، ئاماژە بە گوتەی دەکەین. لە کتێبی پرۆسترۆیکادا ڕاهێنکردنی بەرژەوەندی ئەمریکاو ئەوروپا، لە ڕۆژهەلاتی نزیک، ئاسیا، ئەمریکای لاتین‌و تەواوی ناوچەکانی جیهانی سێیەم، لەوانە ئەفریقیای باشوریش بەم شێوەیە دەدوێ:
«لەو هەلە زۆرانەی هەڵکەوتبن ڕووغمان کردۆتەوە کە ئێمە دوای هیچ ئامانجێک لەسەر بنەمای زیان پێگەیاندنی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا ناکەوین. دەزانین ڕۆژهەلاتی نزیک، ئاسیا، ئەمریکای لاتین‌و تەواوی ناوچەکانی جیهانی سێیەم لەوانە ئەفریقیای باشور بۆ ئابووری ئەمریکاو ئەوروپا چ بایەخێکی هەیە. بەتایبەتی هەتا ئەو شوێنەی پێوەندی بە کەرەستەی خاوەوە هەبە، ئاشوب‌نانەوە لەم پێوەندییەدا دوایین شتێکە ئێمە خوازیاری بین. وەها تێڕوانینێکمان نییە کە پێوەندی ئابووری بەرامبەری لە مێژوودا ڕەوتی گرتووە، تێک بدەین ‹٢٧›».
دەبێ بڵێین: لەڕاستیدا ئەمریکاو ئەوروپا بەدرێژایی مێژوو هەردەم تەنیا ئەمەیان ویستووەو هیچی دیکە. بەشەڕ بووبێ یان بە تکا، ئەو سیاسەتەیان سەپاندووە.

## ٢/٦- ڕووکارو ناوەڕۆک

لە (ڕووکاردا)... سیاسەتی هاوژینی ئاشتیانە لە جیهاندا بگیرێتەبەرو لە (ناوەڕۆک)یشدا پەرەپێدانی نەخشەی خۆپڕچەک کردنی جیهان وێرانکەر پێڕەو بکرێ، سیاسەتی وای ناکۆک ترسناکە. لەبەر ئەوەی ئەم (ڕووکارو ناوەڕۆکە) دژبەیەکەی سیاسەتی لەمەوپێشی شورەوی کاری کردۆتە سەرناوخۆو دەرەوەی شورەوی، هەروەها پێوەندیشی بە خەباتی چەکداری‌و باری تەکنۆلۆژیای جەنگیشەوە هەیە هەندێ ڕاستی لەمەڕ توانای ئەتۆمی‌و چەکی هەمەچەشن‌و ڕادەی فرۆشتنی چەک‌و بازرگانی چەکیش باسدەکەین، پێشوەختیش دەڵێین:
تەکنۆلۆژیای جەنگ‌و ڕادەی جەنگین تەنیا بەستەنین بە توانستی پیشەسازی جەنگ‌و بەرزترکردنی دینەماکیەتی لەشکرکێشی دەوڵەتانەوە، بەتایبەتی سەبارەت بە دەوڵەتە زلهێزەکان بەڵکو ئەمانە پێوەندیان بە باری کۆمەلایەتی‌و سیاسەتی نێو دەوڵەتانیشەوە هەیە. لەوانە چۆنیەتی خەباتی چەکدارانەی درێژخایەن لە جیهاندا. هەمیشە لە مێژوودا ستراتیژی جەنگ تەنیا پێوەندی بە جەنگەوە

‹٢٧› هەمان سەرچاوەی پێشو، ل: ٣٤٥.

نەبووە بەڵکو بەشێوەی جۆراوجۆر کاردەکاتە سەر سایکۆلۆژی میللەتانیش بۆ نموونە بڵاوکردنەوەی موشەکی سەرەئەتۆمهەڵگر لە چوار دەوری ئۆروپادا* تەنیا بۆ جەنگو مەترسیەکانی جەنگی ئەتۆم نین، بەڵکە ئەمریکاو شورەوی لەگەرمەی جەنگی ساردو جەنگی سایکۆلۆژی نێوانیاندا لەڕێگای بڵاوکردنەوەی موشەکە سەرەئەتۆمەکانیانەوە، مەبەستیانە دۆخێکی سایکۆلۆژی-کۆمەڵایەتی ئەوتۆ بڕەخسێنن کە بتوانن جەنگی پڕوپاگەندەی سیاسی نێوانیان ببەنەوە.

ئینجا... پاش ئەوەی لەپاش کۆنگرەی بیستی حیزبی کۆمۆنیستی شورەویەوە ١٩٥٦ باسی هاوژینی ئاشتیانەو نەهێشتنی بۆرهۆرێنی چەکو نەمانی چەکی ئەتۆم دەکرێ... کەچی دەبینین هەتا ساڵی ١٩٨٢ بەپێی سەرژمێری ئەنستیتۆی ستراتیژی لەندەن سەرژمێری چەکی ئەتۆم لەم خشتەیەدا کۆبۆتەوە:

| | ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا | شورەوی |
|---|---|---|
| موشەکی کیشوەر | ١٠٥٢ | ١٣٩٨ |
| تیپەڕی سەرەئەتۆم | ٢١٥٢ | ٥٢٢٠ |
| موشەکی ستراتیژی بالتیک | ٥٢٠ | ٩٦٩ |
| دەریا-زەمین | لە ٣٦ژێر دەریایی ئەتۆمی ٤٧٦٨ | لە ٨٠ ژێردەریای ئەتۆمی ١٧٥٢ |
| موشەکی ستراتیژی مەودای ناوەنجی | | ٧٤٠ |
| زەمین-زەمین | ١ | ٨٠٪ ئەمانە لە ڕۆژئاوای ئورال جێگیرکراوە |
| فڕۆکەی بۆمب هاوێژی ستراتیژی | ٢٧٦<br>٢١٦دانەیان دوورەفڕن | ١٥٠<br>١٠٥دانەیان دوورەفڕن. |

* SS20 کە هەر سەرە ئەتۆمێکی ١٥٠ کیلۆ تەن مارەی وێرانکەری ئەتۆمی هەیەو ٢٧٠٠ میلیش دەڕوا. شورەوی ٣٠٠دانەی هەیە. بەپێی بۆچوونی پسپۆڕان، تەنیا ١٥٠ دانەیان سیستەمی بەرگری پەیمانی ئەتلانتیکی باکوری لە ئۆروپادا تێکوپێک دەدا.

موشەکی پرشینگ۲و موشەکی زەمین-زەمین G.L.C.M بڕیارە کە دەوڵەتانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، ئینگلستان، ئیتالیا، بەلژیکو هۆلاندا دابمەزرێندرێ. هاوشانی ئەمانەش لەدەریادا ئەم پاپۆڕە زەبەلاحانەش باری چەکی ئەتۆم کراون:

| | پەیمانی ئەتلانتیک | پەیمانی وارشۆ |
|---|---|---|
| ژێر دەریا ئەتۆمیەکان | ۹۰ | ۹۹ |
| پاپۆڕە جەنگیەکان بەتەن | ۲.۸۵* | ۲.٦۸۵ |
| پاپۆڕی فڕۆکەبەر | ۱۸ | ٤ |
| پاپۆڕی پتر لە ...۲تۆن | ۲٤۸ | ۱۳۹ |
| پاپۆڕی پیادەکردنی سەرباز | ۷٥۹ * | ۱٤۱ * |
| هێزی ئاسمان-دەریا | ۲٦.. | ۷٥۰ |

سەرەڕای ئەوانە، هێزی عەسکەری ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوای جێگیر لە ئۆروپا(۱۹۸۲) بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

پەیمانی ئەتلانتیکی باکوور، هێزی ئەمریکایی جێگیر لە ئۆروپا

- کەس: ۲۲٪ ملیۆن کە ۷۰٪ ملیۆن لە ئەڵمانیادا جێگیرە.
- تانک: دەوروبەری ۱۰۰۰.
- فڕۆکەی جەنگین: پتر لە ۸۰۰.
- ناوگانی شەشەم(دەریای سپی ناوەڕاست).

هێزی دەوڵەتانی ئۆروپا:
- کەس: ۲.۲ ملیۆن.
- تانک: ۱٦۰۰۰
- فڕۆکەی جەنگین: دەوروبەری ۳۷۰۰.

پاپۆڕی گەورەی جەنگین: ۲٦۰، ژێردەریایی ۱٤۳.

* بە ملیۆن تۆن.

پەیمانی وارشۆ هێزی عەسکەری روسیەی شورەوی جێگیر لە ئۆروپادا*.

- کەس: ٥١٪ ملیۆن (٣٨٪ جێگیر لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات)
- تانک: ٠٠٠,١٠( ٧٠٠٠ جێگیر لە چیکۆسلۆڤاکیاو ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات)
- فڕۆکەی جەنگین: دەورووبەری ٢٠٠٠ ( ٩٠٠ لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات)
- ناوگانی دەریای سپی (ناوگانی دەریای ڕەش)
- ناوگانی بالتیک.

دەوڵەتانی ئۆرووپای ڕۆژهەڵات

- کەس: ٨٥٪ ملیۆن.
- تانک: دورووبەری ١٤٥٠٠
- فڕۆکەی جەنگین : دەورووبەری . ٢٢٥.
- دەورووبەری . ١ پاپۆڕی گەورەی جەنگین، ٦ ژێردەریایی‹٢٨›.

ئەو سەرژمێرانە بەڵگەی زەقی بەدینەهێنانیٔ دروشمی هاوژینی ئاشتیانەی هەمیشەیی‌و نەهێشتنی مەترسیەکانی چەکی ئەتۆم‌و جەنگە. هۆی هەرە گرنگی نەهاتنەدی ئەو دروشمە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی داگیرکەرانەی نوێی ئیمپریالیزم کە بەبیٔ چەک‌و بازاڕی چەک فرۆشتن، مۆنۆپۆلەکانی ئۆقرەی ئابووری ناگرن. پاش ئەمەش سیاسەتی شورەوی لەچۆنیەتی بەرخوردکردن لەسەر ئەو سروشتەی ئیمپریالیزم هۆی مانەوەی بەهێزی ئیمپریالیزم‌و نەتەقینەوەی قەیران‌و گرفتە جۆراوجۆرەکانیتی.

گۆرباتشۆف... هەموو ئەو ڕاستیانەی دەزانی‌و زیانی ئەو لە (ڕووکار)دا، دڵسۆزی بۆ ئاشتی‌و لە (ناوەڕۆک)دا، خۆپڕچەک کردنی جەنگیەی هەتا مۆخی دۆخی شورەوی‌و هاوپەیمانەکانی دەرک‌کردبوو. بۆیە لێبڕاوانە لەڕێی پرۆسترۆیکاو

---

* هێزی جێگیر لە نزیک ئەورووپادا : بەبیٔ هێزی ڕوسیەی شورەوی جێگیر لەبەشی ئەورووپا، ڕوسیاو قەفقازیش بەهێزی سەرەوە بەبەسترێتەوە : ٦٩ لەشکر، ٣٦ لەشکری زرێپۆش.

‹٢٨› ژار شالیان ـ ژان پیراژو. اطلس استراتیژیک جهان، ترجمه : د. ابراهیم جعفری. انتشارات اطلاعات، تهران ١٣٦٦ ص: ٢٠٤و٢١٢.

گلاسنۆستەوە پەردەی لەسەر ڕاستیەکان لاداو هەموو گرفتە شاردراوەکانی: ئابوری، کۆمەڵایەتیو عەسکەری دەرخست.

ئەندیشەمەندو ڕۆشنبیرو شۆڕشگێڕانی جیهان، کەوتوونەتە بەردەم هەلێکی مێژوویی ئەوتۆ وێنەی لەمەڕ دەرخستنو دەرکەوتنی ڕاستیەکان نییە: کاروانی شێوێندراوی شارستانیەتی ئادەمیزاد ئێستا داوای وەڵامی پرسیارە بێ وەڵامەکانی سەدەی بیستەم دەکات. ئەو پرسیارانەی بەجۆرەها درۆودەلەسە وەڵامدراونەتەوەو ڕاستیەکان لە خەڵک چەواشە کراون. سەدەی بیستەم لە دەیان ساڵی ڕابردوودا، ژانگرتووی دوو درۆیە: درۆی لاف‌لێدانی دیموکراسی سەرمایەدارانو سۆسیالیزمی ڕێفۆرمیستەکان. هەردوو درۆکان، گاڵەو گاڵتەیان بە مرۆڤایەتی کردووە: چەوساندویانە، خواردویانە، بردویانە، بڕیویانە، دزیویانەو کوشتویانەو بە کوشتیان‌داوە. هەمووشی لەژێر پەردەی ئازادی درۆزنانەو سۆسیالیزمی چەواشەدا. تەواوی ئەو تاوانانەش لەم دوو سێ ساڵەدا، لە سێبەری پرۆسترۆیکاو گلاسنۆس‌دا دەرخران. دەرخستنی ئەو تاوانانەش خزمەتێکی گەورەیە.

ئەگەر سەرنج بدرێتە ئەم ژمارانە، دەزاندرێ جیهان چۆن گیرۆدەی ئەو دوو درۆیە کراوەو هەتا ئێستاش لەژێرپەردەی (ئازادیو سۆسیالیستی)دا شاردراوەتەوە. ساڵی ١٩٨٦ پتر لە ١٠٠٠ ملیارد دۆلار لەسەر بودجەی عەسکەری خەرج کراوە. هەڵبەتە بودجەیەکی خەیاڵیە! کە ئەم بودجەیە ورد دەکرێتەوە دەبینین لە هەموو دەقیقەیەکدا ڕۆژانە دەوروبەری دوو ملیۆن دۆلار خەرجی ئابوری عەسکەریە. ئەمە لەکاتێکدا هەتا هەمان ساڵی ناوبراو، لە هەر دەقیقەیەکدا ٣٠ منداڵ لەبەر برسێتیو نەبوونی ئاوی پاکژ یان لەبەر بایەخ پێنەدانی تەندروستی، گیان دەسپێرنە دوو درۆکەی سەردەمی جەنگی‌سارد، سەرجەمیش ١٥ ملیۆن لە ساڵێکو ٤١٠٠٠ هەزار منداڵ لە ڕۆژێکو ٢٨ کەسیش لە دەقیقەیەکدا دەمرن*.

* جهان مسلح، جهان گرسنه. ل:١١١. ویلی برانت.

شیاوی باسیشە ئەگەر گۆرباتشۆف بتوانێ هاوشانی نەهێشتنی بیرۆکراتیەت لەڕێی پرۆسترۆیکاوە، باری سەنگینی ئەم پرسیتیەش لەڕێی گلاسنۆستەوە کەمتر بکاتەوە، دەسکەوتێکی دیکە بۆ تیزە داهێندراوەکەی تۆمار دەکات؛ لەم بارەیشەوە لەچاوی مرۆڤایەتیەوە سەیرکردنی ژینی پرسیەکانی جیهان، بۆ هەموو شۆڕشگێڕێک پێویستە. ناکرێ تیزی وشکو برینگ بخرێتە سەر ویستی هەلومەرجی ئەو بوسیو بێ‌سامانانە. گونجاندنی ریفۆرمی دۆخی ئەو خەڵکە لەگەڵ ڕێبازی شۆڕشگێڕانە ئەرکێکی مرۆڤایەتی گەورەیە. بۆ ئەمەش پشتگیریکردنی ریفۆرمیش کارێکی مرۆیی پێویستە لە خزمەتی ستراتیژدا. هەڵبەتە سەرکەوتن بۆ گۆرباتشۆڤیش لەم بارەوە پەیوەستە بە ڕادەی داماڵینی چەکە سەنگینەکانو داروخانی دەبۆی چەکە ئەتۆمیەکان. سەرقاڵیو سووری ئەمریکا لەسەر دروستکردنی چەکی لیزەری جەنگی ئەستێرەکان، لەمکاتەدا کە گۆرباتشۆف قورسایی خۆیو شورەوی بۆ لەناوبردنی بۆربۆرینی چەک بەکارهێناوە تەنانەت بە ئاشکرا دەستی لەگەڵێک پرنسیپ هەڵگرتووە. نیشانەی سەرنەکەوتنی سیاسەتی جیهانی بێ‌چەکو نەهێشتنی چەکو مەترسی جەنگی ئەتۆمییە. هەربۆیە ئەو ریفۆرمەی پێویستیشە بۆ چاککردنی ژیواری هەژارە برسییەکان، ئەگەر تەنیا لەهازنەی تەسکی ریفۆرمیستیەتدا بێنێتەوە برسێتی لە سکی سەدان ملیۆن برسیدا کەم ناکات. چونکە ئیمپریالیزم هەر ئیمپریالیزمەو بۆچارەسەرکردنی ڕیشەییانەی کێشەکان، تاقە ئامراز شۆڕشە، ریفۆرمیش دەبێ لە خزمەت شۆڕشدا بێتو جۆگەلەیەک بێ لە دەریای شۆڕش. نەک ڕێگر بێ لە هەڵگیرساندنی شۆڕش.

ئەمڕۆش کە ئیمپریالیزم بە دەنگ گۆرباتشۆفو رووداوە تازەکانەوە دێت، دیارە مەبەستیان چارەسەرکردنی قەیرانەکانی ئەزموونی سۆسیالیزم نیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، قۆڵترکردنی گرفتی ئایدیۆلۆژیەتی سۆسیالیزمی زانستیە. بگرە ڕێبازی سۆسیالیزمی زانستیو بێ بایەخکردنی خەباتی شۆڕشگێڕانەی چینایەتی کرێکارانو زەحمەتکێشانە. ئەم ناهوورتکردنەی سۆسیالیزمو بێ‌بایەخکردنی خەباتی چینایەتیش چەند لە مێشکی خەڵک بچەسپێ، هێندە چەوسانەوەی چینایەتیو ڕوتکردنی

هەزاران دریژە دەکیشی. بەپیچەوانەشەوە چەند بیروڕای شۆڕشگێڕانە پەرەبسەنێ بۆرژواکان لە حەژمەتدا ریفۆرم زیاد دەکەنو لەترسی شۆڕش ژیواری خەلک بەرزتر دەکەن. بەرەبەرەش ئەگەر بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە ئاوێتەی تاکتیکی ریفۆرم کراو چەسپا، سەرکەوتنیش نزیک دەکەوێتەوە. بەپیچەوانەشەوە ئەگەر ڕیبازی شۆڕشگێڕیتی فەرامۆش کراو ریفۆرم کرایە پێناوی ڕاستەقینەی خەلک، ئەوکاتە رژێمە بۆرژواکان مەترسیان کەمتر دەبیو دەسکەوتی کۆمەلایەتیش کەمتر دەدەن.

ڕەنگە لەڕووی ئابوورییەوە هەتا ئێستاش هەردوولا چونیەک یان کەمترو پتر قازانج لەم هەلومەرجە سیاسیە-ئابوریە هاوژینە هەمیشەییەی نێوانیان بکەن. بەلام لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە بێگومان فەلسەفەی سەرمایەداری قازانجی لێدەکەن. هەربۆیە لەڕووی ئابوورییەوە پێوەندییەکە دەبەستن. بەستنی پێوەندی ئابوری پتەو لەنێوان شورەوی‌و هاوپەیمانەکانی‌و ڕۆژئاوادا لەڕووی بابەتیەوە خەباتی کرێکاران خامۆش‌و شۆڕشی گەلان دادەموکێنێ. سەرنەکەوتن یان دواخستنی سەرکەوتنی کرێکاران‌و گەلانیش، لەولاتێک‌و دووان‌و چەند ولاتێکدا بۆ ئیمپریالیزم لەڕووی ستراتیژەوە گەلێ، گەلێ زۆرە.

دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی ئابووری ئەم دوو ولاتە زلە تەنیا بەپاراستنی سیاسەتەکانیان دەبێ لەسەر ئاستی جیهان. جیهانی ئێستاش سەردەمی سەرکەوتنی سۆسیالیزم‌و ژێرکەوتنی ئیمپریالیزم نەما. کێبڕکێی نێوان کامپی سۆسیالیستی‌و ئیمپریالیستی نیە سۆسیالیزم لەپاشەکشەدایەو ئەو کامپەی پەنجا سال زیاتره دەویسترا بەناوی کامپی سۆسیالیستیەوە بچەسپێندرێ: نەماوە! جیهان خەباتی چینایەتی کرێکارانی کزو لاوازە. ئاخرو ئۆخری شۆڕشی درێژخایەنیش لە گۆشەو کەناری جیهاندا، بەلاوازی ماون. ئیمپریالیزم‌و بەرژەوەندی سەرمایەداران زالە. رژێمە بۆرژوا ژێردەستەکانیش ڕاگیراون‌و هەرکاتێ گرفتەکانیشیان نزیکی تەقینەوە دەبێ ئیمپریالیزم زوو بەهانایان دەچن. زیانی ئەم سیاسەتانەش: جگەلەوەی رژێمە دیکتاتۆرەکانی بەهێزترو زالکردووە، واشی کردووە ئەو میللەتانەی لە ئەنجامی شالاوی توندی فاشیەت‌و نەبوونی

ئازادی‌و دیموکراسیدا، ڕاپەڕیون شۆڕش بکەن، بەناچاری کە ئەرکەکانی شۆڕشی چەکداری درێژخایەن دژوارو سەنگین دەبێ، پێویستی بەڕێوەبردنی شۆڕشەکان، ڕێبەرانیان دەخاتە بەردەم مان‌و نەمان، ئەمانیش لە نەبوونی دۆستی ستراتیژی‌و پشتیوانی ئینتەرناسیۆنالیستیدا، ناچار پەنا دەبەنەبەر ڕژێمە بۆرژواکان، تەنانەت کۆنەپەرستەکانیش. پاساوەکەیش، تەنیا دوژمنی دوژمنە بێگومان ئەمجۆرە دۆستە کە لەبەر دوژمنایەتی دوژمنان دۆستی کاتین، هەتاسەر ئامادەنین یارمەتیت بدەن. چونکە دوژمنایەتی ڕژێمە بۆرژواو کۆنەپەرستەکان کە لەڕووی بابەتیەوە هاوبەرژەوەندن‌و لەناو بازنەی سیستەمی سەرمایەداری جیهانیدا دەخولێنەوە، کاتییە. بۆیە دۆستایەتیەکەشی کاتییەو بە ئەندازەی ئەو کاتییەش یارمەتی شۆڕشی گەلان دەدەن. لێشیان ناگیرێ، چونکە ولاَتانی وەکو شورەوی‌و چین‌و مانەندەکانیان حیساب بۆ بەرژەوەندی تایبەتیان بکەن‌و پشت بکەنە کرێکاران‌و گەلان، ئیتر ڕژێمە بۆرژوا ژێردەستەکان چۆن حیساب بۆ بەرژەوەندییان ناکەن؟ کەواتە ئەم جۆرە ڕژێمانە چەند کۆنە دۆستی کاتی بوون، ئێستا بەحوکمی دۆخی نوێی جیهان ئەو دۆستایەتیە کاتیەش کەمتر کراوەو کە هەر بزووتنەوەیەک مەترسی لەسەر بەرژەوەندی زلهێزەکان پەیدا بکات‌و زلهێزەکانیش گوشار بخەنە سەر ئەم دۆستەکاتیانە، زوو نابا پشتیوانی میللەتان دەگۆڕنەوە بە پشت‌تێکردنی میللەتان. نموونەش زۆرن:

لەمێژوودا کورد کوژراوی دەستی ئەم جۆرە دۆستە کاتییەیە. تازەترین نموونەش شۆڕشی ئەیلولە کە چیان بەسەرهێنا! لەم سەردەمەشدا ئەوەی ڕژێمە عەرەبییە کۆنەپەرستەکان بە شۆڕشی فەلەستینیان کردووە، ئیسرائیل هێندەی لەدەست نەهاتووە. قەسابخانەی کارەساتی ئەیلولی ١٩٧٠ی ئوردون، ٢١هەزار شەهیدی فەلەستینی تێدا دراوە. ئوردوگاکانی سەبراو شاتیلاو بەردەوام بۆردومان کردنیان لەلایەن ڕژێمەکان‌و جاشەکانیانەوە. ئاژاوە خستنە ناو ڕێکخراوە سیاسیەکانیان، گرتنیان‌و تەنگپێهەڵچنییان.

پێرار کە خەباتی (تامیل)ەکانی سریلانکا لەپێناوی ڕزگاریدا پەرەی شۆڕشی چەکدارانەی سەند. (هیند) لە ئاست‌تەنگیدا یارمەتیدان‌و بە فڕۆکە، ئازوقەی هەڵدەڕشتە دورگەی گەمارۆدراویان کەچی پاش مانگێک کە کێشەی تامیلیەکان (کتومت!) بەرژێمی بۆرژوای هیند چارەسەر نەکرا، بایدایەوەو لەشکری کردنەسەرو ساڵێک زیاتر ڕاوەدووی‌نان. مەسەلەکەش ئەوەیە: هیند کە زانیان

شۆڕشی تامیلیەکان پەرەدەسێنێ، نیازیان بوو دەستبەجێ کێشەکە بخەن بەلادا. چونکە دەیانزانی تامیلیەکانی سریلانکا کە ژمارەیان (٣.٥) ملیۆنە ئەگەر سەربکەون کاردەکەنە سەر بەشەکانی دیکەی میللەتی تامیل کە (٥٠) ملیۆنن و زۆربەشن و دەشکەونە ولایەتی (تامیل نادۆ)ی باشوری هیندستان. ئەمەیە دۆستایەتی کاتی، لەیەک مانگدا، فڕۆکەی ئازوقە، دەگۆڕێ بە فڕۆکەی بۆمبا!

جەزائیر ولاتی یەک ملیۆن شەهید، پەنای ئازادیخوازانی (کاتالان)ی دا، بەلام کە کێشەکەیان ئالۆز بوو، پەنابەرەکانی کاتالانی خستە پاپۆڕێکو لەڕێی دەریاوە دانیەوە بە ڕژێمی ئیسپانیا.

لەجیهانیشدا تاکە نموونەیەک نییە، نەک لەلایەنە ڕاستڕەوەکان، بگرە چەپەکانیشی ناچارنەکردبێ، ئەگەر نائومێد بووبن لە پشتیوانی ستراتیژی بەناچاری پەنا نەبەنە بەر ڕژێمە بۆرژواو کۆنەپەرستەکان، وەکو دوژمنی دوژمنەکانیانو دۆستی کاتیان. ئەم ڕاستیە لەم هەلومەرجە جیهانیەدا چەپو ڕاستی گرتۆتەوەو هەتا هەلومەرجەکەش وابمێنێ، هەرلایەک بەبێ حیسابکردن بۆ دۆخی ئێستای جیهان، دەستبداتە چەکو شۆڕشی درێژخایەن، ناچاردەبێ سازشی گەورەش لەگەڵ دوژمنی دوژمنەکانی بکات.

ڕەنگە بانچەپەکان بتوانن لە پایتەختو شارە خۆشەکانی هەندەرانەوە شۆڕشی درێژخایەنیش! بەبێ پشتیوانی هیچ دەوڵەتێک بکەن. بەلام لەناو خاکی نیشتماندا کە دەستدرایە چەک، شۆڕشی بێ پشتیوانیو بێ پارە، گەدەی تاکە پێشمەرگەیەک تێرو مەخزەنی کلاشینکۆفێکیش پڕ ناکات. لەبەرامبەر ڕژێمە لەچەک پەرداختەکان بە قسە خۆشە، شۆڕش بەبێ پشتیوانی تەنیا لەڕێی دەستکەوتی شۆڕشگێڕانەوە سەربخرێ.

### ٣/٦- شۆڕش بێ پشتیوانی سەردەخرێ؟

ئایا بێ پشتیوانی، بێ یارمەتی دەرەکی، بێ چەکو پارەو تفەنگو دەرمانو هاتووچۆکردن بۆ دەرەوە، شۆڕشی درێژخایەن سەردەخرێ یان نا؟ ئەمە یەکێکە لەو کێشانەی ئەوەتەی ئیمپریالیزمو جەنگی یەکەمی ئیمپریالیستیانە روویداوە، مشتومڕی لەسەرە.

- ڕاستە هەمیشە لەڕووی سیاسیەوە مافی ڕەوای گەلان سەرکەوتنێکی ورەبی گەورەی هەیەو هاندەری هێزی شاردراوەی میللەتانە. وزەی خەفەکراوی جەماوەر بەگڕ داگیرکەراندا دەتەقێنێتەوە.

- ڕاستە باری بابەتیو باری خۆیی ڕۆڵی چارەنووس‌ساز دەگێڕنو بەبێ ئەمانەش بیرکردنەوە لە شۆڕش، خوێنی خەڵک لە دنگدا کوتانە. تەواوی ئەوانەو گەلێک ڕاستی دیکەیش لە ڕاستیە بەڵگە نەویستەکانن، بەڵام پشتیوانی بێ درێغی دەرەکیش بەتایبەتی هی دۆستانی ڕاستەقینەی ستراتیژی بۆ باشتر ڕێکخستنو چاکتر بەڕێبردنی ئەرکە ناوەکیەکان، لەبەرامبەر هێزی زۆر بەهێزتری دوژمناندا، بایەخێکی ئێجگار گرنگی هەیە. هەتا هاتووشە پلەبەپلەی پێشخستنی تەکنۆلۆژیای جەنگو بەهێزترکردنی ڕژێمە بۆرژواکان، چ لەڕێی ڕۆژئاواوەو چ لەڕێی ڕۆژهەڵاتیشەوە بێ، بۆدابینکردنی نەوتو کەرەستەی خاوی وڵاتانی دواخراو، یارمەتی دەرەوەی شۆڕشەکانیش زیاتر لەجاران بایەخی پەیدا کردووەو دەشتواندرێ بگوترێ زیاتر لەوەش کە جاران دەگوترا:

> یارمەتی دەرەکی فاکتەری سەرکەوتنە! مەسەلە ناوەکیەکان بنەڕەتین! هۆیەکەیشی ئەوەیە سەرخستنی ئەرکە ناوەکیەکان، یان پێگەیشتنی ئەرکە ناوەکیەکان بۆ شۆڕشی درێژخایەن، ئاکامی گۆڕانکاریە ئابووریو کۆمەلایەتی، سیاسیو عەسکەریەکان، هێندە دژوارتر بوون، باری سیاسی نێو دەوڵەتانیش هێندە بەرژەوەندی ئابووری زاڵە بەسەریدا، چیدیکە ناکرێ فاکتەرە دەرەکیەکان بایەخی زیاتریان پەیدا نەکردبێو هەروا بە هۆکارێکی لاوەکیو یارمەتیدەرێکی ئاسایی سەرکەوتنی شۆڕشە درێژخایەنەکان تەماشا بکرێن. هەروەکو چۆن ئەرکە ناوەکیەکان گۆڕدراون، چۆن تەواوی پێویستیە ناوەکیەکانی میللەتان،

دەوڵەتان، رژێمەکان، پێویستی مانو نەمانیان بە یارمەتی دەرەوە هەیەو بێ تەکنەلۆژیا، بێزانستو زانیاری، بێ یارمەتی هەمەچەشنە ناژین، ئاوەهاش یارمەتی دەرەوەی شۆڕشەکانیش، لەقاڵبی فاکتەری جاران نەماوەو چەندین قات زیادي کردووە.

کۆن کە تەکنۆلۆژیا وەکو ئێستا پێش نەخرابوو، رژێمەکان وەکو ئێستا بەهێزتر نەکرابوون، سیاسەتی نێو نەتەوایەتیش وەکو ئێستا بەرژەوەندی ئابوریو دیبلۆماسی زاڵ نەبوو بەسەریدا، شۆڕش بەرپاکردن دەبەسترایەوە بە مەسەلە ناوەکیەکانەوە. ئینجا سەرەڕای هەموو ئەو فاکتەرە لەبارانەش، ڕێبەری شۆڕشی یەکەمین شۆڕشی درێژخایەن کە هەلومەرجی ناوخۆییو جیهانی بەرپاکردنی شۆڕشەکەشیان لەبار بووە پاش ئەوەی دەستدەدەنە چەکو ڕوو دەکەنە شاخو ئەرکەکانیان سەخت دەبێ، مەسەلەی یارمەتی دەرەوە نەک بە فاکتەری سەرکەوتن، بەڵکو بە: (پێمان دەڵێن سەرکەوتن تەنانەت بەبێ یارمەتی جیهانیش دێتەدی) ئەمە ڕایەکی هەڵەیە. شۆڕشی میللی ڕاستەقینە لە بوونی ئیمپریالیزمدا توانای سەرکەوتنی لەهیچ ولاتێکدا نییە بەبێ هەموو جۆرە یارمەتیەکی هێزە شۆڕشگێرە جیهانیەکان. کە بەشێوەی جۆراوجۆر دەیدرێتی، ئەگەر سەرکەوتنیش هاتەدی شۆڕش بەبێ ئەم یارمەتیە ناچەسپی‹۲۹›) ئەمە ڕای ئەندازیاری شۆڕشی درێژخایەنە. ئەندازیاری شۆڕشێکیش کە لە هەڵکەوتووترین ولاتدا بەرپاکراوەو جاریواش هەبووە ژمارەی پێشمەرگەیان لە ملیۆن تێپەڕبوونو بەرگری میللیش زیاتر لەم گۆتەیەدا بەئاشکرا دانیپێداناوە کە شۆڕشی درێژخایەنو پراکتیکەکەی جیاوازییەکەیان ئاسمانو ڕێسمانە. هەربۆیە جگەلە یارمەتی شورەویو بزووتنەوەی کرێکارانی جیهان لە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهاندا، یارمەتی لە ئەمریکاو بەریتانیاش دژی ژاپۆن وەکو هاوپەیمانی نازیەکان وەرگرت (دیارە بێمەرج).

لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانو لە گەرمەی جەنگی دووەمدا، دەوڵەتە سەرمایەدارەکان جگە لەوەی بوون بە خاوەن ئەزمونێکی گەورەی جەنگو جەنگێن لە زانستی جەنگیشدا بە وەرچەرخانێکی بنەڕەتی لەمێژووی جەنگ لە جەنگی

‹۲۹› نقد مفاهیم النظریه لماوتسي تونغ. دار التقدم موسكو، ص:..۱۱.

کلاسیکیەوە بۆ جەنگی نویێ دەژمێردرێ: هەتا ئەوەدەمە هێشتا زانستی جەنگی کلاسیکیو جەنگی بەرەیی فراوانو جەنگی لەشکرکێشی گەورەو جەنگی هێرشی پەیتا پەیتای شەپۆلی شالاوبەری مرۆیی زاڵبووە. بەلاّم ئەم زانستە جەنگیەو تاکتیکو ستراتیژەکانی، نەخشەو پلانەکانی، ئامرازەکانی، شێوەکانی، شالاوەکانی، پێشکەوتنو پاشەکشەکانی...تاد. تەواوی ئەوانە لەگەرمەی جەنگی دووەمو دوای ئەوە بەتایبەتی سەرئەنجامی پەرەسەندنی پیشەسازیو تەکنۆلۆژیای جەنگ، گۆڕان. لەپاش ئەم جەنگەو ئەو دیاردە نوێیانە، ئیمپریالیزم هارترو دڕتر، پەرداخترو بێ منەتر دەچوویەگژ شۆڕشی میللەتانی ژێردەستەو لە سەرکەوتنی خۆیان دڵنیاتر بوون. بەتایبەتی ئەوەدەمە سیاسەتێکی سازشکارانە لەلایەن ستالینەوە لەبەرامبەر بزووتنەوەی میللەتانو شۆڕشەکان پێڕەو دەکران. هەربۆیە دەبینین سەرەتا کە ئەمریکا چوو بەگژ گەلی کۆریا، وایدەزانی وەکو پاشماوەی لەشکرە بەزیوەکان بە ئاسانی دەیانبەزێنێ، کە گەلە قارەمانەکەی کۆریا لێیان ڕاپەڕینو سامی سەرکەوتنی ئەمریکا لە جەنگو بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی لە ژاپۆندا، وورەی پێ بەرنەدا بوون، ئەوسا ئەمریکا تەواوی توانای خۆی بەکارهێنا، بەچەکی میکرۆبیو بە پشتیوانی هاوپەیمانەکانیشەوە. کە جەنگ گەرم بوو، ڕاستە میللەتی کۆریا داستانێکی کەم وێنەی قارەمانێتیان تۆمار کرد، بەلاّم لە گەرمەی جەنگەکەدا زوو زاندرا مەحاڵە بەبێ یارمەتی سەرکەوتن بەدەستبهێنن، جەنگەکەش بوو بە گرەوێک لەنێوان ئیمپریالیزمو شۆڕشگێڕەکاندا. ئیمپریالیستەکان دەیانەویست وەکو پاش جەنگی یەکەمی جیهان لەپاش جەنگی دووەمیش تەراتێن بکەن. شۆڕشگێڕانی جیهانیش بەقینی شۆڕشگێڕانە بەهانای شۆڕشگێڕانی کۆریاوە چوون. ئەمەش تەنانەت ستالینی خستە دژخێکەوە، سەرەڕای ئەوەی لە ڕووی سیاسییەوە هەڵەشیان کردبوو، دەبوو بەهانای کۆریاوە بچنو بێ دریغیش یارمەتیان بدەن. کورتیەکەی ئەم یارمەتیەیان درا:

(٥٠٠,٠٠٠) هەزار، واتە نیو ملیۆن (بەڵێ!) ئەو ژمارە سەربازەی چین بە چەکو جبەخانەی خۆیانەوە چوون بەهانای شۆڕشی کۆریاو تەواوی تفاقو تەقەمەنیەکانی جەنگیش شورەوی دابینی کرد. بەتانکو زرێپۆشو فڕۆکەشەوە. ئەگەر وا نەکرایە، قەت ئەمریکا ئەم زیانەی وێنەدەکەوت: سالّی یەکەمی جەنگ (٥٠) ملیارد دۆلاریان سەرف کردووە. بەهاوپەیمانەکانیشیانەوە، (٥٩٨) هەزار کوژراویان داوە، (١٤٦,٠٠٠) چەکی ئاگریان فەوتاوە، (٨٦,٠٣٨) تۆپی

هەمەچەشن شکاون، (٩.١٤٥) ئۆتۆمۆبیلو تانکو زرێپۆش تێکوپێک دراون، (١.١٣.) فڕۆکەیان کەوتۆتەخوارەوەو (١٢٢) پاپۆڕیش سەرنگون کراون. سەرکەوتن لەبەرامبەر بەکارهێنانی توانای وادا بەجەنگی پارتیزانی... لە فیلیپینیش بێ عەقلیە بۆ دەرهێنەرەکەی!

قیتنام:

جگە لەباری هەلکەوتووی سیاسیو کۆمەلایەتیو عەسکەریان. نەک تەنیا یارمەتی پارەو تەقەمەنیو لۆجستیکی هەموو جۆرە پشتیوانیەکی نێو نەتەوەییان هەبوو، بگرە (٢٢٠.٠٠٠) هەزار سەربازی کۆماری میللی چینیش هاوشانی قیتنامیەکان دەجەنگین. چوار هەزاریان گیانی بەختکردووەو تەنیا چین (٣.) ملیۆن دۆلاری لەسەر شۆڕشەکە سەرف کردووە. جگەلە هی شورەویو باقی جیهانیش. ئەگەر وانەبا سەرەڕای هەلکەوتویی هەموو بارێکی قیتنام، کارێکی ئاسان نەدەبوو (ئەگەر زێرنەکەوتنایە) بەرگەی ئەم توانایەی خوارەوەی ئیمپریالیستەکانیان بگرتایە.

دژی فەرەنسیەکان:

(٢٥.) هەزار چەکداری دوژمن، (٥٢٨) یەکانەی هێزی ئاسمانی، (٤٩.) پارچە دەریایی، (٢٦) تیپی تۆپ، (٢٣.) هەزار جاش. ئەمریکا ٨٠٪ خەرجی سوپای فەرەنسای کێشاوە کە دەگەیشتە (٥٠٠) ملیۆن دۆلار. جگەلەوەی سالی ١٩٥١ شەش هەزار تۆپو سالی ١٩٥٣، بیستو پێنج هەزارو پاشان (٨٨) هەزاری دەدانێ. بەردەوام پردێکی یارمەتی گەیاندنی ئاسمانی هەلدەفریو ٢٥. فڕۆکەش بەشداری جەنگەکەیان دەکرد.

دژی ئەمریکاو کۆنەپەرستانی سایگۆنیش

تەنیا کۆنەپەرستەکان (٧١.) هەزار جاشیان هەبووە. ئەمریکا هێزەکانی لەنیو ملیۆن تێپەڕاندووو خەرجی سایگۆن جگەلە ئەمریکا، ملیاردێکو (٦١٤) ملیۆن دۆلار بووە. سەدان فڕۆکەو بە ملیۆنەها تۆپی قورسو ناوەنجیو گچکە، مەرگیان باراندووە. جگەلە گازی ژەهراویو مینو مین کاری.

ڤیتنام: ١- (١٠) هەزار فەدافەند ٢- (٣٢٠) بنکە موشەکی سامئەنداز(٢٠کم) دابەشیندراو بەسەر ٢٠٠ پایەگا ٣- سەرجەم (٤٩٠) فرۆکەو (٥٠) کۆپتەریان هەتا کاتی سەرکەوتن وەرگرتووە.

ڤیتکۆنکیەکان لە سالی ١٩١٥-١٩٦٨دا (٣) ملیۆن تفەنگو ڕەشاش، هەزاران هاوەن، هاوێژەر، موشەک، تۆپی دژی زرێپۆش، (٨٠٠٠) تۆپی مەیدانیو (١٠،٠٠٠) فەدافەندو رادارەکانی، (٥٠) تاقم موشەکی سامی زەوی-ئاسمان، (٢،٠٠٠) ڕادارو (١٢،٠٠٠) ئۆتۆمۆبیلی بارەرو (٣٠،٠٠٠) ئۆتۆمۆبیلی سوکەلەو (٢٠٠) زرێپۆشو (٥٠) کۆپتەرو (٦٠٠) فرۆکەو (٥٠) بەلەمی شەڕکەر. ئیتر چۆن سەرناکەون؟*.

بەبێ پشتیوانی ئەو شۆڕشانە هەرگیز سەرنەدەکەوتن. تەنیا دەیانتوانی لەمێژوودا گەورەترین قارەمانی تۆمار بکەنو هیچی دیکە. شۆڕشی درێژخایەن لەم سەردەمەشدا، کەباری لەباری سیاسی وەکو کوزیلو ڤیتنامیش دوویات نابنەوە بۆیان، هەلومەرجی جیهانیش پێچەوانەی ڕەوتی خەباتی چەکداریە. بۆیە سەرکەوتنی بەبێ یارمەتی دەرەکیو بەپشتیوانیەکی گەورەتریش، بەتایبەتی دژی ڕژێمی دەوڵەمەندو دەسەلاتداری وەکو بەعسی عێراق، مەحالە.

مەبەستەکە ئەوە نیە یارمەتی دەرەوە گرنگترە لە خەباتی خودی میللەتان، نەخێر هەر خەباتی میللەتان بنەڕەتە بەلام یارمەتی دەرەکیش وەکو کۆن باس‌دەکرا تەنیا فاکتەرێکی دەرەکی نیەو بەس، هاوشانی خەباتی میللەت بۆ خەباتی چەکداری درێژخایەن، پێویستیەکی هەرە گرنگی چارەنووسازە. هێندە گرنگە ئەگەر تەواوی پێداویستیەکانی ناوەکی شۆڕشی درێژخایەن، لەبەرامبەر ڕژێمە پەرداختەکاندا لەبارینو یارمەتی دەرەکی مسۆگەر نەکرابێ، سەرچلێتیە شۆڕش بکرێ.

## ٦/٤- شۆڕشی چەواشە

یەکێکە لە شێوازە ترسناکەکانی بەزاندنی پارتیزان. ئەمریکاییەکان لەپاش جەنگی دووەمو دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان لە ئەزموونەکانی جەنگی پارتیزانی:

---

* سەرجەمی شۆڕشەکانی کوردستان لەپێش جەنگی یەکەمەوە هەتا ئێستاش نیو چارەکی ئەو یارمەتیانەی وەرنەگرتووە. دوژمنانیشی هەمیشە بەهێز کراون.

چین ڤیتنام، مالیزیا، لاوس، کەمبوجو ئەفەریقیا...تاد. لێکۆڵینەوەی قوڵیان لەمەڕ هۆی ئابوری، کۆمەڵایەتیو سیاسی بەرپا بوونی جەنگی درێژخایەن کردو چۆنیەتی سەرکەوتنی عەسکەری پارتیزانیان لە: جەنگی پارتیزانیەوە بۆ جەنگی بزوتو جەنگی بەرگری ستراتیژیو جەنگی هاوتایی ستراتیژیو بۆ دواجاریش جەنگی هێرشی ستراتیژی بە وردی هەڵسەنگاندن. نەخشەی جەواشەی ئابوریو کۆمەڵایەتی، سیاسیو عەسکەری بەرزیان بۆ داڕشت. پارەیان بۆ هەڵڕشتو چەکیان بۆ داهێناو پرۆپاگەندەیان لەسەرکردو سیستەماتیکیانە تەواوی توانای خۆیان بۆ بەزاندنی پارتیزان هەر لەسەرەتاوە یات کۆتایی خستەکار. لەمەشیاندا زرنگانە توانیان بە: نەخشەی نوێ، سیاسەتی نوێ، جەنگی نوێو چەکی نوێ بەرژەوەندیان لەسەر ئاستی دونیاو نۆکەرانیان لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا بپارێزن. لەوچەکە نوێو نەخشە نوێیانەی زیانی زۆریان گەیاندە پارتیزان: ڕاگواستنی گوندەکانو دروستکردنی دێی تەلبەندکراوی زۆرەملێی جووتیارانو دروستکردنی دەستەی ساختەی پارتیزانو جاشو نانەوەی ئاژاوەی نێو هۆزەکانو پەیدابوونی کۆپتەر وەکو چەکێکی عەسکەری کوشندە سەبارەت بە پارتیزان هەروا جەنگی ناوخۆییش.

کۆپتەر وەکو دیاردەیەکی عەسکەری وەرچەرخێنەر لە مێژووی جەنگی پارتیزانیدا دەتوانێ: موشەکی زۆر هەڵبگرێ، شەستیر بەکاربهێنێ، چەندین نارنجۆک لە نزمەمیەوە هەڵڕێژێ، کام شوێنو شاخ هەڵەموتو زەردوماهە، بەزووترین کات بیگاتێ. لەسەر بەرزترین لوتکە لە کەمترین کاتدا (ئینزالی) (٣ـ. ٤.) (قوە خاسە) بکات. هاوەن، تۆپی (١٢.)ملمو ئازوقەو تەقەمەنی زۆر دەگەیەنێتە ئۆردوگا دوورەکانو ڕەبایە پەرتەوازەکان. سەرەڕای ئەوانەش کۆپتەر لەدەستنیشانکردنی دەستەی پرتیزانو پیادەکردنی هێز بۆ گەمارۆدانیان ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێڕێ.

جەنگی شۆڕشی چەواشە، چەشنی کۆن نییە. لەم جەنگەدا، پایەگاکانی سەرشاخ دەشتوەدەرو ناو گوندەکان، ڕۆڵێکی دینامیکیان دەدرێتێ. وەکو ئەوپەڕەکەی لە پایەگایەکدا ئەوپەڕەکەی (١٥-٢٠.) سەرباز دادەندرا و ئەمانەش بە شەوو ڕۆژ بۆیان نەبوو لەشوێنی خۆیان لە هەموو حاڵەتێکدا ببزوون، بەڵام ئێستا ژمارەیان لە (٥ـ. ١٠..) سەربازو جاش دەبێو لە هەموو کاتێکیش دەبێ بۆ گەڕان بەدوای پارتیزاندا بگەڕێنو بجەنگێنو گەمارۆی پارتیزانەکان بدەن هەتا

کۆیتەروکاروانی سەربازی گەورە بەهانایانەوە دێنو ئەڵقەی گەمارۆدانەکە تەسک‌تر دەکەنو دەستەی پارتیزانەکان تەفروتونا دەکەن. کەم جار هەڵدەکەوێ دەستەیەک پارتیزانی ۱۰ پێشمەرگەیی یان پتریش لەسەر زەمین گەمارۆ بدرێنو بە کۆیتەریش دەستڕێژ بکرێنو توانای دەربازبوونیان هەبێ.

کورتیەکەی... شۆڕشی چەواشە ترسناکترین شێوەی بەگژاچوونەوەی پارتیزانو سەرکوتکردنی شۆڕشگێڕانی شۆڕشی درێژخایەنە کە زۆر ستەمە لە هەلومەرجێکی جیهانی ئەوتۆدا کە دوژمنان قودرەتمەندبنو پشتیوانی جیهانیان لەلایەن ئیمپریالیستو ڕۆژئاواو شورەوییەوە بەهێزبێ، پارتیزان بتوانێ بەچەکی سوکو لەڕێگای دەست‌خستنی چەکی دوژمنەوە بە: کلاشینکۆفو بڕنەو، ئەوپەڕەکەیشی بە ئاربیجیو بیکەیسی یان زۆرتر بڵێین بە دۆشکە، تۆپی (۱۲۰ ملمو هاوەنیش، (دەست‌خستنی ئەمانەش گرانە) سەرکەوێ. ئەزمونی سەرلەنوێ هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەم جارەی کوردستانی عێراق بەڵگەی زەقی ئەم ڕاستیەن. پێشتریش کۆیتەر لە شۆڕشەکانی یۆنان، ئیسپانیا، مالیزیا، پۆلیڤیاوخەرزەنتین ڕۆڵی رووخێنەری گەورە گرانی گێڕا. ئێستاش جگە لە کوردستان لە فیلیپین، پیرۆ، سلڤادۆر، ئەریتیریا، فەلەستینو لوبناندا چەکی گەورەی رژێمە سەرکوتکەرەکانن.

شۆڕشی چەواشە... بەتوانایەکی گەورەتر، بەپارەو چەکێکی فرەتر، بەنەخشەی وردترو مەشقی پتر، بە لەشکرو جاشێکی زۆرتر، زەویو دەریاو ئاسمان دژی پارتیزان دەکەنە مەیدانی جەنگێنو بێ گوێدانە زیانی مرۆیی و دارایی، ئەوپەڕی هەوڵدەدەن پارتیزانەکانی شۆڕشی درێژخایەن سەرکوتبکەنو لەپێناوی ئەمەش لە هیچ تاوانێک، سزایەک، بڕیارێک ناپرینگێنەوەو بەکۆمەڵ کوشتنی هەزاران چەکدارو بێچەکیش لایان ئاسانو ئاساییە.

جگەلە هەموو ئەوانە، نەخشەکانی شۆڕشی چەواشە بایەخ‌پێدانە بە جەنگی سایکۆلۆژیو دڵساردکردنەوەی جەماوەرو جەنگاوەر جۆرەها: درۆ، بوختان، قسەلۆک، ناوو ناتۆرەو تۆمەتی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ هەڵدەبەستنو لە کەناڵی جۆراوجۆرەوە بڵاویان دەکەنەوە. ناوی ڕێبەرانی پارتیزان، کادیرەکانیان، ئەندامی ڕێکخراوو پێشمەرگەکانیان دەزڕێنن. کەسوکاریان دەگرنو دووردەخرێنەوە. یان ڕێزیان دەگرنو موچەش بۆ هەندێ لە کادرە سیاسیو عەسکەریەکان دەبڕن هەتا دڕدۆنگی لەناو جەماوەردا سەبارەت بە کوڕی ئەو خەڵکەی پارتیزانە، دروست

بکەن.
لەکاتی پەلامارو هێرش‌دا جاری وادەیە لە گوندەکاندا ئازوقە دەدەنە گوندە دوورەدەستەکان، پارمەتیان دەدەن، بێکارەکانیان دادەمەزرێنن، ئەگەر جاران بۆ هەزار تکاو سکالاً لە مزگەوتێکدا مجێورێکیان دامەزراندبێ، ئەوا ئێستا بە بچووکترین مزگەوت چەندین مجێوری بۆ دادەنێن‌و پارەی باشیشیان دەدەنێ، هەروەها بۆ قوتابخانەو جەنگەڵەکانیش.
گەورەترین پارتیزانی تاوانبار بچێتەوە ریزی دوژمن، نەک دادگایی ناکەن، بگرە رێزیشی لێدەگرن‌و هەوڵدەدەن دەستەی شۆڕشی چەواشەشی بۆ پێکەوە بنێن‌و چونکە چاک شارەزان، بەریاندەدەنەوە گیانی هاوسەنگەرەکانی کۆنیان. لەم کارەش جگە لە سودی عەسکەری، دڵساردکردنەوەی خەڵکیش دێننەدی. لەکاتێکدا کۆن پارتیزان تەسلیمیش‌بانەوە، دەکوژران.
شۆڕشی چەواشە لەم سەردەمەدا هەتا ئەوڕۆژەی میللەتانی ژێردەستە تەمای جەنگی پارتیزانی‌و شۆڕشی درێژخایەنیان مابێ، مەترسیەکی گەورەی رێی سەرکەوتنیانە کە هاوشانی دیاردەو دەرکەوتەکانی دیکەی جیهان، شۆڕشی چەواشەش هۆیەکی ترسناکی لەباربردنی شۆڕشەکانن. ئەگەر هەتا کۆتایی شەستەکانیش تەنیا لەبەرامبەر پارتیزانە لاوازەکان شۆڕشی چەواشە سەرکەوتنی عەسکەری هێنابێتەدی، ئەوا لەوەبەدوا شۆڕشی چەواشە چ لەڕووی عەسکەرییەوەو چ لەڕووی سیاسییەوە، ئاسانتر نەخشەکانی پیادە دەکرێن‌و ئامانجەکانی رژێمەکانیان پێ دێتەدی، هەر ئێستاش ئەگەر کۆنەپەرستەکانی شۆڕشی چەواشەی (کۆنترا) لە سلڤادۆردا نەبان، دوور نەبوو پارو پێرار شۆڕشەکانی سلڤادۆر سەرکەوتن بەدەستبهێنن. بۆیە حیسابکردن بۆ شۆڕشی چەواشە لەم قۆناخەدا، گەلێک گرنگترە لە قۆناخەکانی لەمەوبەر.
رەنگە چەوساندنەوەی بێزادەی میللەتانی ژێردەستە رقی پیرۆزی رزگاری رۆڵەکانی وا ئەستوور بکات بتوانن بەچەکی سووک‌و بەگیانبازی سەدان‌و هەزاران شەهیدیان، ساڵەهای ساڵ بەرهەڵستی شۆڕشی چەواشە بکەن. لەسەدان شەڕو شەڕگەشدا سەربکەون، دەستکەوتی گەورەشیان هەبێ، هەندێ ناوچەو شاخ‌و گوندو شارۆچکەیش بەشێوەیەکی کاتی رزگار بکەن. هەروەها بشتوانن سۆزی هەزاران کەسیش بۆلای خۆیان راکێشن‌و دەنگ‌و سەنگێکی گەورەشیان لەسەر ئاستی جیهاندا هەبێ. بەڵام هیچی ئەوانەو زیاتریش لەبەرامبەر باری سیاسی‌و لەسێبەری

تەرازووی عەسکەری سەردەمەکەدا ناتوانن سەرکەوتن بهێننە دەیت ئەگەر پارتیزانەکان نەتوانن پشتیوانی ستراتیژی جیهانی (نەک دوژمنی دوژمن ـ دۆستی کاتی) دابین بکەن‌و دژخی بابەتی تێکچووی دوژمنیان لەهەموو بارێکەوە بقۆزنەوە.

تازە لەم سەردەمەدا، نەهێزی شەڕکەرو نەشەڕی ئازایانەو نە سۆزی خەڵک بزوێنی شەهیدان، نە دیسپلین‌و نە چاپوکی‌و چالاکی پارتیزانەکان‌و هەڵکەوتن‌و پیداهەڵدانی ڕێبەرانی عەسکەری‌و سیاسی، تازە تێکڕای ئەوانە ناتوانن دەستەبەری سەرکەوتنی جەنگی پارتیزانی‌و شۆڕشی درێژخایەنبن.

لەلایەکی‌دیکەشەوە باری ئابوری‌و کۆمەلایەتی گۆڕاوە. گۆڕانکاری چینایەتی ڕوویداوە. جووتیاران بایاندابێتەوە. بۆرژوای پیشەسازی هەڵگەڕابێتەوە... هاوژینی ئاشتیانەش‌و هاوئاهەنگی نێونەتەوەییش لە کوژاندنەوەی کوانووی جەنگە ساردو پارتیزانەکان بەدەیهێندراوە. لەم‌لایشەوە دوژمنان بەهێزو نەخشەی شۆڕشی چەواشەیان گەیشتبێتە لوتکە، چیدیکە کارێکی دووربینانە، ژیرانە، شۆڕشگێڕانە نییە بە چەمکەکانی کۆن، تاکتیک‌و ستراتیژەکانی کۆن، بیرلەوە بکرێتەوە جەنگی پارتیزانی لەسەر بەری ناکۆکی باش،یان بەهۆی هەستی نەتەوایەتی زاڵ، پشت‌ئەستوور بە دوژمنایەتی کاتی دەوڵەتە بۆرژواکان بەرپا بکرێ‌و ڕەچاوی سەرکەوتنیش دوای ساڵەها بکرێ. بۆ ئەوەی ئەم ڕاستیەش پتر ڕوون بکرێتەوە واباشە بابەتێکی دیکەیش بکەینە تەواوکەری هۆی بەبنبەست گەیشتنی جەنگی پارتیزانی بە پرینسیپەکەی جارانی.

# ٧- شۆڕش لەنێوان دوو ڕێبازدا

مەبەستیش لە دوو ڕێباز، ڕێبازە سەرەکییەکانی سەرکەوتنی گەلانە، نەک شێوەو شێوازەکانی دی کە جگە لەوەی دەبێ لە خزمەتی شۆڕشدابن، هەرگیز ڕزگارییان پێ نایەتەدی، وەکو: ڕیفۆرمو پەرلەمانیزمو هاوکاری دۆستایەتی کاتی... تاد. نەخوازەللا ئەم ڕێچکە لاوەکییانە بکرێنە بڕیکاری شۆڕش، ئەو دوو ڕێبازەش ڕێبازی شۆڕشی درێژخایەنو ڕێبازی ڕاپەڕینی کۆمەڵایەتی خەڵکە. پێش ئەوەی باسی ئەوەش بکەین کە کام لەو دوو ڕێبازە ئێستا سەرەکین، واپەسندە بۆچوونی دیکە تەتەڵە بکەین هەتا بزانین چۆن چۆنی کراوەتە دەمامکی چەواشەکردنی کرێکارانو چەشەی هێشتنەوەی ڕژێمە بۆرژواکانی وڵاتانی ژێردەستەی ئیمپریالیزم. دیارە ناشمانەوێ بچینە ناو وردو درشتی ئەم باسە. مەبەستەکە تەنیا ڕێخۆشکردنە بۆ باشتر هەڵبژاردنی ڕێبازە شۆڕشگێڕییەکەی سەردەم.

ئێمە پێشتر باسی گەشەکردنی ناسەرمایەدارییمان بە ئاراستەی سۆسیالیستی کرد کە لە شەستەکانەوە هەوڵدراوە بکرێتە ئاقاری ڕاستەقینەی خەباتی چینایەتی کرێکارانو زەحمەتکێشانی وڵاتە ڕزگاریخوازە تازە پەرەسەندووەکان. بۆئەمەش سەدان لێکۆڵەرو نووسەری بەناوبانگی شوورەوی، پاش مردنی ستالینو لە هاتنی خرۆشۆفەوە کەوتنە هەوڵو نووسین، جگە لەوەی تیۆری وا ئەزۆک، نەک تەنیا سەری نەگرت، بگرە هەڵیشگەڕاپوونە شۆڕشی چەواشەی سۆسیالیزم.

ئەم تیۆرە بۆیە لەلایەن حیزبە "شیوعییەکانەوە" پێشوازی لێکراو دڵسۆزانە جێبەجێشیان کرد، چونکە ئەو حیزبانە کۆنترین حیزبی وڵاتە ژێردەستەکان بوونو بەدرێژایی زیاتر لە ٣٠-٤٠ ساڵ بەرەو ژووریش (هەتا شەستەکان) ئەرکی هەرە

گرنگی کۆمۆنیستەکان کە بە ڕوونی لە مانیفێستەوە بڕیاری لێدراوە، ئەویش: ڕووخاندنی بۆرژواکان لەلایەن ئەو حیزبە شیوعیە کۆنانە فەرامۆش کرابوو. لەبەرنامەکانیاندا تۆخنی نەکەوتبوون، دەیانویست ڕژێمە پاشایەتیە کۆنەپەرستەکان ئەڵقە لەگوێکانیش بگۆڕن و دیموکراسی بۆرژواییان پێبهێننەدی، هەرلەیەکیش باسی ڕووخاندنی ئەو ڕژێمانەی کردبا ئەم (حیزبە شیوعیانە) بە لادەرو توندڕەویان لەقەڵەم دەدان و خۆشیان بە مەعقول دەزانی، هەربۆیە کە بۆرژوای وڵاتانی ژێردەستە بە کودەتا بوویێ یان بە قۆستنەوەی ڕاپەڕینی خەڵک هاتبنە سەرکارو ئەو حیزبانەش دەیان هەڵیان لەدەستدابوو تازە لەخۆیان باش تێگەیشتبوون حیزبی پرۆلیتاریاو شۆڕشی سۆسیالیستی نین، بۆیە کە تیژی گەشەکردنی ناسەرمایەداری لەلایەن شورەوییەوە خرایە ئارا، ئەو حیزبانە وەکو شەهدی هەنگیان بۆ یەکەم جار دۆزیبێتەوە ئاوەها بێچەندو چۆن گەشەکردنی ناسەرمایەداریان پێڕەوکردو کەوتنە پاساودانی سەرسوڕهێنەری تیژەکە. ئیدی بەرگری وایان لە ڕژێمە نەتەوایەتیە دیموکراسیە بۆرژوا دواکەوتووەکانیان دەکردو بەرەو سۆسیالیزمیان پەلدەکێشان... دەنگوت بەڕاستی ڕژێمەکان کوێرن و ئەمانە ڕێی سۆسیالیستیان پێنیشان دەدەن. دەیانویست دەیان جار مێژوو دووپات بکەنەوەو دەیان کاستڕۆش دابتاشن، نەیاندەزانی مێژوو دووپاتۆ کاستڕۆش دروست نابێتەوە! ئا بەو مایە یەمەنیان بەدەستەوە ماوەو ئەمیش جگە لەو هەموو کێشەو شەڕی بێهودەیەی ناوخۆو نزمی ئاستی ژیانی خەڵکەکە، کتێبان بۆ سەلامەتی پاشەڕۆژیان ناخوێندرێتەوە! وای بەسەرهێندراوە هەر بۆ نموونەی چاولێنەکردن باشە، نەک چاولێکردن*.

ئێستا لەسەرانسەری جیهاندا بەتایبەتی لەناو ئەو وڵاتانەدا کە دەرکەوت گەشەی ناسەرمایەداریان نەکردو نەشگەیشتنە سۆسیالیزم، هەروەها لەناو میللەتانی داگیرکراوی دابەشکراویشدا لایەنە شۆڕشگێڕەکان ڕووبەڕووی بەرنامەی شۆڕشگێڕانەی دوورودرێژ هاتوون. ئەم لایەنە شۆڕشگێڕانە یان دەبێ لە ڕوانگەی چینایەتییەوە ئایندە ئەنگێوی شۆڕشگێڕ بن یان نەمێنن، تازە چیدیکە باری ئەوە نەماوە هیچ لایەک بە سیاسەتی (توفیقی) خۆی بە شۆڕشگێڕ بزانێ. ستراتیژی چینایەتی پێویستە ڕۆشن بێ و تاکتیکەکانیش لەو ستراتیژەوە

* دوای دەرچوونی چاپی یەکەمی کتێبەکە، یەمەن تەپی و ئاوێتەی یەمەنەکەی دیکە بووەوە.

ڕەنگبدەنەوە. لایەنە چەپەکان پێویستیان بەوە نییە دروشمە سواوەکانی بۆرژواکان ئارایش بکەن گوایە باشتر لەوان هەوڵبدەن جێبەجێیان بکەن. ئەم جۆرە بیروڕایانە بەرنامەی سیاسی شۆڕشگێڕانەی ئەم قۆناخە دەشێوێنیو ئەگەر ئەوبیرو ڕایانەش ڕیشەکێش نەکرێن بێگومان لە داهاتوودا بەرنامەی ئایدیۆلۆژیش دووچاری ئاستەنگی دژوار دەکەن. ئیدی پاش ئەو هەموو کارەساتانە، دوای ئەو هەموو تێکشکانو بێهودەییەی داکۆکی لێکردنی بیروڕای ناڕاست، کاتی ئەوە هاتووە گروپە مارکسیو چەپەکان، خەڵکی شۆڕشگێڕ، بەهێمنی بیر لە پاشەڕۆژ بکەنەوەو بکەونە (بۆلێن-مونازەرە)ی هاوڕێیانە بۆ بەرنامەی ڕێکخراوەیی، ئایدیۆلۆژی، سیاسیو پیشەیی شۆڕشگێڕانە. هەوڵبدەن شاڕێبازی شۆڕشگێڕانەی سەرکەوتنو ئەڵتەرناتیڤی ڕاستەقینە بدۆزنەوە.

## ٧/١- شۆڕشی شاخەکان (ڕێبازی یەکەم)

پێشتر لەم بارەوە قسەی زۆر کراوە، ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەمەیە کە لەناو بزووتنەوەی چەپدا ئێستاش شۆڕشی درێژخایەن (کە یەکێکە لەو دوو ڕێبازەی باسیان لێوەدەکەین) برەوی زۆرەو پتریش لە باقی ڕێبازەکانی دیکە قسەی لێدەکەن. بگرە هەوڵیشی بۆ دەدرێو لە چەندین وڵاتیشدا لەناوچەندین میللەتیشدا پێڕەو دەکرێ، هەر لەم بارو دۆخەدا شۆڕشی درێژخایەن لە: کوردستان، فەلەستین، کەمبۆجیا، تامیل(سریلانکا)، پیرۆ، پۆلیساریۆ، ئەریتیریا، فیلیپین، سلڤادۆر... بە ڕێبەرایەتی جۆراوجۆری: نیشتمانی، چینایەتی، مەزهەبی. تەقەی تفەنگی پارتیزانەکانیان دێ. ئێستاش لە زۆربەی وڵاتە دواخراوەکان بە لایەنی کەم، لایەکی سیاسی هەیە ئاڵای سوورهەڵگری شۆڕشی درێژخایەنەو گروپی واش هەن، پێنج کەللە سەری: (مارکس، ئینگلس، لینین، ستالینو ماو)یان کردۆتە دروشمی دڵسۆزی بۆ خەباتی چەکدارانەی درێژخایەن. ئامادەش نین لایەنی کەمی ئەو تاوانانەش بسەلمێنن کە لەسەر ستالین سەلمێندراون یان ئامادە نین گوێش لەوە بگرن لە چیندا هەڵە هەیە واتە: دڵسۆزی هەندێ گروپ بۆ شۆڕشی درێژخایەنی چەکدار ئەندێشەی دۆگماتیزمانەی هەیەو بەهیچ کلۆجێک ئامادە نین گۆڕانو ئاڵوگۆڕە ئابووریو کۆمەڵایەتی، سیاسیو عەسکەریەکان لەبەرچاوی چاوگێڕانەوە بە ڕابردوو بگێڕنو ئەو کارکردنە کاریگەرانە نابینن کە گۆڕانکارییەکان لەسەر شۆڕشی درێژخایەنیان داناون.

ویراش، ئەندیشەی ئەم گروپانە بەشێوەی کۆنە چینی و چیقاریبەکەی بمانەوی و نەمانەوی رژێمەکان زیاتر لە راستڕەوەکان حسابیان بۆ دەکەن، سەیریش ئەوەیە حیزبە راستڕەوەکان کە بە ناچاری دەشچنە پاڵ خەباتە چەکداریەکان، رژێمە دیکتاتۆرەکان کەمتر لە گروپە چەپەکان حسابیان بۆ دەکەن و لەڕووی عەسکەرییەوە بەبێ پێیان دەزانن، پێدەچێ رژێمەکانیش ئاکامی نزیکیان لەوانە بەدرێژایی چەندین ساڵ هاوپەیمانێتی، باشیان بناسن، بۆیە گوێ نادەنە ئەوەی بچنە پاڵ شۆڕشی چەکداری، هەربۆیە لە گەرمەی شۆڕشی چەکداریشدا گەرمتریان دەچەوسێننەوە. ئەو بایەخ پێدانەی رژێم بە راستڕەوەکان هۆی مێژوویی و سایکۆلۆژیان هەن، لەبەرامبەردا چەپەکان لەناو خەڵکدا بەتایبەتی لەناو لاواندا خۆشەویست دەکات. چونکە هەمیشە دوژمن بەتوندی دژی چ لایەک بێ، ئەولایە زیاتر ریزی دەبێ. ئەمە جگە لەوەی رێبازی شۆڕشی درێژخایەنیش زۆرتر لەگەڵ باری سایکۆلۆژیەتی لاواندا دەسازێ ئەم هۆیەش دوای گۆڕانەکانی تەمەنی شۆڕشی چەکداری ساڵەها رادەگرێ جا کە راستەقینەیی بوون و مانی شۆڕشی درێژخایەن وابێ رووداوە جیهانیەکانیش وا گۆڕابن، دەبێ دوا حوکمی راست لەسەر شۆڕشی چەکداری چۆن بێ؟

پێشەکی دەبێ بزانین کە خەباتی شۆڕشگێڕانە، واتە شۆڕش بە چەمکە چینایەتی و نیشتمانیەکەی لەبەرامبەر زەبری کۆنەپەرستانەی سەرمایەداران و داگیرکەراندا لێبڕاوترین رێگای سەرکەوتنی کرێکاران و رزگاری گەلانە هەتا ئەڕۆژەی ناکۆکی نێوان کاروسەرمایەو گەلی داگیرکراوو داگیرکەر مابێ، ئیمپریالیزم بمێنی و خوێنمژینی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە درێژەی بدرێتێ، شۆڕش و شۆڕشگێڕێتیش دەستەبەری راستەقینەی سەرکەوتنی چەوساوەکانە بەسەر چەوسێنەراندا، بەتایبەتی بۆ کرێکاران و ئاڵاهەڵگرانی شۆڕشگێڕان.

شۆڕش و شۆڕشی چەکداری درێژخایەن، هەتا هەتایە گرێنەدراون و مەرج نیە تەواوکەری یەکدی بن، شۆڕش چەمکێکی سیاسی فروان و بەرینی هەیە ئەگەرچی بەشێوەیەکی گشتیش لەناو بازنەی توندو تیژیشدا پێچەوانەی ریفۆرم و لیبرالیزم هەڵدەسوڕێن.

پەندو دەرسەکانی مێژوو وا تۆمارکراون کەوا هەردەم چەوساوەکان هەوڵیانداوە لەبەرامبەر چەوسێنەرە دەسەلاتدارەکاندا سەرکەوتووترین رێگای بەرهەڵستی و سەرفرازی بگرنەبەر بەکەمترین زیان و لەکورترین کاتدا، دوژمن بەچۆکدا بهێنن.

کورتیەکەی شۆڕش: سەری شۆڕشگێڕانە لەئاسن‌دانی دوژمن نیە، بەڵکو جۆشدانی گوڕەی ئاگری قینی پیرۆزی خەڵکە بۆ تواندنەوەی ئاسنی دەسەڵاتی دوژمن، دوژمنی چینایەتی یان هی نەتەوایەتی بێ.

کۆن کە جووتیاران بزوێنەری بزووتنەوەی شۆڕشی چەکدارانە بوون ئێستا وانەماون، جاران کە بەشێکی بۆرژوا لەریزی خەباتی نیشتمانیدا بوون، ئێستا پێچەوانەن. باری تەکنۆلۆژیاو سیاسەتی نێودەوڵەتانیش بەهۆی تەکنیکی بالأوە گۆڕانی سەیری بەسەردا هاتووە، واتە نەک هەر کۆمەڵ، بگرە سروشتیش گۆڕاوە. بەزۆریش گۆڕانی سروشت لە قازانجی رژێمەکان‌و شۆڕشی چەواشەدایە.

چۆن... کۆن بەسەزارەها کرێکاری ئازا، ۱۰ ساڵ کەمتری نەدەویست جادەیەکی هەزار کیلۆمەتری پان‌و پۆڕ تەخت بکا هەتا بتواندرێ کامیۆنی بارو کاروانی عەسکەری گەورەی پێدا تێپەڕێ. ئێستا بەدەیان بلدۆزەرو بەدەنەمێت‌و بە کرێکارێکی کەم‌و لەماوەیەکی کەمیشدا لە شوێنە سەختەکانیشدا دەتواندرێ جادە بەسەر دژوارترین کێودا تەخت بکرێ‌و کاروانی عەسکەری گەورەشی پێدابپەردرێ.

سەرخستنی جادە بەسەر شاخی کورەک‌و سەرتیزو گەلی عەلی بەگ‌و دەوروبەریاندا، تەرازووی هێزی جەنگینی لەنێوان دوژمن‌و شۆڕشی ئەیلوولدا بە قازانجی لەشکرکێشی دوژمن گۆڕی. چونکە تانک‌و زرێپۆش‌و سەدان تۆپی قورس‌و هەزاران سەربازو پێویستیە جەنگی‌و لۆجستیکیەکانی جەنگ، بەئاسانی دەگەیەندرانە شەڕگەکان. بەڵام شۆڕش نەیدەتوانی لەماوەیەکی زۆردا نیوەی ئەو هێزەش کۆبکاتەوە کە بۆ بەرسنگ لێگرتنی هێزی هێرش‌کەری داگیرکەر پێویست بوو.

جگەلە نابەرامبەری چەکە قورسە مەیدانیەکان، فرۆکەی جەنگینیش کە

کوشندەترین چەکی خێرای سەردەمەکەیە بۆ جەنگی بەرەیی‌و دوورەدەستی مەیدانی، وا پێشخراوە لە تەڕو تووشترین کەشداو لە تەم‌و مژو تاریکەشەوی ئەنگوستەچاویشدا، چوار وەرزە بۆمبای مەرگچێن هەر دەبارێنن.
پێشکەوتنی پیشەسازی، تۆپۆگرافیەتی دژواری، سروشتی گۆڕیوەو گۆڕینی سروشتیش لەشکرکێشی مەیسەرتر کردووە. ئەمەش شوێن‌و شاخی لەگرتن نەهاتووی بەدەست پارتیزان‌و هێزی چەکداری ئۆپۆزیسیۆنەوە لە هەندێ شوێنی وڵاتاندا لە هەندێکی دیکەشدا هەر نەهێشتووە. (وەکو: فەلەستین‌و کوردستانی بەشی تورکیاو کوردستانی بەشی ئێران) واتە بەهۆی گۆڕینی تۆپۆگرافیەتەوە پارتیزانەکان، قوڵایی ستراتیژی، پاشەکشە، مانۆر، دەرفەتی خۆشاردنەوە، پاراستنی بنکە، حەسانەوەی تەنگەبەرکردوون‌و دڵنیا بوون لە بارەگای سەرکردایەتیەکەی، ڕاگەیاندنەکەی، نەخۆشخانەکەی، دەبۆی ئازوقەو تەقەمەنیەکەی... نەهێشتوون.
پارتیزان بەشێوەیەکی کاتیش بنکەو بارەگاش دابمەزرێنێ، هەمیشە مەترسی گەورەی تۆپی دوورهاوێژو فڕۆکەی تیژڕەوی لەسەرە... ئەمانە جگە لەوەی هێزێکی زۆری پێشمەرگەیش دەبێ بۆ پاراستنی ئەو بنکەو بارەگایانە بەتایبەتی سەرەکیەکان، کۆبکرێنەوە. کردنی کاری واش لەسەر حسابی پرێنسیپی پارتیزانە. هەر ئەمەش بەناچاری پارتیزانەکان بۆ شەڕی بەرەیی فروان‌و ناوەخت ڕادەکێشێ، کە دوورە لە نەخشەی جەنگی پارتیزانی‌و جووتە لەتەک نەخشەی شۆڕشی چەواشەدا.
ئەگەر پارتیزانەکان هاوسنووری وڵاتێکی دۆست نەبن لەبەرامبەر دوژمنی باڵادەستدا، زۆر دژوارە بتوانن بەچەکی باشیش بە پێشمەرگەی ئازاو زۆریش بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ دژی چەکی قورسی دوژمن‌و شاڵاوی پەیتا پەیتای لەشکرەکانی، بۆردومانی فرۆکەکانی، تۆپبارانی تۆپەکانی، خۆیان لەبنکە هەمیشەییەکانیاندا بگرن. بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا دوژمن جگە لەمیلیتاریستەکردنی ناوچەکانی پارتیزان، سەرباری ئابلوقەی عەسکەری، گەمارۆی ئابووری ناوچەکانی پارتیزان دەدات‌و کێڵگەو خەرمانیش دەسوتێنێ، برسێتیش بۆ پێشمەرگەو خەڵک لەگەرمەی جەنگ‌و ئاگربارانەدا پشتشکێنە. ئەوە سەبارەت شۆڕشی بێ‌پشتیوان، کەم‌توانا، بێ‌چەک‌و هێزی لاواز گومانی تێدانیە وایە. بەڵام لە وڵاتانی سەرکوتکەردا چەکی تەکنۆلۆژیا واگەشەی کردووە

ته‌نانه‌ت شۆڕشه به‌هێزو خاوه‌ن پشتیوانه گه‌وره‌كانی جیهانیش خۆیان ناگرن.

**شۆڕشی فه‌له‌ستین:**

فرۆكه نه‌بێ، ویڕای له‌هه‌زاران هه‌زار جۆر چه‌كی سوك، تۆپی قورس‌و زرێپۆش، تانك، تۆپی‌دوورهاوێژ، راجیمه، كاتیوشا، فه‌دافه‌ندو ده‌یان هه‌زار جه‌نگاوه‌رو یارمه‌تی سه‌دان ملیۆن دۆلار... كه‌چی یه‌ك په‌ڵه له‌خاكی فه‌له‌ستین‌و بنكه‌یه‌كی شۆڕشیان له‌ناو نیشتمانی داگیركراویاندا نییه. به‌ڵكو تاكه مه‌فره‌زه‌یه‌كیشیان ناتوانێت شه‌وێكیش له‌ناو خاكی فه‌له‌ستیندا خۆی ڕابگرێ‌و ئیسرائیل هه‌ر كه‌پێیزانی ده‌یفه‌وتێنێ. چونكه ئیسرائیل له شۆڕشه‌كه ئێجگار به‌هێزتره‌و شوێن‌و شاخ نه‌ماوه كۆنترۆڵی نه‌كردبێ. شاخ نه‌ماوه جاده‌ی بۆ نه‌بردبێ‌و له‌شكره‌كه‌شیان به‌نوێ‌چه‌شنترین شۆڕشی چه‌واشه مه‌شق دراون.

**كه‌مبۆجیا:**

به‌رهه‌ڵستكارانی، خاوه‌ن ئه‌زموونێكی زۆری جه‌نگی پارتیزانین، له‌چه‌ندین ده‌وڵه‌تی زلیشه‌وه پشتیوانی گه‌وره‌ش ده‌كرێن. كه‌چی ناتوانن له‌ناو قوڵایی ولاته‌كه‌یاندا وه‌مێنن‌و به‌هه‌ر سێ هێزه سه‌ره‌كییه‌كانیانه‌وه (پۆلپۆته‌كان، سونسانیه‌كان‌و سیهانۆكیه‌كان) له‌سه‌ر سنووری تایلاند.

**پۆلیساریۆ:**

له‌به‌رامبه‌ر ڕژێمێكی لاوازی وه‌كو مه‌غریبیش پشتیوانیه‌كی گه‌وره‌شیان هه‌یه‌و حكومه‌تی كاتیشیان دامه‌زراندووه... به‌ناچاری بنكه سه‌ره‌كیه‌كانیان له‌ناو جه‌زائیردایه.

**كوردستان:**

له‌هه‌موو پارچه‌كانیدا، تاكه بنكه‌یه‌كی نییه بپارێزێ‌و هه‌ریه‌شێكی كه‌وتۆته ناو سنووری ده‌وڵه‌تێكه‌وه.*

هه‌ڵبه‌ته له‌هه‌ندێ مه‌ڵبه‌ندی دیكه‌ی جیهاندا پارتیزانه‌كان كه‌م‌و زۆر بنكه‌و باره‌گای پارێزراویان هه‌یه، وه‌كو: ئه‌ریتیریا، فیلیپین‌و سلڤادۆر. جگه له‌وه‌ی ئه‌و ڕژێمانه‌ی شۆڕشیان له‌و ولاتانه‌دا دژ كراون، له‌ڕووی ئابوورییه‌وه لاوازو له‌باری

* ئه‌م بۆچوونه هی دوای ئه‌نفاله‌كانه كه تاقه بنكه‌یه‌كی ئاشكرا له كوردستانی به‌شی عێراقدا نه‌مایه‌وه.

عەسکەریشەوە کەمهێزنو بەزۆری لەبەر گرنگی جوگرافی-سیاسی (ژیۆپۆلیتیک)ی ناوچەکانیان لەلایەن زلهێزەکانەوە پشتیوانی دەکرێن، سەرەڕای لاوازی ئابوری‌و عەسکەری ئەو ڕژێمانەش، کەچی لە فیلیپیندا ٣١ ساڵو لە ئەریتیریا ٢٩ ساڵە جەنگی پارتیزانی‌و جەنگی بزووت بەولاوە، شۆڕشەکان بەرەو باقی قۆناغەکانی شۆڕشی درێژخایەن پەرە پێنەدراوە، واتە ئێستاش لە جەنگی بەرگری (سلبی) دان . ئەم جۆرە بەرگریە بۆ شۆڕشی درێژخایەن لەو هەموو ساڵە دوورو درێژەدا، ئەگەر شۆڕشەکان بەچاکی نەگەیەندرێنە قۆناغی هێرشی ستراتیژی یان بەهۆی کاریگەری شۆڕشەکەوە، زەمینەی ڕاپەڕینی شارەکان نەڕەخسێندرێن مانەوەی شۆڕش لەو دۆخەی فیلیپین‌و ئەریتیریا شێوەیەکی بەبن‌بەست گەیشتنی عەسکەریە دیارە ئەمەش کارێکی سیاسی-سایکۆلۆژی نالەبار دەکاتە سەر هەست‌و هەڵوێستی جەماوەر. چونکە شۆڕشی درێژخایەن لە ڕێی لاوازکردنی دوژمنەوە دەبێ بەرەبەرە ورەی جەماوەر بەرزو فراوانتر بکات‌و بشیان گەیەنێتە لوتکەی سەرکەوتن. هەر شۆڕشێکی درێژخایەن لە ساڵانی دوورو درێژدا ئەمەی پێ نەکرا دەکەوێتە خۆخواردنەوەو پاشەکشە. مەگەر ئاڵوگۆڕێکی گەورە لەوپاشەکشەو بنبەستە عەسکەریە دەرباز بکات*.

سلڤادۆر دۆخی هەتا ئێستا لەبارترەو بەزۆریش پێشبینی ئەوەی لێدەکرێ ڕاپەڕینی شارەکان، وەکو نیکاراگوا تاچی سەرکەوتن لەسەر شۆڕشەکە بنێ (ئەگەر سەرکەوێ) ئەگینا جەنگی پارتیزانیەکەی دژوار دێتە بەرچاو ڕژێم شار بە شار ڕامالێ‌و پایتەختەکە ڕزگار بکات.

بۆئەوەی باشتر دۆخی فیلیپین‌و ئەریتیریاش بزانین. واپێویستە ڕووداوی سیاسی هەردوو دەوڵەتەکە باس بکرێن. لە ئەریتیریادا کودەتای گەورە کراوەو ڕژێمی کۆنەپەرستی هیلاسی‌لاسی بە ڕژێمی مەنگیستۆ ماریام گۆڕاو باری سیاسی سەراپای وڵاتەکە هەڵتەکا. کەچی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی ئەریتیریا لەناو بازنەی بەرگری‌و بەرەنگاری، هەڵمەت‌و هەڵێی پارتیزاندا دەخولێتەوە. ئەوەندەی ڕژێمی مەنگیستۆش لافی سۆسیالیستی لێدەداو شورەویش پشتیوانی لێدەکرد، بزوتنەوە چەکداریەکە مەودای سەرکەوتنیان تەسکترو لەبەرامبەر چەکە

---

*شۆڕشی ئەریتیریا بەهۆی کودەتاو ڕاپەڕینی ناو ئەسیوپیا، سەرکەوت‌و خەریکە دەوڵەتی سەربەخۆش دەچەسپێ.

قورسەکانی ڕژێمدا زیانی زۆریان وێدەکەوێ. تەنانەت لە کۆمەڵێک ئامانجی سیاسی کۆنیان وازیان هێناوە.

لە فیلیپیندا:

سەرئەنجامی فشاری جەماوەری ناو شارەکان ڕژێمی دیکتاتۆرێکی گەورەی سەردەم (مارکۆس) ڕووخێندراو وڵاتبەدەریش کرا. خێزانی (ئەکینۆ) کە مێردەکەی بەدەستی پیاوکوژانی مارکۆس لەسەر ئازادی کوژرا بوو، هەڵبژێردرا بۆ سەرۆک کۆماری فیلیپین جۆرەها مانگرتن، خۆپیشاندان، کودەتاو گرفتی قوڵی دیکەش لەچارەکە سەدەی ڕابردوودا ڕوویانداوە داوە کەچی شۆڕشی درێژخایەنی حیزبی کۆمۆنیستو موسڵمانەکانی ئەوێ، لە دورگەی دوورەدەستو جەنگەڵو چیاوچۆڵەکاندا تەپەیان دێ. ڕەنگ بوو حیزبی کۆمۆنیست ستراتیژی خۆی گۆڕیبا، بایەخی بە ڕاپەڕینی شار بە سیاسەتێکی شۆڕشگێڕانە دابا، ئێستا گۆڕانی گەورەی هێنابایەتەدیو دووریش نەبوو سەرکەوتبان،

لەمێژووشدا... دوو ڕێکەوتی مێژوویی ناکۆک، لەیەک وڵات هاتوونەدی. گرنگی لەدایکبوونی جەنگی پارتیزانیو پێویستی ئاشبەتاڵ پێکردنی هەمان جەنگ لە هەلومەرجی گۆڕدراودا.

ئیسپانیا وەکو لەسەرەتاوە گوتراوە یەکەمین وڵاتی سەرزەمینە کە لەشکری وڵاتەکەیان بەرگری لەشکری ناپلیۆنی نەگرت، جەنگی بەرەیان بە جەنگی پارتیزانی گۆڕیو پاش ساڵەهای ئەم جەنگە پارتیزانیە سەرکەوتن. بەمەدا ئیسپانیا بوو بە مامانی لەدایکبوونی جەنگی پارتیزانی سەرکەوتووی مێژوو. کەچی پاش سەدو سی ساڵ ۱۸۰۹-۱۹۳۹ هەمان وڵات دەبێتە مەڵبەندی گەورەترین جەنگی ناوخۆی جیهانو لەسەرانسەری جیهانیشەوە ئازادیخوازان بەهانای کۆماریخوازەکانەوە دژی فەلانژیستەکان دەچن: چەکیان بۆ هەڵدەگرن، یارمەتیان بۆ دەنێرن، چی بە کۆمینترنو ئازادیخوازان کرابێ درێغییان بەرامبەر ناکەن... وێڕاش لەبەر ئەوەی زەمانو زەمینەی جەنگی پارتیزانی گۆڕا بوون، هەمان جەنگی پارتیزانی کە بە ڕێبەرایەتی دواکەوتوو پێش لە ۱۳۰ ساڵ بەبێ پشتیوانی سەردەکەوێ، دوای ئەوە بە ڕێبەرایەتی حیزبی کۆمۆنیستیشو پشتیوانی زۆربەی جیهان دوای ۱۲ ساڵ جەنگینی بەردەوام، ئاشبەتاڵی پێدەکرێ. (ئینریکۆلستی) ڕێبەرێکی بەرجەستەی جەنگە پارتیزانە بەزیوەکان لەم بارەوە دەڵێ: «ئەزموونی ئیسپانیا دەریخست کە پێکەوە دەست پێکردنی خەباتی

چەکداری لەلادێداو خەباتێکی چڕ لەشاراندا کە هاوکات شێوەی پاسایی‌و نا ئاسایی خەبات بگرێتەوە دژوارە، تەنیا مەگەر قەیرانێکی شۆڕشگێڕانەی ورد لەئارادا بێ، لە ولاتێک رژێمەکەی هێزی سەرکوتی گەورەو هێلی هاتوچۆی ئاسانی گواستنەوەو دابەشکردنی هێزەکانی هەبێ، لەکاتێکدا دۆخی گشتی شۆڕشگێڕانە لاواز یان هەر نەبێ، گرانە جەنگی پارتیزانی درێژخایەن بەرپا بکرێ ‹۳۰›».

رێبەری ناوبراو ئەو دیاردە عەسکەری، سیاسی تۆپۆگرافیە دەکاتە ئەم ئاکامە: «دووەمین دەرس کە فێری بووین- ئیسپانیاش لەهی دیکە جیاواز نیە ئەوەیە کە پێویستە رێبەرانی بزووتنەوەی بەرەنگاری بتوانن جەنگی پارتیزانی لەماوەیەکی کەمدا رابگرن‌و چارۆکەکانیان بپێچنەوە پێش تێبەڕبوونی کات، ئەگەر بزیان دەرکەوت باشترین ئامراز نییەو دەشبێتە مایەی لەبەرڕیشتنی پێشڕەوی شۆڕشگێڕو تێکشکانی ‹۳۱›».

ئەوەیە گۆڕانی دیاردەکان، ئەوەیە نەمانی هەلومەرجی کۆن‌و سەرهەڵدانی هەلومەرجی نوێ، ئێستاش لە ئیسپانیادا کێشەی نەتەوایەتی چارەسەرنەکراوی (باسکەکان) ماوە. وێڕای بڕوای رێبەرانی گەلی باسک بە خەباتی چەکدارانە، بەلام لەبەرئەوەی باسکەکان لەچاو نەتەوەی سەردەستی ئیسپانیا کەمترن رووپێوی خاکەکەشیان تەسکترە، دوژمنەکەیان زۆر زۆر بەتوانایە، رێگاو بان گەیاندراوەتە دوورترین‌و سەختترین شوێن، باسکەکان شێوەی شۆڕشی درێژخایەنیان نەگرتۆتەبەرو شێوەی چالاکی تیرۆری ناو شارەکانیان هەڵبژاردووە وەکو گەلی ئیرلەندا، چونکە دڵنیان جەنگی پارتیزانی‌و شۆڕشی درێژخایەن لەم سەردەمەدا دژی رژێمی سەرمایەداری خاوەن پیشەسازی گەورە، ستەمە سەربخرێ.

ئەگەر کۆن لەبەرامبەر رژێمە لاوازەکاندا بە پشتیوانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی جەماوەر، شۆڕشی درێژخایەن دەستەبەرێکی باشی رزگاری گەلانی ژێردەستە بووبێ، ئەوا لەم قۆناخەدا بەتایبەتی لەم پایە ئابووری‌و پلە پێشکەوتووەی رژێم‌و هێزو تەکنۆلۆژییاندا کە لە حەفتاکان بەدواوە بناخەکەی داڕێژراوەو لە هەشتاکانیشەوە چەسپاوە، ئیدی لەبەرامبەر رژێمە بەهێزەکاندا

---

‹۳۰. ۳۱› الماركسية و حرب العصابات. ترجمة ابراهيم العابد و ماهر الكيالي. المؤسسة العربية للدراسات و النشر، بيروت،ص:۱۱۱.

نەکردنی شۆڕشی درێژخایەن دەستەبەری دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤی رزگاری تازەیە، هەر جۆرە سوربوونێک لەسەر شۆڕشی درێژخایەن بەتایبەتی وەکو یاسای نەگۆڕی رزگاری، خوێنی میللەت لە دەنگدا کوتان بەولاوە چیدیکە نییە.

جەنگی پارتیزانی... پاشەکشەی تیۆری و پراکتیکی لەبەرامبەر خەملینی خەباتی شۆڕشگێرانەی نوێدا کردو قۆناخی ئەوە داهاتووە ئەم جەنگە کۆنە تەنیا لە خزمەتی شۆڕشی دیکەدا (ئەویش ئەگەر پێویست بکات) وەکو رێبازێکی فاکتەر، یارمەتیدەر... بگیرێتەبەر.
پارتیزانی... بەشانازییەوە شانازی مێژوویی خۆی، هەتا ئەوکاتەی کە باروددۆخی سەرکەوتنی هەبوو، دژی ستەمکاران تۆمار کردو ئامرازێکی داگیرکەران هەراسانکەر بوو، پێویستە تیۆرسیۆنەکانی جێگەی رێزو ستایشی شۆڕشگێڕە راستگۆکان بن بەتایبەتی هەتا ئەو شوێنەی پێوەندی بەم رێبازە هەیە، ئیتر ئەستێرەی پارتیزانی وەکو یاسای رزگاری داچۆڕا.

### ٢/٧- راپەڕینی شارەکان (رێبازی دووەم)

ئەوەتای شاران ئاوەدان کراوون و کۆمەڵانی خەڵکی تێدا بەکۆمەڵ ژیاون، بەحوکمی جیاوازی باری کۆمەڵایەتی، زەنگین و زیڤار، کۆشکی گەورەو خانووچکەی پەڕپووت، گرانی و قاتی، زوڵم و زۆر، دزی و جەردەیی... تاد. ئەو شارانە هەردەم شوێنی نارەزایی دەربڕینی شارنشینان بوون و راپەڕین و خۆپیشاندان و مانگرتنی شارەکان، لەدیاردە سۆسیۆلۆژییەکانی شارستانیەت بوون.
دوورنییە لە قۆناخی کۆیلەیەتیدا کە چەک و ئامرازەکانی جەنگین بەهۆی نزمی پیشەسازییەوە کەم بوون و ئەوەی هەشبوون، زۆرتر بەدەست دەوڵەتان و خاوەن کۆیلەکانەوە بووە، بۆیە دوورنییە هەر ئەوسا وردە نارەزایی ستەمدیدەکان، بەتایبەتی لەکۆتایی قۆناخی کۆیلایەتیدا لەشارەکاندا نەتەقیبێتەوە. خەڵکی شارو شارۆچکەکان پەنایان نەبردبێتە بەر بەردو قۆچەقانی و کوتەک و دارو مەشخەڵ، سوتاندنی ماڵو حاڵی دەوڵەمەندان، کەتنپێکردنی بەدزی زاڵمان، چونکە سروشتی

مرۆڤ وا هەڵکەوتووە کە لەپێناوی بەرگری لەخۆیو ژیانی کەسوکاری، کەتەنگاو کرا، هەرچیەک بکەوێتە دەستی پێدەداتی‌و دەیکاتە چەکی بەرگری‌و هێرشیش. بۆیە بەرد، یەکەمین تۆپی دوورهاوێژی ستەم دیدەکانە بەرامبەر ستەمکارەکان، دیارە شەڕی دەستەویەخە دژی شمشێرو قەڵغان بەدەستان، شەڕی خۆبەزین بووە. هەربۆیە بەرد وەکو چەکی بەرهەمهێندراوی کارگەی سروشت لە جەنگیندا هاوخەمی هەزاران بوو.

پاش پەرەسەندنی شارەکان‌و ئاپوورەبوونی دانیشتوانی، زۆربوونی کۆڵان‌و خانووبەرەی ڕێگاو شەقامی بەتایبەتی لەسەردەمی پەرەسەندنی بازرگانی بەدواوە، ئیدی نارەزایی‌و خۆپیشاندان‌و پەلاماری شارنشان تەکانی داوەو خەڵک سەربان‌و کۆڵانە تەنگەبەرەکانیان کردۆتە سەنگەری بەرگری‌و شێوەی بەرسنگ لەدوژمن گرتن پێشخراوەو گەیاندراوەتە رادەی ڕژاندنی ئاوی کوڵاوو هەڵڕشتنی ئاگر لەسەربان‌و پەنجەرەکانەوە. فڕاندن‌و کوشتنی حەسحەسەکانیش لە کۆڵانە تەنگەبەرەکاندا هەتا ئێستاش هەیە، بەمەشدا کە نارەزایی دەربڕینی هێمنانە سەرکوتکراوەو داخوازی خەڵک دابین‌نەکراوە، نارەزاییەکەی پەرەیسەندووە بۆ چالاکی توندترو کوشت‌و کوشتار.

کە سەرمایەداری سەربهەڵداو چەسپا جگە لەوەی کارگەو کارخانەکان نوێترین چینی چەوساوەیان بە کۆکراوی بەستەوە بەسەرچاوەی ئامرازەکانی نوێی ژیان، ئەم سیستەمە ڕەوتی کۆمەڵ‌و ژیانی کۆمەڵایەتی، شێوەی شارو شارستانیەت، بیری خەڵک‌و ئەندێشەی تیۆری، فەلسەفی‌و زانستی، ڕۆشنبیری‌و ڕۆشنگەریشی سەراپا گۆڕی‌و گوڕی ئازادی‌و سەربەستی، دیموکراسی‌و بەختەوەری خستە گیانی خەڵک، ئەمەش جگەلەوەی لە چەمکە عەسکەرییەکانیشدا ڕەنگیدایەوە، خەباتی چینایەتی‌و کۆمەڵایەتی زەحمەتکێشی فراوانی خەڵکی تێکەڵاو کرد. چەوساوەو چەوسێنەری خستە دوو بەرەی هەتاسەر لێکدابڕاوی بۆتەی خەبات، کارگەکان بوون بە جۆشەنی جۆشدانی تێکۆشانی کرێکاران‌و خەڵک. هەر هێندەی دەربەگایەتی ئاوابوو، پێوەندی سەرمایەدارو کرێکار تێکچوو، تێکچوونەکە نەشوغای کردو بەرەبەرە قوڵتر بوو گەیشتە نارەزایی، مانگرتن، خۆپیشاندان‌و دواجاریش ڕاپەڕین.

ئەمە ڕەوتی دیالێکتیکی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیە. بێزاری چینایەتی ئەگەر دڵۆپ دڵۆپیش پەنگ بخوات، ڕۆژێ دادێ لافاوی قینی پیرۆزی لێهەڵدەستێ.

کرێکاران کە دەستی کارفرۆشتنیان گەیشتە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، ئامرازەکانیان کردە باشترین ئامرازی بەدیهێنەری رزگاریش. هەر ئەوسا شارەکان شایەتی ڕاپەڕینی گەورەی خەڵکن کە مارکس پێی دەڵێ: عامیە، واتە: بە ـعام- ڕاپەڕینی خەڵک دژی چەوسێنەران.* تێکڕا سەنگەریان گرتووەو شەڕی دەستەویەخەیان کردووەو. بێگومان هاوشانی تەواوی کەرەستەکانی جەنگین (دار، بەرد، ئاگرو ئاسن) چەکیش کەوتە دەستی خەڵک. ڕاپەڕین گەیەندرایە ڕادەی سەنگەربەندی شارەکانو شەڕی سەنگەر بەسەنگەری کۆن کە بۆرژواکانی دژی ئۆرستۆکراتیەکان لە شەڕی گەورەی فەرەنساو ئۆروپاو ئەمریکادا دەیانکرد، بە میرات بۆ کرێکارانیش مایەوەو بەهەمان شێوە دژی بۆرژواکان دەجەنگان، بێگومان کاتی خۆیشی ئەو شەڕانەی بۆرژواکان دژی ئۆرستۆکراتیەکان دەیانکرد، لەشکرەکانیان هەر لە زەحمەتکێشان پێکدەهێناو ئەوەش مەشقێکی عەسکەری باش بوو بۆ نەوەکانی زەحمەتکێشان. هەڵبەتە پاش ئەوەی درۆی بۆرژواکان بەزەقی دەرکەوت. بۆیە ئەوکرێکارانەی جاران دەکرانە لەشکری بۆرژواکان دژی دەرەبەگەکان، دوای ئەوەی پەرەیانسەندو بوون بە خاوەنی خۆیانو خەباتی سەربەخۆی چینایەتیان، ئیدی وەرچەرخانی شۆڕشگێڕانە لەهەموو بارێکەوە تەنانەت لەبارەی جەنگو ڕاپەڕینیشەوە خوڵقاند، هەر ئەوسا کە بۆیەکەمین جار چەوساوە پەیامی رزگاری شۆڕشگێڕانەی دوای بەدرۆکەوتنی (یەکسانیو برایەتیو ئازادی) بۆرژواکان دایە مرۆڤایەتی، ڕاپەڕینیش وەکو شۆڕشی ناو شارەکان، کاریگەریەکەی دەرکەوت. ڕاپەڕین زوو دەریخست ڕێبازێکی شۆڕشگێڕانەی کرێکارانو زەحمەتکێشانە بۆ رزگاریو ئازادی. لەدەیان وڵاتدا ڕاپەڕین سەرمایەدارانی هەژاندو چارەنووسی خستنە مەترسی گەورەوە. سەدان یاسای پێگۆڕین. سەدان شێوەی سیاسەتی پێگرتنەبەر، دەیان دەستکەوتی چینایەتیو پیشەیی لێسەندوون، باری سەختی ژیانی کرێکارانی سووک کردووەو سەعاتی کاری کەم کردوون. هەندێ جاریش سەرکەوتنی گەلێ گەورەی بەدیهێناوە. دەسەڵاتی کۆمۆنەی پاریسو حکومەتی باڤاریای ئەڵمانیا ئۆکتۆبەری ڕوسا بەرووبەرهەمی گەورە، بەڵام کەمخایەنی ئەم خەباتەن.

* نەک ڕاپەڕینی تەنیا کرێکاران.

کۆن جۆرە تێکەڵاوییەک لەنێوان ڕاپەڕین و سەنگەربەندی ناو شارەکان (عامیە)دا کراوە. هەموو جارێک ئەگەر ڕاپەڕین باش ڕێکخرابێت و کۆمەڵانی خەڵکی سەرجەم گرتبێتەوە لەکاتی خۆیدا دەستی پێکردبێ و بڕبڕەی ئابووری ڕژێمەکانی شکاندبێ، سەرەڕای نەبوونی ڕێبەرایەتییەکی هەڵکەوتووی پێویستی سەرخستنی، ڕژێمەکانی خستۆتە پاشەکشەو دەزگاکانی ئابووری و سەرکوتکردنیشی ئیفلیج کردوون. بگرە چەکدارێکی زۆریشی لە سوپاو پۆلیس و گاردی ڕژێمەکان وازپێهێناوەو هاتوونەتە ڕیزی ڕاپەڕیوان. هۆی سەرنەکەوتنیشیان ڕێبەرایەتییەکانیان بووە. نەک خودی ڕاپەڕینەکان وەکو شێوەی سەرەکی سەرکەوتن. بەپێچەوانەشەوە کە لە ڕاپەڕیندا نەخشە نەبووبێ، پەلەکاری زاڵبووبێ، لەگاتی خۆیدا هەڵنەگیرسابێ، زۆرینەی جەماوەری ڕانەکێشابێ، بەناچاری وازلێهێنرابێ و بەسەنگەربەندی ناوشارەکان گۆڕدرابێ و شەڕە تفەنگ جێی تەوژمی ڕاپەڕینی جەماوەری گرتبێتەوە، هەمیشە کە ڕاپەڕین وای بەسەرهێنرابێ دوژمنان ئاسانتر سەرکەوتوون، چونکە لەشەڕە تفەنگدا، دوژمن تفەنگی زۆرترە، لەشکری مەشقپێکراوە، چەکی قورس و تەقەمەنی زۆری هەیە، تۆپ و هاوەن و نارنجۆکی زۆرە، توانای لۆجستیکی و لەشکرکێشی بالایە، بۆیە لەشەڕە تفەنگدا ڕژێمەکان سەرکەوتوون و شۆڕشگێڕەکان ژێرکەوتوون.

لە شەڕە تفەنگی بەرگریدا دوژمن دەتوانێ جۆرەها تۆمەتی وەکو: یاخی بوون، فیتی بێگانە، لەیاسا دەرچوون و لەوبابەتە درۆیانە لەسەر جەنگاوەران لەناو جەماوەردا بلاوبکاتەوە. هەتا ڕادەیەکیش ئەم جەنگە سایکۆلۆژیە لەمێژوودا لەقازانجی سەرمایەداران بووە، بەتایبەتی ئەگەر ڕەوتی بنەڕەتی خەبات بە ڕەوتی لاوەکی گۆڕدرابێ. ئەمە جگە لەوەی شەڕە تفەنگ: تەق وتۆقەکەی، کوشت و کوشتارەکەی، وا لەزۆرینەی جەماوەر دەکات لەماڵی خۆیاندا نەیەنەدەرەوەو ئەرکی بەرگری تەنیا دەکەوێتە سەر تفەنگچیەکان. تفەنگچیش لەبەر کەمی تفەنگ و کەمی تەقەمەنی، توانای بەرەنگاری ناو شارەکانی کەم بووە. بەمەشدا

جۆرە دابڕینێکی عەسکەری لەنێوان شۆڕشگێڕە چەکدارەکان و جەماوەردا دروست دەبێ. تا ئەمەیش تەپکەیەک بوو، شۆڕشگێڕە سەرچڵەکان کەوتوونەتە ناوی.

لە کۆمۆنەی پاریسدا کە ڕاپەڕین و پەلاماردانی چەکدارانە تێکەڵاو بوون و لە قۆناغی یەکەمیدا بە هێرشی گەورە دەستپێکرا. لە هەموو لایەکەوە کۆمۆنەییەکان هەڵیانکوتایە سەر دەزگاکانی ڕژێم. شۆڕش و ڕاپەڕین سەرکەوت و حکومەتی کرێکاران لەپاریسدا دامەزرا بەلاّم دوای سەرکەوتن جگەلە هەڵە سیاسیەکانی شۆڕشەکە کە بڵاتکیەکان جیاوازی ئەرکەکانی شۆڕشی دیموکراسی و شۆڕشی سۆسیالیستیان نەدەکرد، جگە لەم هەڵە گەورەیە لە ڕووی عەسکەریەوە کە شۆڕش پەلاماری خۆی ڕاگرت و هەڵیان نەکوتایە سەر (فەرسای) کە ڕژێمە شکاوەکە کردبوویە مۆڵگای خۆسازدانەوە، دەستیشیان بەسەر بانکدا نەگرت و ستراتیژی بەرهەڵستیان لەبری درێژەپێدانی هێرش و پەلامار، گرتەبەر، ئەم ستراتیژە عەسکەریە هەڵەی بەرگری لەخۆ نەکردنە (لەبری هێرشی بەردەوام) نەبووی عەسکەریەوە کۆمۆنەی خەڵتانی خوێن کرد، دەرکەوت تەنانەت لەکاتی شکاندن و هەڵهاتنی ڕژێمەکانیشدا، ڕاگرتن و درێژەپێدانی هێرش، خۆسازکردن بۆ بەرهەڵستی بەهێزیش، هەڵەیەکی کوشندەیە*. ئەوە بوو کۆمۆنە لەهێرشی چەواشەی شۆڕشی چەواشەدا، ژێرخرا. کە ژێریشیان خست، لە کردەوەکانیانڕا دیارە مەبەستیان بووە جارێکی دیکە بەو زووانە، یان دەرەنگتر، کۆمۆنەی دیکە دووپات نەبێتەوە بە هەڵەش نەچوون. ڕاستە نەیانتوانی خەباتی کرێکاران و ڕاپەڕین ڕیشەکێش بکەن، بەلاّم توانیان هەتا ئێستاش سەرکەوتنی سۆشیالیزم دووربخەنەوە باشتواندری پێشبینی زەمانی سەرهەڵدانەوەی ڕاپەڕین لە فەرەنسادا بکری! ئەمەیان پێوەندی بە کۆمەڵێ ئاڵوگۆڕی جیهان هەژێنەوە هەیە کە دیاریکردنی کاتەکەی دوورە لە قەڵەمی ئێمەومانان. بەلاّم پەند وەرگرتن لەو هەڵە مێژوویانەی بوونەتە هۆی مانەوەی سەرمایەداری و ئیمپریالیزم ئەرکێکی شۆڕشگێڕانەیە.

---

* هەمان هەڵەکانی کۆمەنە، لە کوردستاندا، لە زەمان و زەمینەی دیکەداو بە ڕێبەرایەتیەکی دیکە دووپات کرانەوەو فاشیەکانی عێراقیش وەکو بۆرژواکانی فەرەنسا توانیان شۆڕشی چەواشە لە بەغداوە سەربخەن.

ئەگەر واشنەکرێ‌و ئەم هەلومەرجە مێژووییەی لە ولاتانی دواخراودا هەڵکەوتوون بە باشترین شێوەی شۆڕشگێڕانە نەقوزرێتەوە، سەرمایەداری وایان پەرەسەندووە هەروەکو چۆن رژێمە سەرمایەداریە گەورەکان پاش دەوڵەمەندتر بوونی خۆیان‌و تاڵیان لە ئەزموونەکاندا، هەتا ئێستاش خۆیان گرتووە. ئاوەهاش رژێمە ژێردەستەکانی ئێستاش، بەتایبەتی دەوڵەمەندە خاوەن نەوت‌و کەرەسەی خاوی فرەیان دەتوانن بەپشتیوانی ئیمپریالیزم خۆیان بگرن‌و مەترسی راپەڕینی خەڵک دووربخەنەوە.
رووداوەکانی مێژوو فیلمی سینەمایی نین هەتا هەرکاتێ، کام حیزب بیەوێ لە شاشەی هەڵوێستی جەماوەردا بیخاتە نمایش. بڕوای را بەهەڵەچوون‌و بە هەڵە بردنیکی کوشندەیە؛ ئەوەی کۆن لەدەستدراوە، ئێستا پارسەنگ نادرێتەوە. ئەوەی ئێستایش لەدەستبدرێ هەرکاتێ بویسترێ قەرەبوو ناکرێتەوە.

وا مێژوو لەهەلومەرجێکی گۆڕدراودا لەسایەی پێوەندی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی، سیاسی‌و عەسکەری نوێدا دوای بڕینی چەندین قۆناغ‌و دوای پشت سەرخستنی جۆرەها ئەزموونی گەورە‌و گچکە، هەروەها دوای تاقیکردنەوەی سەرکەوتووانەی راپەڕین لەهەندێک شوێن‌و شۆڕشی درێژخایەن لە هەندێک شوێنی دیکە‌و ژێرکەوتنی جارجارەی هەردوو تاقیکردنەوەکانیش لە زۆر شوێنی جیهاندا وا خەریکە، لەکاتێکدا شۆڕشی درێژخایەنی چەکدارانە وەکو تاکە ستراتیژی رزگاری بایەخی یاسایی نەگۆڕی لەدەستداوە، خۆشبەختانە، ڕێبازی راپەڕینی بەردەوام دەبێتە دوورنمای سەرکەوتنی کرێکاران‌و گەلان. ئەمەش گەشانەوەی ژیلەمۆی کۆنی خەباتی شارەکانە بە شەماڵی شۆڕشی نوێی سەردەم. بەگیانی نوێ‌و گوڕی نەوەی نوێ.

## ٣/٧- ناوەڕۆکی راپەڕین

وەکو گوترا، راپەڕین‌و راپەراندنی خەڵکی شارەکان، رابردوویەکی دێرینەی هەیە، شانازی مێژوویی گەورەی تۆمارکردووە.بەدەرس وەرگرتنیش لە ئەزموونە کۆن‌و نوێکانی راپەڕین لەمەدەمەدا، راپەڕین سیماو ناوەڕۆکێکی هاوچەرخانەی

ژیاوەتەوە. هەڵبەتە هێشتا ڕاپەڕینی تازە پێڕەوکراو بەچاکی تیۆریزە نەکراوەو زەحمەتە بنچینەکانی‌و چوارچێوەکانی، چۆنیەتی دەستپێکردنی دەستنیشان بکرێ، بەلاٚم هێندەی دەرکەوتووەو هێندەش دەتواندرێ پێشبینی بکرێ یان لێکبدرێتەوە، باس‌دەکەین:

ڕاپەڕینی شارەکان بە چەمکە گەورەو گشتیەکەی هەڵقوڵاوی پێوەندیەکانی سەرمایەداری‌و شۆڕشەکانی سەرمایەداریە دژی سیستەمی دەرەبەگایەتی. هەر کە هێزو پێوەندی سەرمایەداری سنووری مانیفاکتەرەکەیان بڕی‌و بنچینەکانی سیستەمی سەرمایەداریان داڕشت ئیدی لەوساوە شار چ وەکو بەرهەمهێنان چ وەکو ناوەندی کۆنترۆڵی سیاسی ولاٚتانی سەرمایەداری چ وەکو زاڵی شار نشینەکان بەسەر گوندەکاندا، بوو بە پێشەنگی تەواوی ڕووداوەکان‌و مەڵبەندی تەقینەوەی دیاردە چارەنووس‌سازەکان.

کۆبوونەوەی خەڵک لەشارو یەکدی ناسینیان، ئاشنایەتی‌و تێکەلاٚویان، هاموشۆو متمانە بەیەک کردنیان، ژیان‌و ژنواری پێکەوەیان، بلاٚوبوونەوەی دەنگ‌و باسی ئاسانی ناویان، هەموو ئەوانە وایکردووە شار پێچەوانەی کۆن لەسەردەمی سەرمایەداریدا زاڵ ببێ بەسەر ژیاندا، ژیانی ئابووری‌و ژیانی کۆمەلاٚیەتی‌و ژیانی سیاسی‌و عەسکەریش.

ڕاپەڕینیش... وەکو بەرزترین ڕێبازی خەبات دەستکەوتی گەورەی ئەو سەردەمەیەو لەڕێڕەوی پەرەسەندنی سەردەمی سەرمایەداریشدا بنچینەو چوارچێوە چینایەتی‌و سیاسیەکانی ڕاپەڕین خەملیوە.

هەرکە شاران دروستبوون‌و بوونە پێشەنگی گوندەکان‌و کۆمەڵ چیدیکە یاخی بوونی لاوازو پەرتەوازەی جووتیاران‌و گوندەکان، ڕۆڵێکی ئەوتۆیان لەچاو کۆن نەما. هەموو کارێک لە گوندا بەبێ شار، کارە: ئابووری‌و کۆمەلاٚیەتی‌و سیاسیەکان، کارایی چارەنووس‌سازیان لەدەستداو بەبێ شار چیدیکە نەدەکرا گوندو گوندنشینان جڵەویان بگرنە دەست بۆیە لە شۆڕشە بۆرژوازیە گەورەکانی ئۆروپاو ئەمریکادا کە شاران کەوتنە دەست چینی بۆرژوازی کۆنە شۆڕشگێڕو شارەکانیان کردە سەنگەری بەرهەڵستی‌و هەڵتەکاندنی سیستەمی دەرەبەگایەتی، دەرەبەگەکان بەو هەموو ئەزموونە کۆنەو ڕق‌و قینەی هەشیان بوو نەیانتوانی ڕێ لە ڕەوتی مێژوو بگۆڕن.

لەسەدەی شازدە شۆڕشی هۆڵەندا، سەدەی حەڤدە دوو شۆڕشی ئینگلستان،

سەدەی هەژدە شۆڕشی ئەمریکا، شایەتی گرنگی شارو ڕاپەڕینی شارنشینانن دژی دەرەبەگایەتی‌و سەرکەوتنە کەم‌وێنەکانیشیان، جیهانی سەراپا گۆڕی

شۆڕشی گەورەی فەرەنسا دوای ئەو شۆڕشانەش کەوت، بەڵام زیاتر لەوان جیهانی هەژاند. پتریش لەوان کاریکردە سەر ڕووداوە سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەکانی ئاسیا، ڕەنگە سێ هۆی مێژوویی ئەو ڕاستیەیان بەرجەشتە کردبێ:

١- کاتێ هۆلەنداو ئینگلستان پاش دۆزینەوەی جوگرافی تازە بوژانەوەو ئابووری‌و بازرگانیان بەهێزتر بوو، هێشتا ئاسیا لەخەوی قوڵی سەدەکانی ناوەڕاستدا پرخەی دەهات. ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی کە شایەنی باس‌و گۆڕان بێ، ڕووینەدابوو.

٢- شۆڕشی فەرەنسا هاوکاتی نۆبەرەی پەیدابوونی سەرمایەو سەرمایەداری، پێشکەوتنی بازرگانی، ڕووداوی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی لە ئاسیادا تەقیەوە.

٣- شۆڕشی فەرەنسا پێچەوانەی شۆڕشەکانی دیکەی بۆرژوازی، لیبراوانە ئەرکە ئابووری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەکانی بردەسەرو سازشی لەتەک دەرەبەگ‌و ئۆرستۆکراتە کۆنەپەرستەکان‌دا نەکرد.

دووی هۆی مێژوویی گرنگیش خودی شۆڕشەکەیان وا لێکرد پاش شۆڕشە بۆرژواییەکانی پێشووتریش ببێتە گرنگترین شۆڕشی بۆرژوایی جیهان:

١- سەرسەختی ئەشرافەکان‌و سووربوونیان لەسەر پاراستنی پایەی دەرەبەگایەتی‌و دژی هەموو جۆرە دەستکەوتێکی پێشکەوتن بوون.

٢- ناڕەزایی گەورەی خەڵک‌و دژی بایەخپێدان یاخود جیاوازی چینایەتی بوون .‹٣٢›

پەیدابوونی سەرمایەداری‌و پەرەسەندنی شارو سەرکەوتنی شۆڕشی بۆرژوازی شارو ڕاپەڕینی کردە هاوڕێی یەکدی، ئەمەش لەسەراپای جیهاندا ڕەنگ‌و دەنگیدایەوە. تەنانەت لە وڵاتە دواکەوتووەکانیشدا، خەبات لەپێناوی سەربەخۆیی سیاسی وڵاتانی ڕۆژهەڵات باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستیە زەقەن، ئەگەرچی لە ڕۆژهەڵاتدا سەرهەڵدانی ئابووری‌و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بە حوکمی پێشتر پێشکەوتنی سەرمایەداری لە ڕۆژئاواو ناردنی سەرمایەو سەرمایەداری بۆ ڕۆژهەڵات زۆر دواکەوت.

‹٣٢› البرسوبول. انقلاب فرانسه (١) مترجم عبدالرحمان صدریه. چاپ سوم، تاریخ نشر ١٣٦٦ ص: ١٦.

بێگومان ئەو ڕەوتە گۆڕانی بەسەرداهات، بەتایبەتی لەوڵاتە دواخراوەکاندا. شۆڕشی درێژخایەن لە هەلومەرجی خۆیدا گرنگترین ڕەوتی گۆڕدراوی خەباتە لە شارەکانەوە بۆ شاخەکان، وێڕاش شۆڕشی درێژخایەنیش بەبێ شار لەهەموو حاڵەتێکدا هیچی بەهیچ نەکرد.

ئەگەر لەسەرەتای پەیدابوونی سەرمایەداریو بایەخ پەیداکردنی شارەکاندا، ڕاپەڕینو شۆڕش لە شارەکاندا ڕووداوی چارەنووس‌سازی سیاسی بووبن... پاشان لە قۆناخی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی وڵاتانی ئاسیادا هاوشانی ڕاپەڕین، شۆڕشی درێژخایەنیش ڕۆڵێکی گرنگی لەچەندین وڵاتی داگیرکراودا گێڕابێ. ئەوا ئێستاکە لە سەرجەم ڕووداوەکانی: ئابووریو کۆمەڵایەتی، سیاسیو عەسکەری، گۆڕانی قوڵیان بەسەرداهاتووجو سەرژمێری ئێستای خەڵکیش لەسەراپای جیهاندا لە زیادبووندایە.

کۆچ لە گوندەوە بۆشار سیمایەکی دیاری کۆتایی سەدەکەیەو ئەمڕۆ سەرجەم، شارنشین لە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتوو تیمچە پێشکەوتووەکاندا لەدێ نشینەکان زۆرترن. تەنانەت لە وڵاتانی وەکو عێراقیش وای لێهاتووە. واش چاوەڕوان دەکرێ بۆساڵی ٢٠٠٠ دانیشتوانی بەغدا بگاتە ١١ ملیۆن کەس. ئەم بایەخ پەیداکردنەی شار لەم هەلومەرجەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا لەبارودۆخێکی گۆڕدراوی جیهاندا، باشتر لەکۆن دیسان شار دەکاتەوە مەڵبەندی چارەنووس‌سازی سیاسی، ئەگەرچی ماوەیەکیش لەهەندێ وڵاتانی ئاسیادا ئەمە گۆڕدرابێ. شاران ئێستا: ئاپوورەو پڕن گەورەو کاریگەرن، کارگەو کرێکارانیان زۆرن، مەڵبەندی ڕۆشنبیریو دەنگو باسن، پێوەندیان بە جیهانەوە بەردەوامە، بڕبڕەی پشتی دەوڵەتانن، دەنگو باسیان زوو دەگاتە وڵاتان لەناو شارەکانیشدا پایتەختو شارە پیشەسازییەکان بایەخی زۆرتریان هەیە، سیستەمی سیاسی وڵاتیان لەسەر بیناکراوە. بچووکترین ڕووداوی کارایی خۆی هەیە. ئەوانە لایەنی گەشی شارەکانن کە خەڵکانی شۆڕشگێڕ دەتوانن بۆ: کاری ڕێکخراوەیی، پڕۆپاگەندە، چالاکی شۆڕشگێڕانە، بڵاوکردنەوەی بەیانو ئەدەبیات، نووسنی سەردیوارو هەڵواسینی پۆستەر، خۆشاردنەوەو شاردنەوەی چاپخانە سودی زۆریان بۆ پەرەپێدانی ڕێبازی شۆڕشگێڕانە لێوەربگرن. دەستیان بگاتە دڵی کارگەکانو

گەڕەکە زەحمەتکێش‌نشینەکان، لەدەوری پێشڕەوی چینایەتیان کۆبکەنەوە.
جگەلەوانە، لەم هەلومەرجەدا شاران لایەنی خراپیشیان هەن‌و پێویستە لەبەرچاو بگیرێن، وەکو: بڵاوبوونەوەی مەیخۆری‌و شوێنی هەوەسبازی، ئۆتۆمۆبیل‌و سەیران‌و سینەماو ڤیدیۆو یانەی جۆراوجۆری وەرزش‌و وازی دیکە، ئەو دیاردانەش جگەلە لایەنی چاکە بۆ مەبەستی خراپەش بەکاردێن. دەسکەوتنی هەموو پێویستیەکی خەڵک‌و زیادکردنی کرێی زەحمەتکێشان. هەموو ئەوانەی لەم سەردەمەدا کراونەتە بەشێکی ژیانی خەڵکەکەو تەنانەت خەڵکی کەم‌تواناش ئێستا بایی هەندێک لە حەزو پێویستیەکانی دابینە بەتایبەتی لەوڵاتە دەوڵەمەندەکاندا ئەوانەش تێکڕا کەم‌و زۆر کاریان کردۆتە سەر هەستی خەڵک‌و ساردکردنەوەی هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەیان، جگە لەوانە: ڕژێمەکان هەریەکە لەجیهانبینی خۆیەوە بەپێی ئەو تواناو دەسەڵات‌و ئاستەی هەیەتی، هەوڵدەدا بەنوێترین نەخشە، بە تازەترین داوودەزگای تۆڕی شۆڤاری، تەلەفۆن‌و بێتەل، ئەمن، ئیستیخبارات، موخابەرات‌و سوپاو پۆلیسو جاش. کۆنترۆڵی پایتەخت‌و شارە گرنگە پیشەسازیەکان‌و ئەوانی دیکەیش بکات، بۆ ئەمەش جگە لەبەکارهێنانی زەبرو زەنگ، پڕۆپاگەندەی سایکۆلۆژی ڕووخێنەرو ساردکەرەوەی ڤینی جەماوەریش بەشێکی تەواوکەری نەخشەکانی ڕژێمە. هەموو ئەوانەش پێکەوە چەشنی مۆتەکە هەتا ڕادیەک کار دەکەنە سەر ورەی خەڵک، بەڵام وێڕای ئەوانەش ڕژێمە فاشیست‌و دیکتاتۆرەکان ناتوانن لەو توانا زیاترەشیان لەبەردەستدابێ هەتا سەر لەپاشەڕۆژیان دڵنیا بن‌و خەڵکیش هەتا هەتایە لەبەر ئەو هۆیانە دەستبەرداری دیموکراسی‌و ئازادی، سەرفرازی‌و سەربەستی ڕاستەقینەیان نابن.

ترس‌و ترساندن کە لەڕادەی خۆی ترازا، دەڕەوێتەوە.
خۆشی‌و ڕابواردنیش کە لەسەر حسابی کەرامەتی خەڵک بێ ژێرپێ دەندرێ. داوودەزگا سەرکوتکەرەکانیش ماوەیەک دەتوانن کۆنترۆڵی ڕقی خەڵک خامۆش بکەن، کە کار لەکار ترازا هێز نییە بەرگەی لافاوی ڕقی پیرۆزی بگرێ.
هیچ دیاردەیەک، دەرکەوتەیەکی ژیان بەچاک‌و خراپیەوە، نەگۆڕ نییە. خەڵک ئەگەر لەوپەڕی خۆشی شەخسیدا بژین،

کاتێدایێ هەستی حەزەکانی مرۆڤ لەو خۆشیانەی بۆی هاتوونەتەدی، تێر دەخۆنو هەمان هەست دەگۆڕێ بۆ هەستی نوێ.

پێویستیەکانی گەشەکردنو گۆڕان، لە کۆمەڵی چینایەتیدا وەڵامی باشیش دەرهەق بە ڕۆژگار بدرێنەوە، هەتا ئەو ڕۆژەی خوێنمژینی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە مابێ، وەڵامەکان دەبنەوە پرسیارو بەدوای وەڵامی تازەدا دەگەڕێن، تەنانەت ئەگەر خوێنمژینی مرۆڤیش نەما. هەمان پرۆسە بۆ گەشەکردنی سروشتو ژیانی بەرزتر درێژە دەکێشێ، ئەمە یاسای بابەتیو لۆژیکی مێژووە بەچەشەو خۆشی ڕابواردنو خۆبواردن، ترسو ترساندن، سەرکوتو تۆقاندن، کوشتو کوشتاری شۆڕشی چەواشە، هەرگیز ئەو یاسا بابەتیو لۆژیکە تێکنادرێو یاسایەکی ناڕاستو لۆژیکێکی لاواز جێیان ناگرێتەوە.

لەمەودوا بێ چەندو چوون، ناوەندی خەباتو شۆڕشگێڕێتی گەڕاوەتەوە شارەکان، شارەکانیش هەروەکو گرنگترن لەجاران بۆ ڕاپەڕین، بەلام ڕاپەڕین بە ناوەڕۆکە کۆنەکەی ناتوانێ لە هەناوی ئێستای شارو لەبەرامبەر نەخشەی نوێی ڕژێمەکاندا بەهەمان ڕەوتی کۆنو کۆنینە، ئامانجەکانی کرێکارانو زەحمەتکێشان بهێنێتەدی، ڕاپەڕینە کۆنەکان بۆ بارودۆخی شارە کۆنەکان، پرۆسەیەکی گونجاو بوو، بۆ شارە پێشکەوتووەکانو لەبەرامبەر ڕژێمە پێشخراوەکانی ئێستاشدا دەبێ ناوەڕۆکی کۆنی ڕاپەڕین لەگەڵ ئەم سەردەمە گەشە پێبدرێ، ڕێکو ڕەوان پێویستە بکرێنە ڕاپەڕینی بەردەوان.

## ٤/٧- ڕاپەڕینی بەردەوامی ئێران

ڕاپەڕینی بەردەوام (کە شۆڕشە) دەتوانین بە لەدایکبووی کۆتایی هەفتاکانی ئەم سەدەیەی بزانین، ئێرانیش وەکو سەرزەمینێکی گرنگی ڕۆژهەڵات، زایگای ڕاپەڕینی بەردەوامە، دەتواندرێ ئەم ڕاستیانەی لێ هەڵگوزرێ:

١- ڕاستە ڕاپەڕینی ئەوروپا بەتایبەتی شۆڕشی گەورەی فەرەنساو شۆڕشی ئوکتۆبەر لەشارەکانەوە تەقینەوەو هەر لەشارەکانیشدا بەتایبەتی لە پایتەختدا سەرکەوتن. بەلام ئەو شۆڕشانە لەماوەیەکی کورتو بە قوربانیەکی کەمیش سەرکەوتن. کەچی ڕاپەڕینی بەردەوامی ئێران وانەبوو. خاوەن تایبەتمەندی نوێی

خۆیو خەباتی گەلانی ولاتەکەیە کە دەتواندرێ لەم چەند خاڵەدا چڕ بکرێنەوە:
أ) شەش مانگ پتر درێژەی کێشا.
ب) ڕاپەڕیوان چەکیان بەکارنەهێنا.
ج) زیاتر لە شەش هەزار شەهید درا.
د) زۆربەی هەرە زۆری جەماوەر بەشداریان کرد.
٢- ڕاپەڕینەکە وەکو لەدایکبووی گەلانی ئێرانە، خۆشبەختانە دژی ڕژێمێکی هەرە بەهێزو بێگانەپەرستی ڕۆژهەلات، لەناونیشتمانێکی چەند میللەتی ٤٠ ملیۆن پتردا بەرپا کراو، لەیەکەمین جارەوە ڕاپەڕینی بەردەوام، قەلایەکی سەختی کۆنەپەرستی ڕماندو ئەو مەترسیەی نەهێشت کە گوایە ڕژێمە بەهێزەکان بە ڕاپەڕین ناڕوخێن.
٣- ڕاپەڕینەکە بە شۆڕشی چەکداری درێژخایەن (وەکو: کوباو نیکاراگوا) پێشتر زەمینەی نەڕەخسێندراوە. ئەگەرچی ساڵەهای ساڵیش پێشتر چالاکی پەراگەندەی لەلایەن گروپە چەپەکانەوە دەکران بەلام ناکرێ چالاکیەکان ناو بندرێن شۆڕشو ڕاپەڕینەکەش لەژێر فشاری ئەو چالاکیانەدا نەتەقیەوە.
٤- مەزهەب لە ئێراندا ڕۆڵی ڕۆحی گەورەی گێڕاو لە درێژەکێشانی ڕاپەڕینەکەو ئیفلیج کردنی ڕۆحیەتی داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێمی شاهنشایی، ئەگەرچی ڕۆڵی نیشتمانیو چینایەتیو سیاسیو شارستانیو سایکۆلۆژیش هایی کاریگەری ئەوسایان، هاوشانی مەزهەب گرنگ بوون. بەتایبەتی مانگرتنی کرێکارانی نەوتو باقی کارخانەکان، تەلاری ئابوری ڕژێمەکەی داڕووخاند. دیارە کرێکارانیش بەزۆری مەزهەب بزوێنەریان بوو. ئەمە ڕاستیەکە نکوڵی هەڵناگرێ.
٥- بەهیچ چەشنێک ئیمپریالیزم نەیدەتوانی دەستی عەسکەری وەرداتە ڕاپەڕینەکە، یان ناو ئێران، هەروەها مانۆری سیاسیو کودەتای عەسکەریش وەمو سەردەمی (مسدق) دادی نەدەدان.
٦-لێبڕاوی ڕێبەرایەتی ڕاپەڕینەکە بەبێ هیچ سازشێک هەتا ڕووخاندنی ڕژێمی شا. هەروەها زیرەکی ڕێبەرایەتی ڕاپەڕینەکەش لە بەڕێوەبردنی ڕاپەڕیوانو هانیان بۆ بەردەوامی ڕاپەڕین بەبێ هیچ پشوویەک یان دەرفەتدان بە دوژمنەکە مانۆری سیاسی بکات. بەبێ ئەوەی ڕابەڕینەکەش ئاوێتەی خەباتی چەکداری بکەن.

هەتا ڕادەیەک ئەو خاڵانە، گرنگترین هۆیەکانی سەرکەوتنی ڕاپەڕینی گەلانی ئێران بوون. سەرکەوتنەکەیش ئیمپریالیزمی دووچاری وەحشەت کردو گەورەترین

زیانی ئابووری‌و سیاسی لەم سەردەمەدا پێگەیاند. ڕاپەڕینەکە هێندە پشت‌شکێن
لەپڕو چاوەڕوان نەکراو بوو سەبارەت بە ئەمریکا، ئەسڵەن نەیانتوانی بیر لە
نەخشەیەکی باشیش بۆ کرپینەوەی خۆیان بکەنەوە. چونکە پێشتر چاوەڕوانی
ڕووداوی وا کاریگەریان نەکردبوو. هەر بۆیە سەرەڕای هەوڵی بێدرێغی ڕژێمی
شای بەکرێگیراویان کەوتنە بۆسەی نەپساوەی بەردەوامی ڕاپەڕینەکە.

دوای سەرکەوتنی ڕاپەڕینی بەردەوامی خەڵکی ئێران، وەکو هەموو
شۆڕشەکانی دیکەی پێشوو کرێکاران‌و میللەتانی جیهان، دەوڵەتانی
ئیمپریالیستی کەوتوونەتە توێژینەوەی سەرچاوەی کۆمەڵایەتی‌و ڕاپەڕینەکەو هۆی
سەرکەوتنە سیاسیەکەی، ڕەنگە سەدان ڕاپۆرت‌و لێکۆڵینەوە، هەزاران گوتارو
باسیان لەسەر نووسیبێ. بڕیاریان بۆ دابێ‌و نەخشەی چەواشەشیان بۆ کێشابێ
بەڵام ئەم قۆناخەش وەکو قۆناخی شۆڕشەکانی پێشوو، ستەمە ئیمپریالیزم بتوانێ
وا زوو پیلان‌و پلانی بەتاڵکردنەوەی ناوەڕۆکی ڕاپەڕینی بەردەوام پیادە بکات
ئەگەرچی وەکو شۆڕشەکانی پێشوو لەگەرمەی قۆناخی ڕاپەڕینی بەردەوامیش‌دا
بەهۆی سازشی ڕێبەرانی ڕاسترەوەوە یان پەلەی ڕێبەرانی بانچەپەوە، ئیمپریالیزم
بەداخەوە دەتوانێ هەندێ سەرکەوتن بەدەستبهێنێ بەتایبەتی لەڕێی
دەستنیشانکردنی ڕژێمی باشتر، یان پێشکەوتووتر لە ڕژێمە کۆنەپەرستەکان کە
خەڵکیان دژ ڕادەپەڕی هەروەها بەلاف لێدانی دیموکراسی‌و ئازادی‌و فشار خستنە
سەر ڕژێمە دیکتاتۆرەکان‌و یارمەتی دانیشیان هەتا ئەوانیش فشار لەسەر خەڵک
کەم بکەنەوە. هەموو ئەوانە لەلایەن ئیمپریالیزمەوە دەکرێن‌و زیاتریش لەو
سیاسەتانە پەرەپێبدەن. هەمووشی بۆئەوەی بەرهەڵستی لەبەردەم تەقینەوەی
ڕاپەڕینی بەردەوام دابنێن‌و لەمکاتەدا کە دیاردەی ڕاپەڕینی بەردەوام، دوای
بەسەرچوونی شۆڕشی درێژخایەن‌و بێ‌بایەخ بوونی چیقارستی‌و تیرۆر خەریکە
دەبێتە دیاردەی جیهانی، ئیمپریالیزم گەرمتر سەرقاڵی جۆرەها نەخشەی
چەواشەیە. لەم پێناوەش‌دا ئامادەیە بە سیاسەتەکانیدا بچێتەوە، دەست لە
نۆکەرانی هەڵبگرێ‌و دەستکەوتی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی زۆرتریش بۆ میللەتانی
دواخراو بهێنێتەدی. بۆ نموونەش: لەپاش سەرکەوتنی ڕاپەڕینی بەردەوامی ئێران،
چەندین ڕاپەڕینی دیکە لە جیهاندا ڕوویاندا، هەمووشیان لەناو قەڵەمڕەوی
وڵاتانی سەربە ئەمریکا.

لەمانگی شوباتی ١٩٨٦دا لە دوو دەوڵەتی ژێردەسەڵاتی ئیمپریالیزم، لە

هایتی‌و فیلیپین‌دا قینی جەماوەر جۆشیخواردو نزیکی پلەی تەقینەوە بوو بوون، لەو دوور ولاتەدا، دوو دیکتاتۆری بکوژی ناسراو حوکمیان بەزەبرو زەنگ زیاتر لە ۲۰ ساڵ سەپاندبوو. چار لەبەردەم ئیمپریالیزم نەما، فشار خستنە سەر ئەو دوو دیکتاتۆرە نەبێ بۆ دابینکردنی جۆرێک لە دیموکراسی بۆرژوایانە هەتا ڕقو قینی خەڵک پێش کاتی ڕاپەڕین بنیشێتەوە، واشدەرچوو. کە هەڵبژاردنەکە کراو هەردوو دیکتاتۆرەکە دۆڕان تەمایان بوو سەرەڕۆیی بنوێنن‌و مل‌نەدەن، بەڵام ئەمریکا ڕستی کێشان‌و ژمارەی دوو دیکتاتۆری شکاوی لەمێژوودا زیاد کرد، ڕەنگە لەو دوو ولاتەدا پێشڕەوێکی خاوەن متمانە هەبان ئەو هەلەی باش قۆستبایەتەوەو سەرکەوتنێکی مێژوویی هێنابایەتەدی. بەڵام نەخشەی چەواشەی دیموکراسی بۆرژوایانەو نەبوونی ئەو پێشڕەوە ئەو هەلانەی لەکیس‌دا.

پێش دوو ساڵ لەهەمان ڕووداو لە پاکستانیشدا ڕوویدایەوەو بەهێنانە سەرکاری (بینەزیر بۆتۆ) سیناریۆی سیاسەتێکی هەڵمژینی قینی جەماوەر جێبەجێ کرا.

لە بۆرمادا ڕاپەڕین ڕژێمی خستە گێروگازی نەمان، بەڵام نەبوونی بەرنامەو نەتەقاندنەوەی لە هەڵکەوتی خۆیدا، خەڵکەکەی دڵسارد کردو چەپڕەوەکانیش زوو پەنایان بردە بەر هەڵهاتن بۆ شاخ‌و جەنگەڵەکان‌و جەنگی پارتیزانی*، ئەمەش بۆخۆی نەخۆشیەکی ترسناکە لەسەرە ناوەرۆکی ڕاپەڕینی بەردەوام، ڕەنگە لەهەندێ ولاتدا وەکو (سلڤادۆر) هێشتا جەنگی پارتیزانی بتوانێ وەکو نیکاراگوا لەناو دۆخی تایبەتی ئەمریکای ناوەندیدا پاڵەپەستۆ بخاتە سەر ناکۆکیەکانی ڕژێم‌و ئاکام ڕاپەڕین لە شارەکاندا بتەقێنێتەوە، بەڵام لەکاتی ڕاپەڕین‌دا یان دوای شکانی ڕاپەڕین، جەنگی پارتیزانی نابێتە مایەی سەرکەوتنی ڕاپەڕین یان ڕاگرتنی گیانی بەردەوامی ڕاپەڕین.

لە پەناماشدا بەتاڵکردنەوەی ڕقی خەڵک‌و دوورخستنەوەی ڕاپەڕین بەنەخشەی جۆراوجۆر سەرخرا. ئەمریکا هاوشانی لافی دیموکراسی‌و هەڵبژاردن، لەم هارودۆخەدا کە لەتەک شوورەویدا بە گەرمی سەرقاڵی هاوژینی ئاشتیبانەبەو چەندین بەڵێن‌و پەیمانیان بەستووە، لەشکریشی بەردایە ناو پەناماو بەشەڕی

---

* ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە تەنها خەباتی چەکداری بە یاسای نەگۆڕی ڕزگاری دەزانن، دۆگمی شۆڕشی چەکدارییە!.

خوێناوی نەخشەکانی جێبەجێ کرد. گومانمان نەبێ کە ئیمپریالیزم نەخشەی نوێی جێبەجێ نەکردووی دیکەشیان هەیەو هەڵیانگرتووە بۆ ڕاپەڕینی بەردەوامی دیکە کە چارەنووسی ڕژێمێکی نۆکەری دیکەیان دەخاتە بەر مەترسی، دووریش نییە لەپاش سەرکەوتنی ڕاپەڕینی گەلانی ئێرانەوە دەزگای تایبەتی لە دەوڵەتانی ئیمپریالیستی بەچەکی تازەوە دانەمەزرابێ‌و هەر ئێستاش سەرگەرمی مەشق پێکردنی هێزی تایبەتی ئەو دەوڵەتانە نەبن کە مەترسی ڕاپەڕینیان لەناودا دەکرێ.

ڕێبازی ڕاپەڕینی بەردەوام دیاردەی شۆڕشگێڕانەی نوێی سەردەمە، دیاردەیەکی شۆڕشگێڕانەش کە لەسەر زەمینەی کۆمەڵایەتی‌و زەمانەی ناکۆکیە نوێکانی سەردەم بووبێتە دووڕغای کرێکاران‌و میللەتان، تازە وا زوو هەتا بەسەرچوونی دەورانی تەواوی هۆیەکانی سەرهەڵدانی لەناونابردرێ، ئەوەتانێ دوو ساڵ زیاترە گەلی قارەمانی فەلەستین، بەژمارەیەکی کەمترو لەسەر زەمینێکی تەسکدا لە ڕژێمێکی بەهێزو خاوەن پشتیوانی بێسنوور ڕاپەڕیوون‌و درێژتر لە شۆڕشی ئێرانیش، خەریکی ڕاپەڕینی بەردەوامن.

## ٥/٧- ڕاپەڕینی بەردەوامی فەلەستین

لەدوای داگیرکردنی نیشتمانی فەلەستین‌و دەرکردنی گەلی فەلەستین لەسەر زەمینی دێرینەی باوو باپیریان، فەلەستینیەکان چەندین جار پەنایان بردۆتە بەر چەک‌و بزووتنەوەی چەکدارانەیان تەقاندۆتەوە. کۆن هەرچەند ڕاسابن، شکێندراوون، لەساڵی ١٩٦٥ بەدواوە شۆڕشی فەلەستین، بەڕێبازێکی نوێ، بە پشتیوانی دەوڵەتە عەرەبیەکان، ئاکامی پەرەسەندنی گیانی ڕزگاری لەناو نەتەوەی عەرەبدا بەرپا کراوە، هەتا دوو ساڵ لەمەوبەر، شۆڕشەکە درێژەی چەکداری کێشاوە. لەناو گەرمەی ساڵانی شۆڕشەکەدا دوو جەنگی گەورە (١٩١٧-١٩٧٢) لەنێوان دەوڵەتانی عەرەب‌و ئیسرائیلدا هەڵگیرساوە. قوربانیەکی کەموێنە دراوە کەچی شۆڕشی درێژخایەنی فەلەستینیەکان هەتا هەنووکەش دوای ٢٥ ساڵ خەباتی چەکدارانە نەیتوانی نەک خاکی داگیرکراوی فەلەستین ڕزگار بکات، بگرە بستێک خاکیشیان لە فەلەستیندا بەدەستەوە نیە، زیاتریش لەوە لەناو خاکی لوبنانیشدا لە دوو ئۆردوگایان پەستاوون‌و چالاکی پێشمەرگانەیان نوزەی دێ، ئەوەی دەشکرێ خۆکوژیە!

جەنگی پارتیزانیو شۆڕشی درێژخایەنی فەلەستین لەڕووی عەسکەرییەوە، گەیشتۆتە بنبەست. ئەم شۆڕشە بەتوانای خۆی، بەنەخشەی ڕێبەرایەتیەکەیو بە چالاکی عەسکەری، ناتوانێ ستراتیژی شۆڕشەکە بەدیبهێنێ. شۆڕشەکە زیاتر بەستراوە بە ناکۆکیەکانی ناوچەکەو پشتی بەتوانا دیلۆماسیو سیاسیو دارایی دەوڵەتە عەرەبیەکان بەستووە، لەڕووی عەسکەریەوە بۆتە پاشکۆی ڕووداوەکانو سەربەخۆیی بڕیاری عەسکەری لەدەستداوە. لەناو خاکی فەلەستیندا ناتوانێ خۆی ڕابگرێ، لە لوبناندا گەورەترین پلانی شۆڕشی چەواشەی لەسەرەو سنووری تەسکیان بۆ داناوە. لەناو دەوڵەتە عەرەبیە هاوسنوورەکانی خاکی فەلەستینیش ڕێگەی نادەن چالاکی بنوێنێ. هەر شۆڕشێکیش بگاتە بنبەستی واو ببێتە پاشکۆی ڕووداوەکان، ستەمە بتوانێ ئامانجی میللەتەکەی بهێنێتەدی. ئەو گەیشتنە بنبەستەی شۆڕشی درێژخایەنی فەلەستین، ڕێبەرایەتی فەلەستینیەکان لێی بێئاگا نەبوونو ئەوان لە خەڵکی دیکە باشتر توانای خۆیان، دەسەڵاتی خۆیان، هێزی خۆیانو ڕادەی چالاکیو کارایییان لەبەرامبەر ئیسرائیلدا دەزانن. هەر بۆیە دەمێکە هاوشانی بوونی شۆڕشەکە، بەتەواوی توانایان خەریکی هاندانی جەماوەری فەلەستینین کە: مانبگرن، خۆپیشاندان بکەنو جۆرەها ناڕەزایی دەرببڕن، ساڵەها ئەو شێوە خەباتەش لەناو فەلەستینی داگیرکراودا لە: قودس، نابلس، غەزە، خەلیل، هەیفاو یافاو ئۆردوگا تەلبەند کراوەکانیاندا دەکران. زیانی کاریگەریان دەگەیاندە ئیسرائیلو خۆشیان شەهیدو بریندارییان دەدا، بەسەدان دەگیرانو ئەشکەنجەش دەدران بەڵام بیروباوەڕی نیشتمانپەروەریتیو گیانی بەرزی خۆڕاگری شۆڕشگێڕێتی لەبەرامبەر دڕندایەتیو نەژادپەرستی ئیسرائیلیەکاندا، هێندە بەرزو بەرزتر ڕادەگیرا، خەڵکەکە هەتا دەهات وورەیان باشتر دەبوو، خۆڕاگرتنی شۆڕشی فەلەستینیش لەبەرامبەر ئەو هەموو نەخشانەی شۆڕشی چەواشەی جۆراوجۆری دەوڵەتە عەرەبیو لایەنە کۆنەپەرستەکانیی دیکەدا قینی فەلەستینیەکانی ئەستوورتر بەرامبەر ئیسرائیل ڕاگرتووە، تەواوی ئەوانە لای خەڵکو ڕێبەرانی شۆڕشەکە مەسەلەی ڕاپەڕینی بەردەوامیان خەملاند. بۆیان دەرکەوت مەحاڵە شۆڕشی فەلەستین سەربگرێو خەڵکەکەی ڕزگار بکرێ بێ ڕاپەڕینی بەردەوام. وا لەناو خاکی فەلەستیندا زیاتر لەدوو ساڵە ڕاپەڕیوون، ئیسرائیل هەرچیەک دەکات دایمرکێنێتەوە پێی نەکراوە. ڕاپەڕینی بەردەوام بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی فەلەستینیەکانی گەیاندۆتە ئاستێکی جیهانیو

سیاسی و عەسکەری بەرز، دەوڵەتی کاتیان دامەزراند، نەتەوە یەکگرتووەکان دانیان پێدانان. سەفارەتیان لەزۆربەی وڵاتە گرنگەکانی جیهاندا کردۆتەوە. ڕێبەری شۆڕشەکە وەکو سەرۆکی دەوڵەت مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ، ڕاپەڕین؛ شۆڕش و گەلو خاک و نەتەوەی عەرەبیشی کرپوەتەوە، وورەی شۆڕشگێرانی بوژاندۆتەوە، سیاسەتی سازش و ڕیسوا کردووە. لەبەر ئەوەی ڕاپەڕینی بەردەوامی فەلەستین، دژی داگیرکەرو لەپێناوی رزگاری گەلو نیشتمانێکی داگیرکراوە، پێویستە بنچینەکانی بزانین، بیکەینە سەرمەشق و مەشقدانی خۆمان و خەڵکەکە.

بەشێوەیەکی گشتی ڕاپەڕینی ئێران و فەلەستین لەسەر پرینسیپی ڕاپەڕینی بەردەوام تەقیونەتەوە. هەردووکیان لەم هەلومەرجەی گەیشتنە بنبەستی شۆڕشی درێژخایەن، ڕێبازی نوێی رزگاری تێکشکاندنی رژێمە دیکتاتۆرەکانیان دارشت. بوون بە ئەڵتەرناتیفی شۆڕشگێڕانەی لەمەودوای کرێکاران و میللەتانی چەوساوە، لەپێش‌دا هی وڵاتانی ژێردەستە، پاش رزگاری چەندین میللەت، ڕەنگە ئەم شێوە ڕاپەڕینە بشگاتە وڵاتە سەرمایەدارە گەورەکانیش ئەمەش پەیوەستە بەوەی هەتا چەند میللەتانی ژێردەستە دەتوانن ئابوری خۆیان لەژێردەسەڵاتی ئیمپریالیزم بەهۆی ڕاپەڕینی بەردەوامەوە رزگار بکەن. بێگومان ئەمەش پێوەندی بەچۆنیەتی چینایەتی ڕێبەرانی ڕابەڕینەکانەوە هەیە، بەڵام شۆڕشی فەلەستین سەرەڕای باسا گشتیەکەی ڕاپەڕینی بەردەوام، خاوەن خەسڵەتی خۆیەتی کە هەڵقوڵاوی شەناوی گەلو خاکی داگیرکراوی فەلەستینە. ڕەنگە ئەم خەسڵەتانە زۆربەی پێناسەی ڕاپەڕینی بەردەوامی فەلەستین بگرێتەوە:

١- ڕاپەڕینەکە پاش ٢٣ ساڵ لە شۆڕشی چەکداری بەرپاکراوە، واتە لە بەدەنی شۆڕشەکەدا و لە بنبەست گەیشتنیدا ڕاپەڕینەکە تەقیوەتەوە.

٢- گەلێکی بچووک لەسەر زەمینێکی بچووکدا (پێچەوانەی ئێران) دژی رژێمێکی خاوەن خەڵکێکی زۆرتر و زاڵ، ڕاپەڕینەکەی بەرپا کردووە و هەتا ئێستاش هیچ جۆرە بەرپەرچدانەوەیەکی عەسکەری و ئابووری و سیاسیش بە پشتیوانی ئەمریکاش لەناوی نەبردووە.

٣- وێڕای مانی شۆڕشی چەکداری فەلەستین، ڕاپەڕینەکە لەناو خاکی فەلەستیندا تێکەڵاوی خەباتی چەکدارانە نەکراوە.

٤- سەرکردایەتی ناوخۆو دەرەوەی گەلی فەلەستین باشترین هاوکاری یەکتری دەکەن، بگرە هی ناوخۆ بەقسەی دەرەوە دەکات.

٥- ڕاپەڕینەکە پشتیوانییەکی فراوانی هەیە. تەنانەت لەناو دەوڵەتە سەرمایەدارییەکانیشدا. ئەمە لەناو ئێراندا بەدی نەکرا.
٦- لەڕووی دەرامەتو داراییەوە ڕاپەڕینەکەو ڕاپەڕیوان پەکیان نەکەوتوە.
٧- سەرکردایەتی باڵای ڕاپەڕینەکە لەژێر دەستی دوژمنیدا نییەو سەربەستە لە بڕیارو جموجۆڵی سیاسی (ئێرانیش وابوو)
٨- خەباتی نیشتمانیو هەستی میللی هاندەری، زۆربەی جەماوەری ڕاپەڕینەکەن.
٩- چەکو سەنگەربەندی شەڕەکان هەتا ئێستا بەکارنەهێندراوە بەڵام زەبروزەنگی توندی بەردهاوێشتنو قۆچەقانیو سووتاندنی سەیارەو دەبەو دارستانو کێڵگەی دوژمن، بگرە بەکارهێنانی چەقۆو کوشتنی سەربازو تاکو تەرای سەهیونیو خۆفرۆشانیش پێڕەو دەکرێ.
لەم ڕاستیانەش دەتوانین ئەوە هەڵهێنجین کەوا:
أ) ڕاپەڕینی بەردەوام لە بوونو نەبوونی شۆڕشی چەکداریدا نابێ تێکەڵاوی خەباتی چەکداری بکرێو بگۆڕدرێ بە سەنگەربەندی شارەکانو کۆڵانو ماڵان. ئەگەرچی چەکیش بۆ پاراستنی پێویستیەکی ڕاپەڕین یان بۆ کوشتنی خۆفرۆشێک یان بۆ ئەرکێکی دیکەی شۆڕشگێڕانە پێویست بێ، ئەوا نابێ بەکارهێنانی تفەنگ زاڵ بێ بەسەر ماکی ڕاپەڕینەکە.*
ب) پەنگی ڕقو قینی پیرۆزی جەماوەر بگاتە ڕادەیەک ئامادەبێ لەسەر ڕاپەڕینی بەردەوام، هەتا ئاکامی سەرکەوتن بەردەوام بێت.
ج) سەرکردایەتی ڕاپەڕینەکە متمانە پێکراو بەتواناو بەناوبانگو لە شوێنی دوورە دەستی دوژمناندا بن.
د) شیرازەیەکی ئایدیۆلۆژی بەهێزو لەشکان نەهاتوو، هاندەری بەردەوامی ڕاپەڕین بێو ڕاستاڵی ڕاپەڕیوان بێ.
هـ) بڕیاری سیاسیو ڕاگەیاندنی ڕێبەرایەتی ڕاپەڕین، بەردەوان بگەیەندرێتە دوا کەسی ڕاپەڕین، لەڕێی ئێزگەو یان بێتەڵو بڵاوکراوەش.
و) پشتیوانی ئاژانسو ڕای گشتی جیهانی باش بۆ ڕاپەڕینەکە دابین بکرێ.
س) ڕێگە بە توندڕەوایەتی بەهەردوو باڵی ڕاستو چەپیەوە نەدرێ. ڕاستەکەیان دڵی خەڵک سارد بکەنەوەو چەپەکانیش گیانی بشێوی بڵاوبکەنەوە.

---

* مخابن، لە ڕاپەڕینی پێرارساڵی عێراقو کوردستاندا، چەک زاڵکرا.

ش) جۆرەها تاکتیک، دروشم، مانۆری سیاسی‌و دیپلۆماسی بگیرێتەبەر بۆ بەدیهێنانی ستراتیژی ڕاپەڕینەکە.
ح) تەواوی ئۆپۆزیسیۆن، حیزبەکان، ڕێکخراوە پیشەییەکان، کۆڕە ڕۆشنبیرییەکان، ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، مەزهەب‌و تەریقەت‌و کەسایەتییە بەناوبانگەکان، لەدەوری ڕاپەڕینی بەردەوام بەپێی بەرنامەیەکی سیاسی، شۆڕشگێڕانە کۆبکرێتەوەو پێشڕەوایەتی بکرێن.
ڕاپەڕین، باری سایکۆلۆژی تایبەتی هەیە، دەبێ گەوهەری ئەم بارە سایکۆلۆژیەی جەماوەری ڕاپەڕیو ڕێڕەوی بەردەوامی ڕاپەڕینەکە بپارێزێ‌و پەرەپێبدرێ، کە ڕاپەڕین گۆڕدرا بەشەڕە تفەنگ بێگومان بارە سایکۆلۆژیەکەی جەماوەریش دەگۆڕدرێ‌و چۆنایەتیەکی دیکە بەخۆی دەگرێ.
دوژمنە دیکتاتۆرەکان، زۆریان مەبەستە ڕاپەڕین‌و ڕاپەڕیوان ڕاکێشنە مەیدانی ش تفەنگ. چونکە لەشەڕە تفەنگدا چەند تفەنگ بۆ ڕاپەڕیوان دابین بکرێ، خا ن جەنگاوەرو سەنگەری تۆکمەش بێ، لەشاری هەڵکەوتووشدا، لە کۆڵانی تەنگەرو سەربانی بەرزیشدا شەڕەکان بکەن، لەم سەردەمەدا، زرێپۆش، فڕۆکە، تۆپ‌و گازی ژاراوی... تاد. دوژمنان بەهێزترن‌و شەڕەکانیش ئاکام دەبەنەوە ڕەنگە نەوەشی تیا نەمابێ کە شۆڕشگێڕەکان لە ڕێڕەوی درێژەکێشانی شەڕە تفەنگدا کاربکەنە سەر ورەی دەزگا سەرکوتکەرەکان. چونکە سوپا دیکتاتۆرو فاشیەکان، بەشی تایبەتی مەشق پێکراوی دژایەتی کردنی مانگرتن‌و ڕاپەڕینیان هەیە*. پەروەردەی ئایدیۆلۆژیان کردوون‌و گرێی ڕەوشت‌و ئاڵۆزی ویژدانیان تێداچاندوون مێشک‌و دەماغیان شتوون. هەربۆیە کوشتنی خەڵک لای ڕژێمە فاشیەکان وەکو وێسکی خواردنەوە وایە.
بە ئەزموونی ئێران‌و فەلەستین‌و ئەو دەوڵەتانەی لەژێر پاڵەپەستۆی جەماوەردان دیکتاتۆرەکانیان لەم چەند ساڵەدا هەڵهاتوون. دەردەکەوێ دەزگا فاشیە سەرکوتکەرەکان لەم هەلومەرجە جیهانیەدا توانای بەکارهێنانی تەواوی توانای خۆیان نەبێ. چونکە سوپای شا بەدرێژایی ٤٠ ساڵ پتر توانی چەندین

* شەڕی سەنگەر بەندی ناوشاری سنە کە (کۆمەڵە) لە کوردستانی بەشی ئێراندا کردی، باشترین بەڵگەیە.

بزووتنەوەی چەکدارانە لە ئێران و ئازەربایجان و کوردستان بگرە لە زەفارو بلوجستان پاکستانیشدا سەرکوت بکات، بەلام نەیتوانی ڕاپەڕینی بەردەوامی گەلانی ئێران دامرکێنێتەوە.

لەناو شۆڕشی فەلەستینیش‌دا هەمان ڕاستی زەق‌تر لە گەرمەی ڕاپەڕینەکەش‌دا دووبات دەبێتەوە، پاش شۆڕشەکانی پێشوویان لەم شۆڕشەدا فەلەستینیەکان ئەوپەڕی توانای میللەتەکەیان و نیشتمانپەروەرانی عەرەبیان خستۆتە کوڕی تێکۆشان، ئەزموونێکی عەسکەری قوڵ و توانای عەسکەری گەورەیان هەیە کەچی بەرامبەر ئیسرائیل سەرناکەون، نموونەی شەڕێکی قورس، باشترین بەڵگەی توانای عەسکەری فەلەستینیەکان و شایەتی بێهودەیی خەباتی عەسکەریانە.

سەرەتای مانگی تەمووزی ١٩٨١ نەبەرد لەنێوان فەلەستینەکان بەپشتیوانی دەوڵەتی ... ...اوە... ئیسرائیلیەکان‌دا بەتوندی تەقیەوە. پاش وردە بۆردومانی چەند ڕۆژەی ... ...ولا لە (٢٠)ی هەمان مانگدا فەلەستینیەکان لەتۆڵەی بۆردومانی بەردەوامی فڕۆکەکانی دوژمن‌دا چیبان لەتواناداا بووە خستیانەکار، (٣٣) ئۆردوگای زۆرەملێیان لەناو خاکی فەلەستیندا، (٨٨) جار بەتۆپ و کاتیوشا پەیتا پەیتا کوتا، (١٣٣٠) ڕۆکێتی کاتیوشایان داباراندە سەریان کەچی لەئاکامیشدا (٢) کەسیان کوژران و (٥٩)یش بریندار بوون. ئیسرائیلیش تەنها بە فڕۆکەی جەنگێن توانی بنکە گرنگەکانی شۆڕشی فەلەستین لەپایتەختی لوبنان‌داو پردی زێی لیتانی و ناوچەکانی زەهرانی و قاسمیەدا بۆردومان بکات، ئاکام: (١٠٠) پێشمەرگەیان شەهیدو (١٢٠) کەسیشیان بریندار کرد، (٢٠٠) هاوڵاتیش شەهیدو (٨٠٠) یشیان ئەنگاوت. جیاوازییەکی گەلێک زۆرە، شایانی باسە ئەوکاتە شۆڕشی فەلەستین (٣٠٠) تۆپی گەورەو (٢٠٠) ڕاجیمەو ڕۆکێت‌هاوێژی دووریان هەبووە، ئینجا ئیسرائیل وایشی پێکردووە. چونکە بەهێزتر بوون هەمیشە لە جەنگی مەیدانیدا لەجەنگی بەکارهێنانی چەکی قورس و چەکی چەواشەدا ڕژێمە بەتواناکان دەیبەنەوە، بەلام لەجەنگی میللەت بەرامبەر ڕژێمەکان... میللەت براوەن.

هەمان دەوڵەتی خاوەن هەزاران فڕۆکە، تانک و تۆپ و چەکی هەمەجۆرەی کوشندە، خاوەن مەشق پێکراوترین سوپای شۆڕشی چەواشە، خاوەن شانازی سەرکەوتنی عەسکەری گەورە لەجەنگی گەورەو لەبەرامبەر پێشمەرگەکانی

فەلەستین‌دا لەبەردەم دەست‌و پەنجەی ناسکی دەروون‌پاک، بەڵام پڕ لە ڕقی پیرۆزی منداڵانی فەلەستین‌و بەردی خاکی داگیرکراویان‌دا، سوپاکە دۆشی عەسکەری داماوەو چۆکی چەوساندنەوەی چەماوە، سوپاش هەمان سوپای سەرکوتکەر، خاوەن چەک‌و تۆپ‌و تانکی پەرەپێدراوتریش، چونکە هەلومەرجی ڕاپەڕین‌و کاریگەرە نیشتمانی‌و سیاسی‌و سایکۆلۆژی‌و کۆمەڵایەتیەکانی گەلێک جیاوازەو لەسەردەمی ئێستادا کە بیرو ڕای ئومانیستی (مرۆڤ‌دۆستی)و دیموکراسی‌و ئازادیخوازی ئەگەر بەدرۆش بێ، تەنانەت ڕژێمە سەرمایەدارەکانیش ناتوانن ڕاستەوخۆ دوژمنایەتی بکەن. بۆیە پێشێلکردنی ئەو درزیانەش، کە ماڵە لەسەریان، گران لەسەریان دەکەوێ.

## ٦/٧- بەردەوامی ڕاپەڕینی بەردەوام

ڕاپەڕینەکانی کۆن لەبەرامبەر ڕژێمە کەم ئەزموونەکانی سەرمایەداری، ئەگەرچی کرێکاران‌و زەحمەتکێشان ڕێبەرایەتی پێشڕەویشیان نەبوو، توانیان ڕژێمەکان لەبنەڕەتەوە بهەژێنن. نزیکیان بخەنەوە لە ڕۆخی ڕوخاندن بەڵام ئەو ڕاپەڕینانە، شۆڕشی ئوکتۆبەری لینینیش باقیان بەو ئەزموونە کەم‌و بەو کەم توانایەی سەرمایەدارانیش، سەرکوت دەکران. لەم هەلومەرجەشدا کە سەرمایەداران ئێجگار پەرەیان سەندووە، وڵاتانی ژێردەسەڵات‌و دەستی خۆشیان بەهێزکردووە، نوێترین ئامرازو شێوازی دامرکاندنی مانگرتن‌و ڕاپەڕینیان لە ڕووی سیاسی‌و پراکتیکەوە داهێناوە... بۆیە ڕاپەڕین بەناوەرۆکە کۆنەکەی کۆن سەرنەکەوتبێ‌و بەزووریش سەرکوت کرابێ، هەڵبەتە ئێستا ئەگەر کتومت بەهەمان پشووی کۆن ڕاپەڕین بکرێتەوەو بەهێزتریش بێت، دەتواندرێ دابمرکێندرێ، بەتایبەتی ئیمپریالیزم‌و ڕژێمە نۆکەرەکانیان لە وڵاتانی ژێردەستەدا لەم هەلومەرجەدا کە ئۆردوگای سۆسیال بۆرژواکان نابووت بووەو هەلێکی نوێیان دەستکەوتووە وا بەئاسانی لێناگەڕێن ڕێبازێکی وەرچەرخێنی مێژوویی نوێ وا ڕوو بێتە پێناوی زەحمەتکێشان‌و ڕووخێنەری چەوسێنەران. لەبەر ئەمە کە تەوژمی خەباتی خەڵک گەیشتە سەر ڕۆخی ڕووخاندنی ڕژێمە ستەمکارەکان، ئیدی لەهیچ تاوانێک ناپرینگێنەوە بۆ سەرکوتکردنی خەڵکەکە. هەرلەبەر ئەمەشە پێویستە نەخشەی ڕاپەڕین لەهەموو ڕوویەکەوە لەئاستی پێویستیەکانی سەرکەوتندا بێ.

ئەم بۆچوونەش باسی ڕووداوێکی ڕوونەداو نییە، بەڵکو باشتر قوڵبوونەوە

..ڕووداوێکی تازە: ڕاپەڕینی بەردەوام هەتا ڕۆژی سەرکەوتن کە دەڵێین ڕاپەڕینی بەردەوام، مەبەستەکە سازدانی تەواوی پێویستیە کۆمەڵایەتیو سیاسیو سایکۆلۆژیەکانی ڕاپەڕینە بۆ هەڵی هەڵکەوتووی شۆڕشگێڕانە، ئینجا دەستپێکردنیەتی. هەتا ئەو پێویستیانەش لە هەموو بارێکەوە ئامادە نەکرێنو لەسەرکەوتنەکەیشی هەتا ڕادەیەکی زۆر مسۆگەر نەکرێ، ڕاپەڕاندنو ڕاپەڕینی خەڵک لەبەرامبەر ڕژێمە دڕندەکانی وەکو عێراق کارێکی سەرچڵێتی ترسناکە.

لەم جیهانە گۆڕاوەدا، نابێ شۆڕش نەگۆڕێ، نەسەلماندنی گۆڕانو پەرستنی شۆڕشی نەگۆڕ، دۆگمایە. بانناوی بنێین دۆگمایەکی درێژخایەن، ئەم دۆگمە درێژخایەنە لەم سەردەمەدا بەتایبەتی لەناو بزووتنەوەی ڕزگاری گەلاندا زیانێکی ترسناکی هەیە. چونکە دۆگمەکە ئاوێتەی بیرو ڕای چەپو هاندانی هەڵوێستی ڕزگاری نەتەوایەتیو چینایەتی خەڵک دەکرێ.

دۆگماتیزمی درێژخایەنیش لە بۆتەی کردەوەدا دوای چەندین ساڵ، سەرکەوتنی بدەست نەهێنا، یان گۆڕانی گەورە نەهاتەدیو بیر لە ئەڵتەرتانیڤی شۆڕشگێڕانە نەکرێتەوە، ئەوا ئەو دۆگمە درێژخایەنە ڕواڵەتی چەپ بەرە بەرە دادەماڵێو لە قالبی دزیو دڕندەیەتیدا، زوڵمو زۆردا، دزیو درۆزنیدا، پلانو پیلانگێڕیدا، نەمانی بەزەییو کوشتنی دیلو ئەشکەنجەی خەڵکدا خۆی دەدۆزێتەوە، هۆیەکەیشی لەبەر ئەوەیە کە وردە بۆرژوا لەم هەلومەرجەدا دوا گۆڕەی شۆڕشی چەکداری ڕێبەرایەتی دەکات کە هەست بکات هەڵدەدێرێ، جۆرێک لە دڕندەیی دەنوێنێ دەکرێ بچوێندرێتە ڕەفتاری فاشیانە. هەتا دێت ئالآ هەڵگرانی ڕێبازی دۆگماتیزمی درێژخایەن لە کۆمەڵانی زەحمەتکێش پترو زۆرتر دوور دەکەونەوە. ئەم دوورکەوتنەوەیەش سەبارەت بەهەر لایەکی چینایەتی یان نیشتمانی بێ، کە لە ناکامی کارو کردەوەی خراپدا دێتەدی وا لە بزووتنەوەی چەکدارانە دەکات پێچەوانەی ڕاستە ڕێی سەرکەوتن هەڵدێرێ. هەرگیزیش نەتوانێ خۆی بگۆڕێو پێڕەوی لە ستراتیژی شۆڕشگێڕانەی نوێ بکات (ڕاپەڕینی بەردەوام). هەموو شۆڕشگێڕێکی چەکدار ناتوانێ وەکو شۆڕشی چەکداری فەلەستین پاش ٢٣ ساڵ، میللەتەکەی ڕاپەڕێنێ. ڕەنگە میللەتی فەلەستین، بەحوکمی ئەوەی سەرئەنجامی ناکامی نائاکامی شۆڕشی درێژخایەنو جەنگی گەورەی وڵاتە عەرەبیەکانو ئیسرائیل. ئەو هەموو زوڵمەی لێیان کراوە ئەو هەموو تاوانەی لە ئوردونو لوبنانو ئۆردوگاکانو دەوڵەتانی دیکەی عەرەبیدا لە کەسوکارو ئاوارەکانیان

دەکرێ، تالاْوی عروبەتیان! پێچێنشتوون، ئەمانە تێکڕا سەرباری چەوساندنەوەی ناو فەلەستین خۆی، بوونەتە ڤینێکی گەورەی نیشتمانیو میللیو سیاسیو سایکۆلۆژی، ئەو گەلە بچووکە لەبەرامبەر ئەو دوژمنە بەهێزەیدا.

ڕاپەڕینی بەردەوامیش بێ پێچو بەنا دەریخست، ئەگەر ڕێبازی هەلە بگیردرێتەبەر، چەکی قورسو توانای زۆر میللەتان رزگار ناکات، بەلاْم کە ڕێبازی ڕاست گیرایەبەر، میللەت بە نەبەردی بەرد دەتوانێ دوژمنی بەهێز بەزێنێ. مەبەست ئەوەیە وانەزانرێ شۆڕشی درێژخایەن مەرجی بنەڕەتی تەقاندنەوەی ڕاپەڕینی بەردەوامە، یان فاکتەری ڕاپەڕینە. نموونەش زۆرن کە لەناو دەیان میللەتدا شۆڕش ئەک خەڵکی ڕانەپەڕاندووە، بەڵکو پەکیشی خستووە. ڕاپەڕینی بەردەوام چەمکی بنچینەیی هەیەو نابێ بەهیچ کلۆجێک چ پێشو چ پاش ڕاپەڕین ببەسترێتەوە بە شۆڕشی چەکداری.

ڕاپەڕینی بەردەوام، لە جیهاندا بەردەوام دەبێ دژی ڕژێمە چەوسێنەرەکان، ئیمپرسالیزمو نۆکەرانیان دیاردەی وا بەسانایی ڕیشەکێش ناکەن. تاکە مەترسی لەسەر ئەم دیاردە نوێیە، خیانەتی بۆرژواکانە. ئەمان لەمێژوودا هەروەکو چۆن چەندین هەلیان لەکیس کرێکارانو گەلانداوە، ئاوهاش دەتوانن هەلکەوتی ڕاپەڕینی بەردەوام لەبار بەرن، لەبەر ئەم ڕاستیە، خەباتکردن بۆ رەخساندنی ستراتیژی ڕاپەڕینی بەردەوام لەناو ئەو میللەتانەی ناسیۆنالیستو ڕاستڕەوەکان مێژوویەکی درێژو کاراییەکی زۆریان هەیە، دانابڕین لە ململانێی ئایدیۆلۆژی دژی ئەو دوو ئاقارە ترسناکە.

ڕاپەڕینی بەردەوام...

لەم سەردەمەی ئیمپریالیزمدا لەسەردەمی شکستی ئەزموونەکانی سۆسیالیزمو زاڵی کۆنەپەرستیو دیکتاتۆریەتی بۆرژوادا، لەقۆناغی گەیشتنە بنبەستی شۆڕشی درێژخایەنو بێهودەیی جەنگی پارتیزانیدا، تاکە دەستەبەری شۆڕشگێڕانەی کرێکارانو زەحمەتکێشانە، تاکە ڕێبازی رزگاری گەلانی ژێردەستەیە. ئەگەر ئەم ڕێبازە نوێیە، پەرەپێبدرێو بکرێتە پێناوی بزووتنەوەی کرێکارانو گەلان، بێگومان ڕەوتی ژیان دەگۆڕێو ڕووداوەکانی کۆمەڵو پەرەسەندنی کۆمەلاْیەتی بەردەچەرخێ بۆ ئاستی بەرزی شارستانیەتی مرۆڤایەتی ڕاستەقینە. شارستانیەتی رزگاریو ئازادی، دیموکراسیو سۆسیالیزم.

بەبێ ڕاپەڕینی بەردەوام

ئیمپریالیزم دەتوانێت لەڕێی ڕژێمە نۆکەرەکانیانەوە، شێوە خەباتەکانی دیکە ئەگەر بکرێتە ڕێبازی سەرەکی سەرکەوتن، سەرکوت بکات. هەتا میللەتانی ژێردەستەش ئاوەها بەم ژێردەستەییە قایل بن و خۆیان لەڕووی ئابووری و سیاسییەوە ڕزگار نەکەن لە داهاتووی دووریشدا قوڵبوون و تەقینەوەی قەیرانەکانی ئیمپریالیزم ڕەچاو ناکرێ، هەتا قەیرانەکانیشیان نەتەقێتەوە، چاوەڕێ نەبێن خەباتی کرێکارانیان ببوژێتەوە و بەرەو سۆسیالیزم شۆڕش هەڵبهێنێ.

# ٨- گەلاڵەی شۆڕشی کوردستان

بەدرێژایی مێژووی کۆن‌و نوێی نەتەوەکەمان، شۆڕشی چەکداری لە شاخەکانەوە شەقڵی سەرەکی چۆنیەتی رزگاری کوردو کوردستان بووە دژی رژێمەکانی عوسمانی‌و سەفەوییەکان، پاشایی‌و کۆمارییە داگیرکەرەکانی کوردستان.

لەهەموو قۆناخەکانی خەباتی رزگاری نەتەوایەتی کورددا؛ لەپێش جەنگی یەکەمی جیهان، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە هەتا جەنگی دووەمی جیهان، لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە هەتا شۆڕشی ئەیلوول، لە شۆڕشی ئەیلوولیشەوە هەتا پاش هەرەس‌و سەرلەنوێ بەرپاکردنەوەی شۆڕشی درێژخایەنی دوای هەرەسیش، چەندین جار خەباتی چەکداری بەرپاکراوون‌و شکاون. دیسان خەباتی چەکداری‌و شکان بەبێ ئەوەی قۆناخەکانی خەبات لە هەموو بەشێکی کوردستاندا چەندین‌جار خەباتی چەکداری بەرپاکرابێ‌و شکابێ، دەرسی پێویستیشیان لێوەرگیرابێ، یان بیر لە گۆڕینی ڕێبازی خەباتی چەکداری کرابێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا سەرئەنجامی هەر خەباتێکی چەکداری زیانی گیانی‌و ماڵی‌و سیاسی‌و عەسکەری گەورە گەورەش لە نەتەوەی کورد دراوە. ئەگەر جاروبارێش ڕۆشنگەرانی کوردو سیاسەتمەدارانی کوردستان باسی شێوەی دیکەی خەباتیان کردبێ هەر گوێشیان نەدراوەتێ، بەڵکو هەموو جۆرە ناکۆکیەکی سیاسی‌و ئایدیۆلۆژی لەنێوان رۆشنبیرو ڕۆشنگرانی کوردو عەقڵیەتی خێڵخوازیدا بەتوندی بەرپەرچ دراوەتە. هەڵبەتە ئەم زاڵبوونەی عەقڵیەتی خێڵخوازییە هۆی مێژوویی‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتی هەیە. مەسەلەیەک نییە پێوەندی بە عەقڵیەتی

کوردەوە وەکو نەتەوەیەکی خاوەن خەسڵەتی خێڵەکی هەمیشەیی بێ.

هەتا دوای جەنگی یەکەمی جیهان، خەبات‌و بەرەنگاری چەکداری بۆیە شەقڵی سەرەکی خەباتی رزگاری بووە چونکە پێوەندی سەرمایەداری سەرئەنجامی شۆڕشی بۆرژوازی یان گەشەکردنی ئاسایی کۆمەلایەتی لە کوردستاندا زاڵ نەبووە بەڵکو پێوەندی ئابووری‌و کۆمەلایەتی (دەرەبەگایەتی-بازرگانی) لەناو چوارچێوەی عەقڵیەتی سیاسی (خێڵخوازی-ئایینی)دا سەراپا کوردەواریی تەنیبوو. ئەم پێوەندیە کۆمەلایەتی‌و ئابوریەو عەقڵیەتە سیاسیەش بەحوکمی ئەوەی لەناو میرنشینەکانی کوردستاندا دەسەلاتی سەربەخۆییان لە سایەی دەسەلات‌و یاسای ئیمپراتۆرتەکاندا هەبووە، بۆیە هەمیشە بەهەمان عەقڵیەتی خێڵخوازی حوکمیان کردەوەو لەکاتی تەنگانەو پەلاماردانی میرنشینەکانیشدا، تاقە ڕێگای بەرەنگاری چەکداری بووە، چونکە شێوەی دیکەی خەبات لەناو ئەو پێوەندی‌و عەقڵیەتەدا دروست نابێ، دروستیش بوایە هیچ کارێکی لە ئەستەمبوڵ‌و تاران نەدەکرد. بەرەنگاری چەکداریەکەش جەنگی بەرەیی فراوان بووە بەرامبەر ئیمپراتۆرەتەکانی سەفەوی‌و عوسمانی، زۆر کەم بگرە بە لاساری سەردارو ناودارانی هەندێ لە مەڵبەندەکان جەنگی (هەڵمەت‌و هەڵێ-کروفر) وەکو شێوەی جەنگی پارتیزانی گیراوەتەبەر، هەر ئەوساش سەرەڕای ئەوەی کەمترین زانیاریش لەسەر جەنگی پارتیزانی نەبووە، ئەم شێوە پارتیزانییە ئەنجامی عەسکەری پتر بووە لە جەنگە بەرەییەکان، بەزیانێکی کەمتریش: باشترین ئەزمونی سەرکەوتووی جەنگی (بەرەیی- پارتیزانی) بەرەنگاری چەکدارییەکەی ئاورەحمان پاشای کوڕی مەحموود پاشای بابانە لە ساڵی ١٧٨٩-١٨١٣ درێژەی کێشاوە، سەرەڕای ئەوەی جۆرەها پیلانی والی بەغداو هەڵگەڕانەوەی براو خزمەکانی‌و دژایەتی عوسمانی‌و سەفەویەکانیش دژی نەبردراونەتەوە. دوای ئەوەش، هەندێ ئاغاو سەرداری ناوچەکانی موکری، دەرسیم‌و هەکاری هەمان ڕەوتی جەنگی (پارتیزانی-بەرەیی)یان گرتەبەرو سەرکەوتوتر بوون لەجەنگی بەرەیی بەتەنیا، شێخ مەحمودیش کاتێک پەنای دەبردە بەر شاخەکان‌و هێزەکەی لەقەرەی جەنگی بەرەیی وەکو دەربەندی بازیان نەدەدا، کاریگەرترو کەم زیانترو زۆرتر خۆی ڕادەگرت. بەلام هیچی ئەو ئەزموونانە، نە ڕێبازی چەکداری زاڵیان گۆڕیوەو نە تاکتیکی زیرەکانەی خەباتی چەکداریشیان هێناوەتە ناو ستراتیژی خەباتی چەکداری هەتا جەنگی دووەمی جیهان.

لەدوای تێکشانی ڕاپەڕینە چەکدارەکانی پاش جەنگی یەکەمی جیهان لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا، لە سییەکان بەدواوە سەرئەنجامی سەپاندنو بلاوکردنەوەی سەرمایەو پێوەندی سەرمایەداری لە کوردستانداو بە زۆرەملێ شەتەکدانی بازاڕی کوردستان بە بازاڕی دەوڵەتە داگیرکەرەکانەوە، شارو بازاڕی ئابوری لە شاراندا بایەخی پتر پەیدا کرد، بزووتنەوەی سیاسیو ڕۆشنبیریو ڕۆشەنگەری (تنویر) کەوتنە ناو خەڵک، بەڵام لەبەر ئەوەی پێوەندی سەرمایەداری لەلایەن بێگانەوە بەڵکو بەپێی بەرژەوەندی بێگانەی داگیرکەریشەوە هێندرانە کوردستانو لە کوردستاندا پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ڕۆشنبیری شێوێندرا، سەرجەم ئەوانە کارێکی کاریگەریان کردە سەر ڕەوتی گۆڕانکاریەکانو ڕەوەندی ڕووداوەکان. لەپێشەوەیاندا، ڕوونەدانی شۆڕشی بۆرژوازییە لە کوردستاندا دژی دەرەبەگایەتی بەمەش جگە لەوەی بۆرژوازی پیشەسازیی نیشتمانی وەکو هی وڵاتانی پێشکەوتوو یان نیمچە پێشکەوتووش پێک نەهات، جگەلەمە دەرەبەگایەتیش مایەوەو بەم مانەوەیەش بەهۆی پایەی ئابوریو دەسەڵاتی کۆمەڵایەتیو نفوزی ئاینییانەوە تێکەڵاوی ڕاستەوخۆی بازاڕی شاران بوون، بەڵکو ئەوەی بۆ دەرەبەگی وڵاتانی لەمەڕ کوردستان ڕەخسا، دەرەبەگایەتی هەر ئەمەی دەویست، لەلایەکەوە ئیمپریالیزم بەنەخشە کۆنینەکانی پشتیوانی دەکردن لەلایەکی دیکەشەوە بۆرژوای پیشەسازی پێک نەهات هەتا شۆڕشی بۆرژوازی دژیان بەرپا بکات، ئەنجامی پشتوانی ئیمپریالیستیو پەیانەبوونی بۆرژوازیو بزووتنەوەی شۆڕشگێرانەی بۆرژوازیانەش، جووتیارانی کوردستانیش نەیانتوانی ڕاپەڕینی چینایەتی بەرپابکەنو سەر بخەن، ئەگەر بە پەراگەندەییش لە هۆرینو شێخانو دزەییو موکریان...تاد. لە چلەکانو پەنجاکاندا زوڵمو زۆر ڕاپەڕاندبن، چونکە زەمینەی سەرکەوتنیان نەبووەو دوژمنیان زۆر بووە، بۆیە بەئاسانی خەڵتانی خوێن کراوون.

لەسەر ئەو زەمینە ئابووریو کۆمەڵایەتیەوە، عەقڵیەتی خێڵخوازی گوێزرایەوە بۆ شارەکانو تێکەڵاوی هێزە سیاسیەکانو ڕۆشەنگەریو ڕۆشنبیریەکانیش کرا. بەڵکو لەناو خەباتی ڕزگاریدا هەتا ڕادەیەکی دیار زاڵیش بووە. ئەمە لەکاتێکدا لە ئەورووپادا بەو شێوەیە نەبووە. شۆڕشی بۆرژوازی سەرکەوتووە، ڕیشەی دەرەبەگایەتی لەڕووی ئابووریو سیاسیەوە هەڵکشاوە، دوای بەزینی دەرەبەگو

دەرەبەگایەتی، ئۆرستۆکراتیەتی بریتانیو سویدیو هۆلاندیو تەواوی ئەو ولاتانەی شایان وەکو هێما تێدا ماونەتەوە، چاریان لەبەردەمدا نەما تەسلیم بوون نەبێ بە شۆڕشی بۆرژوازی. بەم تەسلیم بوونەی ئورستۆکراتیەت، بەشێک لە مولکیان بۆ مایەوە بەلام دەسەلاتی سیاسیو نەخشەی ئابوریان لێسەندرایەوە. هەربۆیە لە ئەورووپادا ئەگەرچی توێژی ئورستۆکرات مایەوە، بەلام شۆڕشی بۆرژوازی زالبوو. ئەو چینە ئورستۆکراتە دوای کۆششی چەواشە لەسەرەتای سەرکەوتنی شۆڕشی بۆرژوازیدا تەواو لێنخرانو دەمێکیشە کراونەتە بەشێک لە کلتووری ڕابردوو!

تاقە نموونەیەک لە کوردستانی بەشی عێراقدا، نیشانەی سەرەتای گواستنەوەی ناوەندی خەبات بێ بۆ شار، ڕاپەڕینەکەی ڕۆژی ڕەشی ئەیلولی سالی ۱۹۳۰ـە. دیارە ئەمە سەرەتایەکی خۆڕسکی بوو لەناو چوارچێوەی پێوەندییە ئابوریو کۆمەلایەتییە زالەکەی خێلەکیەکەدا نەیتوانی ئاقاری سیاسی نوێ بۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلەکەمان بچەسپێنێ، ئەگەرچی بایەخیشی هەبوو. بەلام ئەم بایەخە بایی ئەوە نەبووە کە بە تەواوەتی بزووتنەوەی گەلەکەمان لە کۆنترۆلی سیاسەتی خێلخوازی دەرباز بکرێ، یان چیدیکە پەنا نەبردرێتەوە بەر خەباتی چەکداری بە ڕێبەرایەتی عەقلیەتی خێلخوازی.

ژانی هەرە گەورەی مانەوەی دەرەبەگایەتیو ڕوونەدانی شۆڕشی بۆرژوازی لەوەدا نییە چینەکە لەناو نەبرا، بەلکو لەوەدایە کە تێکدانی پەرەسەندنی کۆمەلایەتیو شێواندنی بنەمای ئابووریو بەزۆرەملێ لە قالبدانی کوردستان بە دەولەتانی داگیرکەرەوە، پێوەندیو عەقلیەتی خێلخوازی تێکەلاوی بازاڕو بازرگانی کوردەواری کردو بەهۆی ئەمەشەوە لەناو بزووتنەوە سیاسییە ڕزگاریخوازەکەی میللەتی کوردیشدا، پایەو پلەی سەرداریتی پارێزا. تەنانەت بەچەشنێ ئاوێتەی ئابووریو کۆمەلایەتیو سیاسی بوون، بنچینەی شۆڕشی بۆرژوایی دژی دەرەبەگایەتی لە کوردەواریدا ئاقاری دیکەی بەخۆیەوە گرت، ئەویش ئاقاری خەباتی ڕزگارییە دژی بێگانە. زولمو زۆری بێگانەش هێندە کۆنەپەرستانە بووە، ناکۆکیەکانی ناو کوردەواری سارد کردووەو دژایەتی بێگانەی گەرم داهێناوە.

## ١/٨- کۆماری مەهاباد، وەرگۆڕان بۆ شارەکان

کۆماری مەهاباد ١٩٤٥-١٩٤٦ تاقە ئەزموونی سیاسی جەماوەریی فراوانی ناو شارەکانی کوردستان بووە کە خەباتی چەکداری لە شاخەکانەوە خرابێتە خزمەتی کۆمار... سەرەڕای ئەوەی سوپای پێشمەرگەی پێکەوەناوە، بەڵام خەباتی پێشمەرگانەی وەکو مێژووی خەباتی رزگاری ڕابردووی کوردستان، نەکردبووە ستراتیژی نەگۆڕ، پێشمەرگە تەنیا وەکو هێزی پارێزەری کۆمارو ئاسایشی کوردستان تەماشاکراوە دەنا نە کۆمارەکە ئاکامی خەباتی چەکداری دامەزراوەو نە کاتێکیش کۆماری مەهاباد کەوتەبەر پەلاماردان پێشەوای کۆمار پەنای بردەوەبەر خەباتی بەرەنگاری شاخەکان: لەکاتێکدا سوپای هەبووەو تەنانەت پشتیوانیو توانای سوپای کوردستانو ڕادەی کارایی کۆماری مەهاباد لەسەراپای کوردستاندا سەدان قات پتریش بووە لەتوانای سەردارانی کورد کە پێش کۆمار ڕاپەڕینی چەکداریان بەرپاکردووە.

هۆیەکانی هەرەسهێنانی کۆماری مەهاباد

هۆیە ئابووریو سیاسیەکانی، هۆیە عەسکەریو کۆمەلایەتیەکانی، هەروەها هۆیەکانی ئێرانیو جیهانیو دیبلۆماسیەکانی ڕووخاندنی کۆماری مەهاباد بیروڕای جیاواز هەن، بەڵکو ڕەخنەی توندیش لەسەر قازی محەمەد بەهۆی خۆبەدەستەوەدانی بە ڕژێمی شا هەیە، دوای ئەوەی شورەوی لە ڕێکەوتنانەی (تارانو یالتا)دا لەگەڵ دەولەتانی هاوپەیماندا ڕێکەوتبوو، ئێران چۆڵ بکاو پشتیشی کردە کۆماری مەهاباد، ئەو ڕەخنانەی لەسەر پێشەواو هاوڕێکانی بۆ خۆبەدەستەوانیان وەکو ڕێبەرانی کۆمار بەداگیرکەران ڕاستە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بەرگری چەکدارانە بەو سوپایەی هەبووە، یان بەگۆڕینی ستراتیژی عەسکەری بە پارتیزانی لەباشەڕۆژدا سەرکەوتنی بۆ کۆمار مسۆگەر دەکرد. بۆچوونی لەم چەشنە لەژێر کارایی خەباتی چەکداری لەمێژینەی کوردە. شۆڕشی ئەیلوول لە کوردستانی بەشی عێراقدا، دوای ١٢ ساڵ ڕووداوی سیاسیو عەسکەریو جیهانیو ناوچەیی جۆراوجۆر لە زەمانو زەمینەیەکی گۆڕدراوی پێشکەوتووتردا، بە ڕێبەرانی بارزانی کە لایەنگری بەرەنگاری چەکداری بووە لە کۆماری مەهاباد دا، باشترین بەڵگەیە کە دژوار بووە کۆماری مەهاباد بە بەرەنگاری چەکداری توانیبای سەربکەوێ.

کاتێک کۆماری مەهاباد دامەزراوە جەنگی دووەمی جیهان لەتەواو بووندا بووەو ڕێکەوتننامەی جیهانی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی لەسەر ئێران لەنێوان زلهێزە سەرکەوتووەکاندا، مۆرکراوەو بڕیار بووە ئێران سەرانسەر چۆڵ بکرێ. شورەوی کە پشتیوانی کۆمارەکە بووە، بەڵکو بە هاندانی شورەویش کۆمارەکە بۆ کێشمە کێشی بەرژەوەندی زلهێزەکان لەناوچەکەدا هاوشانی کۆماری ئازەربایجان دامەزراوە، ڕێکەوتننامەکانی مۆرکردووەو بەرژەوەندیەکانی لە ئۆرووپای ڕۆژهەڵاتدا دابین کردبوو بۆیە بەڵێنی جێهێشتنی ئێرانیشی کۆتایی هاتبوو تەنیا ئەوە مابوو شورەوی لەم سەر سنوورەشی دڵنیابێ‌و دەستکەوتێکیشی دەستبکەوێ. جگە لەم ڕاستیە، کێشەی کورد لای شورەوی وەکو کێشەی نەتەوەیەکی داگیرودابەشکراو گەلاڵەی سیاسی نەکرابوو.

ئەم کۆمارە... بێ شۆڕشی بۆرژوازی، لەسایەی کێشمە کێشەکانی جەنگی دووەمدا، سەرئەنجامی نەمانی کۆنترۆڵی ڕژێمی شا دامەزرابێ، دیارە وەرگۆڕانێکی (تحول) سیاسی ـ کۆمەڵایەتی گەورەیە بەسەر پێوەندی دەرەبەگایەتیدا کە لە کوردستاندا زاڵبووە. بەڵام وەرگۆڕانەکە لە ناوخۆدا شۆڕشگێڕانە نەخوڵقاوە. بەڵکو ئەمیش دژی بێگانەیەکی دوژمنی (ڕژێمی ئێران) بە پشتیوانی دۆستێکی بێگانە (شورەوی) کە گوایە دوژمنی دوژمنەکە بووە، دامەزراوە. لەحاڵەتی واشدا، دیسان پێوەندی خێڵخوازی تێکەڵاوی کۆمارەکە دەبێ‌و دەشبینیتە بەشێکی گرنگی سوپاو تەلاری سیاسی کۆمارەکە. کە کۆمارەکەیش دەمەزراوە بڕیاری دژایەتی لیبڕاوی خێڵەکێتی نەدراوە. تەنانەت لەگەورەترین پایەکانی کۆماردا سەردارو موڵکداری کورد دامەزراون. ئیدی کاتێک جەنگی دووەم ڕادەوەستێ‌و شورەوی پاشەکشە دەکات، سەرئەنجامێکی ئاساییە پەلاماری کۆمار بدرێتەوە، کۆماریش کە تەریک دەمێنێ‌و کۆماری ئازربایجان دەروخێ، ئەمیش بێ پشتیوان‌و بەو سوپا پێکهاتووە لە سەردارو موڵکداری کوردەواری، بەبێ ئەوەی گۆڕانی ڕادیکالانە لە ئێراندا ڕوویدا، هەرگیز نەیتوانیووە بڕیاری بەرەنگاری چەکداری بدات. بڕیارەکەیشی بدایە تێکدەشکا، چونکە قازی محەممەد دوای ڕاگیرانی جەنگ‌و دوای سەردانەکانی لە شورەوی، زانیویەتی سیاسەتی نێونەتەوایەتی پێچەوانەی مانەوەی کۆمارە لەناو ئێراندا، سەردارو موڵکدارانی کوردەواریشی باش ناسیووە کە دژوارە بۆ بەرەنگاری چەکدارانە پشتیان پێ ببەسترێ. هەر زوو سەرەتای ڕاڕایی‌و خیانەتیان

دەرکەوتووە. بۆیە کۆماری مەهاباد وەکو وەرگۆڕانێکی کۆمەلایەتیو سیاسی لەشاخەکانەوە بۆ شارەکان، تەمەنی هێندە نەبوو پرۆسەی پێویستیو پێداویستیەکانی وەرگۆڕانەکە بەرێتەسەر. بەلام وەکو دەستکەوتێکی گەورە شوێنی لەناو ڕووداوەکاندا گەشە. ئەگەرچی زووش خامۆش کرا.

## ٢/٨- شۆڕشی ئەیلوول، گەڕانەوە بۆ شاخەکان

دوای تێکشکاندنی ڕاپەڕینە چەکداریەکەی بارزانو ڕووخاندنی کۆماری مەهاباد، سەرانسەر بەشەکانی کوردستان پاشەکشەی خەباتی چەکداریان بەخۆیانەوەدی، ئیدی ڕاپەڕینێکی چەکداری-سیاسی ڕزگاریو دیموکراسی تایبەت بە کوردستان نەتەقینەوە. بەلام خەباتی سیاسی بەردەوام هەبووە، خەباتەکەیش تێکەلاوی بزووتنەوەی سەراپای ولاتانی داگیرکەری کوردستان بە حوکمی ڕووداوەکانو لەژێر کارایی سیاسەتی ڕاسترەوانە، زیاد لەپێویست کرا.

دوای شۆڕشی تەمموزی ١٩٥٨ عێراق لەپاشایەتییەوە کرایە کۆماری، کۆمەلێک دەستکەوتی ئابووریو کۆمەلایەتیو سیاسی بۆرژوایی هاتنەدی، بەلام شۆڕشە بۆرژوازیەکە زوو لە ئەرکەکانی دیموکراسی هەلگەڕایەوەو هاوشانی دژایەتی ئازادی لەسەراپای عێراقدا، دژایەتی مافە نەتەوایەتیەکانی کوردیش کرا. تەنانەت ئۆتۆنۆمیش کە لەدوای سەربەخۆییو کۆنفیدرالو فیدرال، چوارەمین پلەی مافی گەلانەو بە ناچاریش ئەم مافە دەسەلمێندرێ، بە کورد ڕەوا نەبیندرا، بەرە بەرە دژایەتی دیموکراسیو مافەکانی گەلی کورد توندتر کرا، بەلام پێش ئەوەی لە سەراپای عێراقدا بگاتە بنبەستو دۆخی شۆڕشگێڕانە بخەملێ، لە کوردستاندا هەستە نەتەوایەتیەکەو بوونی پێشینەیەکی گیانی بەرەنگاریو هەلکەوتی جوگرافی، زووتر، واتە پێش وەخت گەیەندرایە خەباتی چەکداری.

ئەوکاتەی لەکوردستانیشدا پێش وەخت ناکۆکیەکان لە خەباتی چەکداری نزیکخرانەوە، لەسەر ئاستی عێراقدا ناکۆکیە سیاسیەکان لەناو کاربەدەستانی ڕژێمدا دەئالۆزراو لەناو هێزە سیاسیەکانو ڕژێمی عێراقدا لە تێکچووندا بوو، لە هەلومەرجێکی وادا کە شۆڕشی بۆرژوازی لە ئەرکەکانی دیموکراسی هەلدەگەڕێتەوەو دەستکەوتە ئابووریو کۆمەلایەتیەکان ڕادەگرێو دژایەتی مافی میللی دووەمین گەلی عێراق کە کوردە، دەکا، ئیدی شتێکی ئاسایی لەناو کوردەواریدا پاشماوەی دەرەبەگایەتی کە لەسایەی یاسای نیوەچلی کشتوکالدا

خۆیان پەناداوەو ڕەگ و ڕیشەی مێژوویشیان لەناو کورد دا تەک هەڵنەکێشراوە، بەڵکو ئاوێتەی خەباتە سیاسیەکەش بووە، بۆیە سەرئەنجامێکی چاوەڕوانکراوە پاشماوەی خێڵەکی بێتەوە ناو بزووتنەوە چەکداریەکە، ڕووداوەکانیش سەلماندیان کەوا نە تۆمەتی بزووتنەوەی دەرەبەگایەتی خستنە پاڵ شۆڕشی ئەیلوول لەلایەن ڕژێمەوە ڕێڕەوی خەباتە چەکداریەکەی کوردستانی لەناوبردو نە هەموو ئەو ململانێ لاوەکیە ناوەخت تەقێندراوانەی ناو بزووتنەوەکەش هەتا ڕادەی پێکدادانی چەکدارانەو دووبەرەکی عەسکەریان گەوهەری بزووتنەوەکەی گۆڕی. هەرچی ڕژێم توندتر دژایەتی بزووتنەوەکەی دەکرد، هێندە زیاتر بزووتنەوەکەی لەناو کورد دا خۆشەویستتر دەکرد هەموو ئەو ململانێ بەناو چینایەتیانەی لەناو پارتی و لە دەرەوەی پارتیدا، دژی سەرکردایەتی پارتی و بارزانیش تەقینەوە، هیچ جۆرە دەستکەوتێکی ئابوری و کۆمەلایەتی و سیاسی بۆ کرێکاران و زەحمەتکێشان نەبوو، بەڵکو زیانی کاریگەریشی پێگەیاندن، جگە لە زیانی گیانی و ماڵی، زیانی سیاسیشی لە چەواشەکردنی زەحمەتکێشاندا هەبوو.

بەشێوەیەکی گشتی، شۆڕشی چەکداری ئەیلوول، گەڕانەوە بوو بۆ هەمان ڕێبازی چەکداری لەمێژینەی نەتەوەی کورد، بەلام لە زەمان و زەمینەیەکی کۆمەلایەتی و سیاسی و جیهانی نوێدا، بەتایبەت سەرکەوتنەکانی ڤیێتنام و چین و کۆبیاو کوبا.. دەنگ و ڕەنگێکی ڕادیکالانەی لەناو تێکڕای میللەتانی ژێردەستەدا دابوویەوە. لەبەر ئەمەش جیاوازی گەڕانەوە بۆ خەباتی چەکداری مێژینەی کوردستان لە شۆڕشی ئەیلوولدا لە پیڕەوکردنی جەنگی پارتیزانی و بەرنامەی سیاسی خەباتە چەکداریەکەو دیپلۆماسیەتی شۆڕشەکەو داوودەزگاکانی پێوەندی سیاسی و ماڵوی مفاوەزاتەکانی دەردەکەوون.

ئەوەی مایەی سەرنجە لە شۆڕشەکەدا، ئەوەیە کە سەرەڕای جیاوازی تاکتیک و دروشمەکانی شۆڕشی ئەیلوول کە یەک پشوو چواردە ساڵی ڕەبەق خەباتی چەکداری ڕاگرت، دەبینین پارتی دیسان خەباتی چەکداری کردە ستراتیژی ئەگێڕی خۆی و چارەنووسی سیاسی خۆیشی بەستەوە بە ئەنجامی خەباتە چەکداریەکە. ئەمە لەکاتێکدا پارتی بەردەوام پێوەندی بە شارەکانی کوردستانەوە هەبووەو ناوبەناو گفتوگۆی کردووەو جۆرەها ڕژێمیش گۆڕاوون و چەندین ڕووداوی گەورەو گچکە لەناوچەکەداو لە عێراق و کوردستاندا ڕوویانداوە.

ئەگەر لەدەستپێکی شۆڕشەکەوە هەتا بەیانی ١١ی ئادار، درێژەپێدانی

شۆڕشی چەکداری پاساری سیاسیو عەسکەری هەبێ، ئەوا دوای بەیانی ئادار لەبەرئەوەی ستراتیژی سیاسی پارتی (دیموکراسی بۆ عێراقو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) نەگۆڕاو هەلومەرجی سیاسی جیهانو ناوچەکەش پتر لە بەرژەوەندی زلهێزو ڕژێمە بۆرژوا-دیکتاتۆرەکانی ڕۆژهەلات شکایەوە، بەتایبەتی بەرزبوونی نرخی نەوت لەسەرەتای حەفتاکاندا داهاتی ڕژێمی عێراق وا بەرز کردەوە ئاشکرا دەرکەوت کە ئەم ڕژێمە تەمەنی سیاسی بە خوێنبەری ئابووری درێژ دەبێ، بۆیە لەدوای ڕێکەوتنامەی بەیانی ئادارەوە دەبوو سەرکردایەتی پاری بە گەرمی هەولی گۆڕینی ستراتیژی خەباتی چەکداری شاخەکانیان بە ستراتیژی ڕاپەڕینی شارەکان لە پەنای خەباتی چەکداریدا دابا، واتە خەباتی چەکداریو بوونی هێزی پێشمەرگە بخرایەتە خزمەتی خەباتی جۆراوجۆری ناو شارەکانو شا ڕێبازی خەباتی شارەکانیش کە ڕاپەڕینە، بەتایبەتی ڕاپەڕین سالەهای سال لە عێراقدا تاقیکرابووەوەو ئەنجامی شۆڕشگێڕانەشی باش دەزاندرا. بەلام نە پەندەکانی مێژووی خەباتی چەکداری لە کوردستانداو نە دەرسەکانی کۆماری مەهاباد لە خەباتی سیاسیو جەمارەری شارەکانو نە ئەزموونەکانی ڕاپەڕین لە عێراقو ناوچەکەدا ئەندێشەی خەباتی چەکداری ناو بزووتنەوەی کوردیان وەکو ستراتیژ نەگۆڕی ئەگەرچی شێوەی خەباتی سیاسیو دیبلۆماسیو مانگرتنی شارەکان هەتا ڕادەیەک فەرامۆش نەکران، بەلام ستراتیژی چەکداری مایەوەو ئەو شێوە خەباتانەش لقو پۆپی ستراتیژەکە بوون لەکاتێکدا لەدوای بەیانی ئادارەوە پارتی لەناو گەلی کورد دا پێشەنگی دوای تێکشکانی تەیارەکانی بوو لەناو خاوەن هێزو توانای ڕاگەیاندنی گەورەو دەیان هەزار کادیرو سەدان ئۆرگانی سیاسیو کۆمەلایەتیو پیشەییو داوودەزگای هەمەچەشنی بەڕێوەبردن بوو. زۆربەی کوردستان لەژێر کۆنترۆلی سیاسیو ئیداری پارتیدا بوونو باقی ناوچە کورد نیشینەکانی ژێر ڕکێفی ڕژێم تا ڕاستەوخۆ بە ئاراستەی پارتیو بارزانی هەلدەسووران، تەواوی ئەو توانایانەش کەرەستەی گرنگی دارشتنەوەی ستراتیژێکی جەماوەری ناو شارەکان بوون. پارتی دەیتوانی لە ئانو کاتدا بە ملیۆن خەلک دابەزێنێتە ناو شەقامەکانو دژی شۆڤێنیەتی ڕژێمیش ئاراستەشیان بکا، تەنانەت کاریکاتە سەر باقی ناوچەکانی عێراقیشو لەم ڕێڕەوەشەوە ڕای گشتی ناوچەکەو جیهانیش بجوڵێنێ، بەلام هیچ نەکراو دوای نائومێد بوون لە ڕێکەوتنامەی سیاسی لەگەل ڕژێم، هەمدیس پەنا بردرایەوە بەر خەباتی

چەکداری، ئاکامیش بە هەرەسی پڕ لە ئازاری مانگی ئاداری ١٩٧٥ شکایەوە
بەوشێوەیە هەڵی تاقیکردنەوەی ڕێبازێکی دیکەی جەماوەری لەپەنای خەباتی چەکداریدا بە توانایەکی زۆری دارایی‌و ئیداری‌و حیزبی‌و ڕاگەیاندن‌و دیبلۆماسی، لەناو شارو دێهاتی کوردستاندا لەکیس‌درا. هەمان تاقیکردنەوە، شۆڕشی فەلەستین، دوور لە میللەتەکەیان‌و نیشتمانەکەشیان، لەپەنای خەباتی چەکداریدا قۆزتیەوەو ڕاپەڕینی بەردەوامی بەرپاکرد. ئەگەر نەشگەنە ئامانجی سەربەخۆیی فەلەستین هیچ نەبێ ڕێکەوتنێکی سیاسی ئەوتۆ دێننەدی کە لە کارەساتی هەرەس دەربازیان بکات‌و دەردی کوردیان بەسەرنەیەت. پێشمانوایە شۆڕشی فەلەستینیش پیلانی کەمی دژ نەگێڕدراوەو هەمیشە پیلانی جیهانی دژیان هەبووە.

## ٣/٨- بەراوردێکی عەسکەری شۆڕش‌و ڕژێم

شۆڕشی ئەیلوول، لەناو عێراقدا پێچەوانەی ڕاپەڕینە چەکداریەکانی دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق کە دژی ڕژێمی پاشایەتی بەرپا دەکران، دژی ڕژێمێکی کۆماری-ناسیۆنالیستی عەرەبی هەلایسا، ئەم ڕژێمە کۆماریی ناسیۆنالیستیە وێڕای ئەوەی لەناو عەرەبی عێراقدا هەتا ڕادەیەک جێی ڕێز بوو، لە پێوەندییە عەرەبییەکانیشدا لەگەڵ زۆربەی دەوڵەتە عەرەبییەکاندا، سەرەڕای ناکۆکی جۆراوجۆریان مایەی پشتیوانی بووە، ئەمە جگە لەوەی دوای دامەزراندنی کۆماری عێراق هەوڵی یەکگرتنەوەی نەتەوەو دەوڵەتانی عەرەبی لەنێوان عێراق‌و کۆمارە عەرەبییە هاوئامانجەکانی دەوڵەتانی عەرەبی بەردەوام لە ئارادا بووە، مەسەلەی دژایەتی ئیسرائیل‌و ڕزگاری فەلەستینیش هێندەی دیکە سۆزی عەرەب‌و نەتەوەی عەرەبی لە دەوری ئەم ڕژێمە کۆمارە ناسیۆنالیستیانەی عێراق دەبزواند. هەموو ئەمانەش دوور لە گیانی دیموکراسی‌و بە ڕێبازێکی ناسیۆنالیستی پانعەرەبی پیادە دەکرا*.
ئەم ڕژێمە کۆمارییە عێراقییە لەناو چوارچێوەی زۆرانی سیاسی-عەسکەری عەرەب‌و ئیسرائیل‌دا، کێشەی عەرەب‌و فەلەستینی بەشێوەیەکی دیماگۆگیانە هەم لەناو عەرەب‌و هەم لەسایەی جەنگی سارددا سود لێوەردەگرت، هەڵبەتە هەتا دوای جەنگی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣ پشتیوانی وڵاتە عەرەبییە ناسیۆنالیستیەکانی

* تەنیا میسری سەرۆک عبدوالناسر، هەڵوێستی باشتریان بەرامبەر بە کێشەی کورد هەبووە.

لاتینەری رزگاری فەلەستین، شورەوی‌و ئەورووپای رۆژهەلات بوون. جگە لەوەی ئەم کامپە بە هەموو توانای سیاسیانەوە بوو بوونە سەپوانی پاراستنی سیاسەتی دەولەتە دیکتاتۆرەکانی وەکو عیراق، پاساوەکەشی جگە لە دژایەتی ئیسرائیل، تیژی گەشەکردنی ناسەرمایەداری بوو رەووەو سۆسیالیزمی وورده بۆرژوازیانەی دیموکراتی شۆرشگێر. لەژێر ئەم سەپوانەشدا شورەوی‌و ئەورووپای رۆژهەلات بۆ بردنەوەی (تەلەمشکینەی!) جەنگی سارد بێدرێغ رژێمەکانی وەکو عیراقیان پڕ چەکی چەکی کوشندە دەکرد، رۆژئاواش بۆئەوەی تەواو دەستبەرداری ئەم رژێمانە نەبن بەپێی حساباتی سیاسی دووریان لە چۆنیەتی مامەلەکردن لەگەل ناکۆکیەکانی جەنگی ساردو ئەنجامەکانی جەنگەکە، ئەوانیش بازاڕی چەکیان لەرووی ئەم رژێمانە دانەدەخست، بەم سیاسەتە ناکۆکەش لەنێوان زلهێزەکانی جەنگی سارددا، رژێمەکانی وەکو عیراق لە هەردوولاوە راپاندەکێشا؛ کام چەک کوشندەو کام چەک برندەو کام چەک رووخێنەر بوایە لە رۆژئاواو رۆژهەلاتی ئەم جیهانە، بەلکو لە باکورو باشوری جیهانیان بە داهاتی نەوت دەیان کڕی‌و خۆیان پێ تۆکمە دەکردو نەیارانیان پێ لەبەر چاوی رای گشتی جیهان قەلاچۆ دەکرد. لە حەفتاکاندا چەک کڕین‌و چەک فرۆشتن گەرمترین بازاڕی لە جیهاندا هەبوو. رۆژهەلاتیش باشترین فرۆشگای فرۆشتنی چەکەکان بوو، رژێمی عیراقیش لە ریزی پێشەوەی کڕیارەکاندا بانکەکانی خستبووە سەرف کردنی بێژمار.

ئەو سیاسەتانە سەرجەم، لەرووی سیاسی‌و ئابووری‌و عەسکەرییەوە، لەدوای کودەتای ١٩٦٨ی بەعسیەکان لە عیراقدا راستەوخۆ دژی کوردو بزووتنەوە رزگاریخوازەیەکەی بەکار هێناوە، چونکە لەعیراقدا جگە لە بزووتنەوەی کورد باقی بەشەکانی ئۆپۆزیسیۆن هێندە لاواز کرابوون کە ئەسلەن پێویستیان بە چەکی زۆرو چەکی کوشندە نەدەکرد.

بزووتنەوەی کوردیش، لەسەرەتای دەستپێکیەوە لە کوردستانی بەشی عیراقدا، هەمیشە گرفتی نەبوونی چەک‌و بێ پشتیوانی هەبووە، بۆیە لەبەرامبەر رژێمێکی وەکو عیراقدا، لە راپەڕینەکانی شێخ مەحموودو بارزانیەکاندا چەکی کەم‌و بێ پشتیوانی وای لە راپەڕینەکان دەکرد بەرامبەر رژێمی پاشایەتی بەو چەکە کەمانەی هەشیبوون، توانای جەنگی بەرەیی قورس نەبوو، چونکە رژێم بۆ لەشکرکێشی پەکی نەدەکەوت‌و بریتانیاش بەهانایانەوە دەچوو. تەقەمەنیش ئاسان دابیندەکرا. بەلام راپەڕینەکانی کورد تەنیا پشتی بە چەکی قاچاخچی‌و

دەستکەوت دەبەست، بەدرێژایی ڕاپەڕینەکانی کوردستان لە بەشی عێراقدا. بەڵکو سەراپای کوردستاندا (جگە لە کۆماری مەهاباد) لەلایەن هیچ وڵاتێکەوە لەڕووی عەسکەرییەوە یارمەتی نەدراوەتە کورد.

ئەم گرفتە عەسکەرییە کوشندەیە سەبارەت بە خەباتی چەکداری گەلان لە شۆڕشی ئەیلولیشدا چارەسەری نەبوو، لەکاتێکدا ڕژێمی کۆماری عێراق سوپای عێراقی دوای ١٩٥٨ هاوچەرخانە بینا کردەوەو بەرە بەرە سوپای عێراق دوای سوپای میسر، هەتا هەڵگیرساندنی شۆڕش کرابووە سوپایەکی بەهێزی خاوەن تەکتیک و تەکنیکی عەسکەری پێشخراو لەچاو سوپای پاشایەتی عێراق، تەنانەت ڕژێمی قاسم لەخۆی ڕادەبینی بەرەنگاری بریتانیاو ئێران بکاو پرکێشیشی لە داگیرکردنی کوێتیشدا دەکرد، سەرەڕاش بەهۆی شۆڤێنیەتی ڕژێم و کەڵەکە بوونی ئاستەنگە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و عەسکەرییەکانی، پارتی دیموکراتی کوردستان توانی بە ڕێبازی جەنگی پارتیزانی بەرامبەر توانای ڕژێم لەناوچە سەختەکانی کوردستاندا هەتا بەیانی ئادار درێژە بە شۆڕش بدا وێڕای دڕیەرەکی و جەنگی ناخۆو سیاسەتی دڕندانەی داگیرکەرانی کوردستان.

کە بەیانی ١١ی ئادار درا، گەوهەری شۆڤێنیتی ڕژێم نەگۆڕا. بەڵکو ئامانجە ناسیۆنالیستیەکانی بەعسیانەی باشتر گەڵاڵە کرابوون، بۆیە ئامانجی سەرەکی ڕێکەوتنامەی ئادار کۆتایی پێهێنانی بزووتنەوەی چەکداری کوردستان بوو، بەهەر نرخێک بێ هەتا بەعس بیپرژێتە سەر هەڵخراندنی(تعبئە) عێراق و عێراقیەکانی (بەکوردستانیشەوە) بۆ ئامانجە ستراتیژیە پانعەرەبیە بەعسیانەکەی. ئەودەم جگە لە ئیسرائیل، گرفتی قووڵیشیان لەگەڵ ئێراندا هەبوو، کێشەی سووریاشیان لێ ئاڵۆزا. هەڵبەتە مەترسیشیان لە تورکیا هەبوو. بۆئەوەی لە ئەمنی ستراتیژی عەرەبی و عێراقی و بەعسی دڵنیابێ، ڕژێمی عێراق لێبڕابوو کە خەباتی چەکداری کوردو کێشەی گەلەکەمان کۆتایی پێبهێنێ بۆ ئەم مەبەستەش لە پەنای بەیانی ئاداردا سەرقاڵی ترسناکترین نەخشەکانی شۆڕشی چەواشە بوو:

- بینا کردن و پاککردن و پڕچەککردنی سوپای عێراق بۆ دەسەڵاتی بەعس.
- نەهێشتنی هەموو چەشنە مەترسیەکی چەکداری لە کوردستانداو لەناوبردنی بزووتنەوە ڕزگاریخوازانەکەی.
- بەهێزکردنی ئابووری عێراق و ڕازیکردنی جەماوەری بەعس کە بەزۆری وردە بۆرژوان.

- تۆکمەکردن و پەرەپێدانی داوودەزگای سەرکوتکەرەکان.
- سەپاندنی، تەعریب، تەهجیرو تەبعیس.
- بێ بایەخ کردنی پایەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق و کوردستان.
- فراوانکردنی پێوەندی دیپلۆماسی و سیاسی و ئابوری رژێم لەگەڵ چواردەوری وڵاتانی جیهان.

ئەوانە پێنجینە گرنگەکانی سیاسەتی بەعسی بوون کە بەشێکی ئەو پێنجانە پێوەندیان بە بەرنامەی لایەنی دووری ئامانجەکانی بەعسەوە هەبوو، بەشێکی دیکەیش بە بەرنامەی لایەنی کەمی ئامانجەکانی بەعس، زۆری بەرنامەی لایەنی کەمی ئامانجەکانی پێوەندی بە کوردو کوردستانەوە هەبوو، هەر بۆیە لەپاش ڕاگەیاندنی بەیانی ئادارەوە بێ پەروا فشاری تەعریب و تەبعیس و تەهجیرو تیرۆرو تەخشە عەسکەریەکان پەرەیان دەدرایە، تەواوی ئەو ڕاستیانەش سەلمێنەری شۆڤینیەتی رژێم و بەفێڵ ڕاگەیاندنی بەیانی ئادارن.

دوو دیاردە کە ڕاستەوخۆ دژی کوردو شۆڕشەکەی بوون لە دوای بەیانی ئادارەوە مەترسیەکی ترسناکیان لەسەر بوونی کوردو کێشەکەی و شۆڕشەکەی دروستکردبوو، ئەوانیش:

١- تەعریب و تەهجیرو تەبعیس.
٢- چەکدارکردنی سوپاو زیادکردنی چادەیان لە کوردستاندا.

سەبارەت بە دیاردەی یەکەم (تەعریب و تەهجیرو تەبعیس) جگە لە چارەنووسی شۆڕش، بوونی نەتەوایەتیش دەخاتە مەترسیەوە. جا سیاسەتێک بوونی گەلێک بخاتە مەترسیەوە، هەڵبەتە زیانی ڕاستەوخۆ بۆ خەباتی چەکداری گەلەکەش هەیە، بۆ نموونە: ئەو ناوچانەی دوای دیاریکردنی ئامانجی تەعریب و تەهجیرو تەبعیس لە کوردستاندا کە ساڵی ١٩٧٤ بە (ناوچەی ئۆتۆنۆمی!) ڕەوا بینراوە، سەرجەم لە پارێزگای هەولێرو سلێمانی و دهۆکدا (٣٤٧، ٢٦ کیلۆمەتری دووجا)، لەکاتێکدا کوردستانی بەشی عێراق تێکڕایی ڕووپێوی زەویەکەی (... ، ٨٦ کیلۆمەتری دووجایە) بەسەریەکەوە، بەزۆری لە زەمانی بەعسدا ٤١ ، ٤٩٪ی خاکی کوردستانی بەشی عێراق تەعریب کراوە ‹٣٣›.

---

‹٣٣› چیاتەمنی ستراتیژی عیراقی سێ کوچکەی بەعسیان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس. کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، زنجیرەی لێکۆڵینەوە (٣)، ل:٢٨٤.

ئەم سیاسەتە سۆڤێنییە ترسناکە، جگە لە تەسککردنی ڕووپێوی خاکی کوردستان و دوورخستنەوەی سەدان هەزار کورد بۆ خواروو کە هەر هەمووی ڕاستەوخۆ کارایی نالەباری دیموگرافی و جوگرافی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و تەنانەت سایکۆلۆژیشیان هەیە بۆسەر شۆڕشی چەکداری، لەڕووی عەسکەریشەوە لەلایەکەوە توانای کۆکردنەوەو چەکدارکردنی پێشمەرگە کەم دەکاتەوەو بواری هێزی بەردەوام تەسک دەبێ، لەلایەکی دیکەشەوە بۆ بڵاوکردن و قایمکردنی لەشکرو لەشکرکێشی و پاراستنی دەوروبەری پێگەو کامپە گەورەو ناوەنجیی و دەبۆکانی ڕژێمیش سودێکی کاریگەری هەیە، چونکە هەتا ناوچەکانی کوردستان کۆنترۆڵ بکرێن، ئۆردوگا عەسکەری و دەبۆکانی تەقەمەنیش لە شەڕگەو شوێنەکانی پێشمەرگە نزیک دەخرێنەوە، نزیک خستنەوەو مۆڵدانی عەسکەرێکی زۆرو دەبۆی تەقەمەنی لەڕووی لۆجستیکی شەڕەوە بۆ نیشتمانێکی شاخاوی و پڕ لە دۆڵ و دەربەندو هەڵەتی وەکو کوردستان کە هەمووشی بۆ شەڕو شەرگەی پێشمەرگانە لەبارن، لە زانستی جەنگ و جەنگینی سوپایەکی میکانیزمەکراوی خۆشەکراو بە ئالیاتی جەنگ، زۆر گرنگە بۆ شۆڕشی چەواشە. هەڵبەتە کەمدەسردەبیشە، تایبەت شۆڕشی کوردستان بەهۆی نەبوونی پشتیوانی ستراتیژی کێشەیەوە چەکی قورسی دوورهاوێژیشی نییە هەتا مەترسی لەسەر ئۆردوگاو دەبۆکان پەیدا بکا. دووەمیشیان، چەکدارکردنی سوپاو زایدکردنی جادەویان لە کوردستاندا، ئەم دیاردەیەش لە ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤دا بەشێوەیەکی زەق دژی شۆڕشی کوردشتان ڕژێم بە داهات و دراوێکی زۆر سەرقاڵی بوو بۆ جادەویانەکە. جگە لە کوردستان، زۆربەی مەترسیەکانی ڕژێم لە ئێران و تورکیاو سوریا، دەکەوێتەسەر خاکی کوردستان، بۆیە زۆربەی ڕێگا ستراتیژیە عەسکەری و ئابووریەکانی ڕژێمی عێراق بەرامبەر سوریاو تورکیا دەکەونە سنووری موسڵ ـ هەولێر لە پارێزگای سلێمانیشدا بایەخی گرنگی هەیەو لە بەرامبەر کرماشان، سنە، سەقز، بانە، سەردەشتدا ڕێگای عەسکەری لێدراوە، ئەمە جگە لە ناوچەکانی خانەقین و مەندەلی و بەدرەو خوارەوەش کە هەر هەموو ڕێگای ستراتیژین بۆ پاراستنی بەغدا. جگە لەو ڕێگایانە، ڕێگای دیکە دژی بزووتنەوەی کورد لە سەراپای کوردستاندا تەختکراوون و بە سانایی کاروانی عەسکەری دەتوانن لەچوار وەرزی ساڵدا بۆ کوێستان و گەرمیانی کوردستان، بۆ هەموو ناوچەکانی بجولێن لەکاتێکدا لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلوولدا وا نەبووە،

ڕێگاوبان کەمبوون‌و بەزۆری لە کوردستاندا قیرتاو نەکرابوون کە تەنیا هاوینەو سەرەتای پاییز دەکرا هاتوچووی ئاسانی تێدا بکرێ، کورتیەکەی ڕووپێوی خاکی عێراق (٤٤٦ . ٣٤٨کیلۆمەتری دووجایە) کەچی ڕێگای قیرتاوکراوی سالانی ١٩٧٤-١٩٧٥، (٩٢٤ . ) کیلۆمەتری دووجایە. هی قیرتاو نەکراویش (٢١٧٧) کیلۆمەتری دووجا بووە. ئەگەر ئەمە لەگەلْ ڕێگای ولاتێکی وەکو سعودیە بەراورد بکەین کە ڕووپێوی خاکی (١٧٦ . . . . ) کیلۆمەتری دووجایە واتە نزیکەی پێنج بەقەد عێراقە، کەچی سالانی ١٩٧٤-١٩٧٥ ڕێگاکانی سەرجەم (٨٧٥٩) کیلۆمەتری دووجایە. واتە نزیکەی یەک لەسەر سێی عێراق جادەی هەبووە. سعودیە لە عێراقیش دەولەمەندترە.

بۆ پڕچەک‌کردنی سوپاش، ئەم نەخشەیەی خوارەوە لەگەلْ هەندێک ئاماری چەکە هەمەچەشنەکانی مەترسی بالادەستێتی عەسکەری ڕژێم بەسەر توانای بەرەنگاری چەکداری گەلەکەمان دەردەخەن کە دەبوو شۆڕش‌و دەزگای پاراستنی پارتی‌و مەکتەبی عەسکەری حسابێکی عەسکەری-لۆجیستیکی گەورەیان بۆ بکردایە، بەلام نەکرا.

خشتەی ژمارە: ٧

نیشانەکانی مەسروفاتی عەسکەری

| شمەک | پێودانگ | ٩٧٣ | ٩٧٤ | ٩٧٥ | ٩٧٩ | ٩٨٠ | ڕێژەی٪ سالانە ٧٥-٨٠ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مەسرەفی سالانەی عەسکەری | ١دۆلار* | ١٢١٢ | ١٥٦٦ | ١٦١٤ | ٢٧٧٥ | ٢٠٠٠ | ٨٥.٩ |
| هاوردەی سالانەی عەسکەری | ١دۆلار* | ٦٢٥ | ٦٢٥ | ٦٧٥ | ٢١٠٠ | ٢٢٧٠ | ٢٣٦.٣ |
| ژمارەی هێزە چەکدارەکان | هەزار پیاو | ١.٥ | ١.٥ | ١١٠ | ١٥٥ | ٣٨٤ | **٢٤٩.١** |
| پشکی ناوەنجی عەسکەریەک | دینار | ٣٨٠٠ | ٥٠٠٠ | ٤٩٠٠ | ٦٠٠٠ | ٢٦٠٠ | |
| پشکی ناوەنجی هاولاتی لە داهاتی نەتەوە | دینار | ١٣٠ | ٢٧٠ | ٣٢٠ | ٨٣٠ | ١١٦٠ | |

* ١ ملیۆن دۆلار

بەپێی ئەو خشتەیە، لەساڵی ١٩٧٣وە کە ئیتر نێوان ڕژێمو شۆڕش دەتاڵۆزاو دیاردەکانی شەڕ بوونەوە دەردەکەوتن، مەسروفاتی ساڵانەی عەسکەری دوو ملیاردو حەوت سەدو هەشت هەزار دۆلار بووەو هاوردەی عەسکەریش ملیاردێکو سێ سەدو پەنجا هەزار دۆلار بووە، هەر لەو دووساڵەدا، ساڵی ١٩٧٣ پشکی ناوەنجی عەسکەری ساڵانە سێ هەزارو شەش سەدو حەفتا دینار زۆرتر بووە لە هاوڵاتی مەدەنی. ساڵی ١٩٧٤یش چوار هەزارو حەوت سەدو سی دینار زیاتر بووە.

ئەو بودجە عەسکەرییە ئەگەر لەسەر چۆنیەتی زیادکردنی چەکی عێراق بیخەینە ڕێژەی ئەژمارەوە، توانای چەکی هەمەچەشنەی عێراق وای لێدێ کەوا تەرازووی هێزی عەسکەری نێوان شۆڕشو ڕژێمدا بەجارێک لاسەنگو لار ببێ. بۆ نموونە، ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥، عێراق (٥٤٦) فڕۆکە، (١١١) کۆپتەر، (١٦٠٠) تانک، (٩٠٠) تۆپی قورس، (١٥٠٠) نەفەربەری هەبووە.

ئەو نابەرامبەرییەی نێوان ساڵی کۆتایی شۆڕشی ئەیلوولو ڕژێمدا لە ڕووی عەسکەری، بەشەری، پێوەندی جیهانیو دیبلۆماسیو توانای داهاتو داراییەوە گەلێک ترسناک بووەو دەبوو ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٤ سەرکردایەتی شۆڕش حسابی هەمەلایەنەی بە ئەژمار بۆ هەموو جیاوازییەکان بکردایە، لێکیان بدەنەوەو لەگەڵ توانای شۆڕشو پارتیو گەلەکەماندا لەهەموو بارێکەوە بەراوردی بابەتیانەی بکەن ئینجا بڕیاری بەرەنگاری چەکدارانە بدەنەوە.

لە ساڵی شەڕبوونەوەدا، تاقە پشتو پەنای شۆڕش ئێران بوو، لەڕێی ئێرانیشەوە، ئەمریکا. ئەمریکاو ئێرانیش لەناو چوارچێوەی چۆنیەتی دابینکردنی بەرژەوەندیەکانیان لە ڕۆژهەلاتو کەنداودا لە گەرمەی جەنگی ساردا دەسووڕانەوە، ئەمە جگە لەوەی ئێران ڕژێمێکی پانپارسی شۆڤێنی بوو بەرامبەر کوردو هەرگیز لایەنگری مافە سیاسیەکانی نەتەوەی کورد نەبوو چونکە ترسی کوردستانی بەشی ئێرانی هەبوو.

---

** ↔

١- ڕاپۆرتی ئەنستیتۆی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی ساڵی ١٩٨٠ (لندن) ل:٥٦ ژ:٨.

٢- دەزگای ناوەندی سەرژمێری (حساباتی نەتەوەیی) نامیلکەی سەرژمێری باخەڵ ١٩٨٢،ل:٤٥.

یەک ساڵی ڕەبەق لەشەڕی سەخت ئەگەر پشتیوانییەکەی ئێرانو ئەمریکا لەڕووی ئیدارییەوە لە ئۆردوگاکانی ئێرانو سەر سنوورەکاندا یارمەتی شۆڕشیان باش دابێ، ئەوا لەڕووی سیاسیو عەسکەرییەوە کێشەی گەلەکەمانیان ناهوود کرد، لەبەرامبەر ئەو هەموو توانا عەسکەرییەی عێراقو ئەو هەموو هێرشە ستراتیژیانەی دەکرانە سەر ناوچە ئازادکراوەکان، ئێرانو ئەمریکا تەنیا چەکی تەکتیکی عەسکەرییان دەخستە مەیدانەوە، ئێستاش چەکی ئەوتۆیان نەدایە شۆڕش کە بتوانێ بنکە ئابووریو ئۆردوگا عەسکەرییە گەورەو گرانەکانی بۆردوومان بکا، شۆڕشیان لە ڕووی عەسکەرییەوە خستە سەنگەری بەرگری نیگەتیفی جەنگێکی بەرەیی فراوانەوە، ئەم جۆرە جەنگە بەرەییە فراوانەش بۆ بزووتنەوەیەکی چەکدار کە لەسەر زەمینێکی جوگرافی تەسکو لەناو میللەتێکی کەمتر لە نەتەوەی سەردەستە، بەپشتیوانیەکی لاوازو بە مەشقو سازدانی عەسکەری دواکەوتوانەوە، ترسێکی ستراتیژی ڕووخێنەرە.

لەڕووی سیاسیشەوە، بە ڕەسمی کێشەی کورد لە داوودەزگا نێودەوڵەتیەکاندا باس نەدەکراو تاوانەکانی ڕژێم ڕیسوا نەدەکران. ڕژێمیش بە چەکی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو لەژێر سەیوانی سیاسەتی جەنگی سارددا، هەرچی توانای عەسکەریو سیاسیو سایکۆلۆژی هەبوو خستیە مەیدانەکانی جەنگەوە، پێشکەوتووترین کەرەسەی جەنگو جەنگینی هەبوو:

- فڕۆکەکانی کوشندە، بەڵام دژە فڕۆکەکان لاوازو زۆر کەم.
- تانکەکانی کاریگەری تازە، بەڵام دژەکانی کەمو لەناوچەیەکی کەمیشدا ڕێگای بەکارهێنانیان دەدران.
- تۆپو تۆپخانەی پێشخراو، بە بەرپەرچدانەوەیەکی کەمی دیاریکراو، ئەویش بەزۆری لە سەرکردایەتی شۆڕشو قۆڵی ڕەواندوزدا هەبوو.

ئەو سەنگەرو لاریەی عەسکەری، وایکرد لە زۆربەی جەنگە بەرەییەکاندا ڕژێم بەو چەکە قورسانەوە سەردەکەوتو تەنانەت سەرشاخە سەختەکانی گەلی عەلی بەگو سەرتیزو حەسەن بەگُو کورەکو هەندرێن... کەوتنە دەست ڕژێم کە بە درێژایی ڕاپەڕینە چەکداریەکانی کوردستان ڕژێمەکان نەیا نەدەتوانی ئەو شاخانە داگیر بکەن. داگیرکردنی ئەو شاخانەش ڕاستەوخۆ مەترسی خستەسەر سەرکردایەتیو داوودەزگا گەورەو کاریگەرەکانی شۆڕش، هەروا کاری وورەییو سیاسیو عەسکەریشی کردە سەرپێشمەرگە لە کوردستاندا.

## ٨/٤- پێوەندییەکانی پارتیو هەرەس

سەرەڕای ئەو جیاوازییە عەسکەرییەو چەکە کوشندانەی ڕژێم، سەرەڕای سەدان کەمو کوڕی گەورەو گچکەی چینایەتیو کۆمەڵایەتیو سیاسیو عەسکەری ناهەموار دەرهەق زەحمەتکێشان، سەرەڕای ئەوەی تاکتیکی شۆڕش لەشەڕو شەڕگەکاندا، لە جەنگی پارتیزانیو جەنگی بزۆزو جەنگی بەرەییو بەرگری ستراتیژیدا، لەئاستی قورسایی جەنگەکەو توانای عەسکەریو مەشقی سوپاو تەکنۆلۆژیای جەنگیی ڕژێمی عێراقدا نەبووە، سەرەڕای هەموو ئەوانە بەهۆی قارەمانێتی جەماوەرو پێشمەرگەوە، سەرکردایەتی پارتی لەناو خاکی کوردستاندا بەرگەی گرتو بەرگری دەکرد کە پێمانوایە ئەو بەرگە گرتنو بەرگرییە ئەگەر بەپێی پرنسیپەکانی زانستی جەنگی پارتیزانی خوڵقێنەرانە لە کوردستاندا بکرابان، لەماوەی ئەو ساڵەدا ئاکامێکی عەسکەریو سیاسی باشی دەبوو، بەڵام وەکو واش نەکرا، لەو ساڵەدا ڕژێم بەو هەموو باڵادەستییەی بەسەر شۆڕشدا ئینجا نەیتوانی نەخشە ستراتیژیەکانی لە بەزاندنی پێشمەرگە بهێنێتەدی، بەڵکو خۆی وەکو بازنە داخراوەکەی جەنگی نێوان ڕژێمو کورد: شەڕپوونەوەو سەرنەکەوتنی ستراتیژی هیچ لایەک لەشەڕدا، گەیشتە ئەنجامی ئەوەی شۆڕشی پێ بە توانای عەسکەری لەناو ناچێ، بەڵام ئەمجارەیان وەکو جاران بڕیاری نەدا کە دەرگای مفاوەزات بکاتەوە بەڵکو لەسەر ئەو بنچینەی بەهەر نرخێک بێ دەبێ شۆڕش لەناوبەرێ، بڕیاری گەورەترین سازشی لەگەڵ ڕژێمی ئێراندا تەنیا بەمەبەستی سەپاندنی مەرامە شۆڤێنییەکانی، ئیدی دەستیان لە تەواوی لافەکانیان لە کەنداوو زێی عەرەبدا بۆ ڕژێمی شا هەڵگرتو ڕێکەوتنامەی شومی ٦ی ئاداری جەزائیریان مۆرکرد.

ئەو ڕێکەوتنامەیەی سەدام لەگەڵ شادا مۆری کرد تەنانەت ڕژێمە نۆکەرەکانی ئینگلیز کاری وایان نەکردبوو. ئەمەش باشترین بەڵگەی هەتا مۆخ شۆڤێنیەتی ڕژێمە بەرامبەر بە کورد، ڕیسوایی بەرامبەر ڕژێمی شا لە مێژوودا هەڵدەبژێردرێ بەمەرجێ بتوانێ خەباتی ڕەوای گەلی کورد لەناو بەرێ!

بەپێی ڕێکەوتنامەی جەزائیر، ئێرانو ئەمریکا لە پشتیوانی کردنی پارتی دەبوو دەست بکێشنەوە، ئەم دەستکێشانەوەیە جگە لەوەی گەورەترین پەیمان شکاندنی مێژوویی بوو بەرامبەر گەلەکەمان بەگشتیو سەرکردایەتی پارتیو بارزانی بەتایبەتی، باشترین بەڵگەشە کە لە گەرمەی جەنگی سارددا، ئەمریکاو

هاوپەیمانەکانی بە هەموو نرخێکی عەسکەریو سیاسیو ئابووری، تەنانەت بە
گەورەترین غەدری مێژوویش لە میللەتێکی ژێردەستەش، هەڵپەیان بووە،
بەرژەوەندیەکانیان بسەپێنن.

لەسەرەتای جەنگی ساردا، شورەوی کۆماری مەهابادی کردە قوربانی
پاراستنو سەپاندنی کامپەکەی، ئەوەتانێ لە گەرمەی جەنگی ساردیشدا ئەمریکا
شۆڕشی ئەیلوولی فرۆشت. لە کۆتایی جەنگی ساردیشدا گەلەکەمان کیمیابارانی
چەکە کوشندەکانی رۆژهەلاتی(سۆسیالیست!) و رۆژئاوای (مرۆڤدۆست!!) کرا.

ئەم غەدر لێکردنەی کورد، تێکشکانی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر کورد کەوت.
بۆئەوەی لەگەڵ مێژوودا ئەمانەتی مێژوویی بەکاربهێندرێ، واچاکە ئەم غەدرە
گەورەیە لەبەر رۆشنایی سیاسەتی ئێستاو پێوەندی ئێستای بزووتنەوەی کورد بە
رۆژئاواوە، لەبوونی هێزەکانی هاوپەیمان بە پێشەنگی ئەمریکا لەسەر سنووری
کوردستان، لەناو کوردستاندا تاو توێیەکی نهێ، دوای روونبوونەوەی تەمومژی
رابردوو بکەین.

لەسایەی جەنگی سارد دا هەر دوو کامپی زلهێزەکان کرابوونە پێوانەی دوو
چەشن پێوەندی ناکۆک بۆ بزووتنەوە سیاسیو چەکداریەکان، تەنانەت بۆ
دەوڵەتەکانیش، هەموو جۆرە پێوەندی پێوەکردنو دۆستایەتیەکی بە
پێشکەوتنخوازو دیموکراسیانە لەقەڵەم دەدرا، بە پێچەوانەشەوە، پێوەندی لەگەڵ
ئەمریکاو رۆژئاوا بە کۆنەپەرستی دەزاندرا. زیاتریش ئەم پێوانەیە بۆ حیزبە
سیاسیو شۆڕشە چەکداریەکان بەکار دەهات، لەکاتێکدا حیزبو شۆڕشە چەکدارە
ئۆپۆزسیۆنەکان پتر پێویستیان بە یارمەتی هەبوو نەک دەوڵەتان، یان هیچ نەبێ
لە دەوڵەتەکان پتر پێویستیان بە یارمەتی هەبوو. کەچی پێوەندی ئابووریو
سیاسیو دیبلۆماسی دەوڵەتان بە رۆژئاواوە لەلایەن شورەویو هێزەکانی سەربە
شورەوی بە ئاسایی دەزاندراو هاوکاتی ئەو پێوەندیانەی دەوڵەتان بە رۆژئاواوە،
شورەویشو حیزبە شورەوی پێرەوەکانیش پێوەندی پتەویان بەو دەوڵەتانەوە
دەبەست هەتا رادەی (بەرەی نیشتمانی)یش لەگەڵیاندا، بەلام بزووتنەوە
چەکداریەکان کە رۆژانە بۆردومان دەکرانو خاکیان وێران دەکرا تاوان بوو هیچ
چەشنە پێوەندیەکیان بەو دەوڵەتانەوە هەبێ، لەم پێودانگەوە، پێوەندی پارتیو
بارزانی بە ئێرانو ئەمریکاوە بە خیانەتی نەتەوایەتیو نیشتمانی لەقەڵەم دەدراو
هەتا رادەی شەڕی چەکداریش دژایەتی دەکرا. ئێستاش کە جەنگی سارد

نەماوەو پێوەندیو پێودانگەکان گۆڕاون، هەق وایە لە ڕوانگەیەکی دیکەوە، دوور لە گۆشەگیری تیۆریو سیاسەتی ڕقەبەرایەتی، ڕاستیەکان هەڵسەنگێندرێنەوە. چونکە ڕاستیەکان خۆیان دەرکەوتوونو بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی بەشی عێراقدا گەرمتر پێوەندی بە ڕۆژئاواوە هەیە. ئێستا جیاوازی بۆچوون لەناو هێزە بالادەستو دیارەکاندا لەسەر بنچینەی پێوەندی دیبلۆماسیو سیاسیو عەسکەریو ئیداریش بە ڕۆژئاواو ئەمریکا نەماوە. هەڵبەتە پێشتر توندیش بوو. هەڵوێستەکانی جارانو ئێستا زۆر ناکۆکن، زیانەکانی ئەم ناکۆکیانە لەناو بزووتنەوەی کوردو ڕاپەڕیندا وەنەبێ برابێتەوە، نەخێر، ئێستاش پاشماوەکانی ئەو ناکۆکیانەو سەرئەنجامە سیاسیو عەسکەریو ئایدیۆلۆژیەکانی، ڕۆژانە بە فلاش باکی (گەڕانەوە بۆ ڕابردوو) ململانێی حیزبیو سیاسیو شەخسیەکانی ناو خەبات بەشێنەیی زامی برینەکانی ڕابردوو دەکولێننەوەو ئەو ژانەش بەشێکن لە هەوێنی هەڵوێستە ناکۆکەکانی ئێستا. بۆیە دەبێ مێژووی سیاسەتی شۆڕشی ئەیلوولو هەرەسەکە: پێوەندیەکانیو کارەساتەکەی، سەرلەنوێ دوور لە ڕقەبەرایەتی حیزبایەتی لەبەر ڕۆشنایی دیاردەکانی ئێستا هەڵسەنگێندرێنەوەو هەموو ڕووداوەکانی ڕابردووش هەموو سیاسەتو بڕیارو پێوەندیەکانی ڕابردوو، تاوتوێی بابەتیانە بکرێنەوەو ڕاستیەکان وەکو هەن بخرێنە قۆناغە مێژووییەکانی خۆیان.

لەم بەشە نووسینەدا، تەنیا ئەوەمان لا مەبەستە ڕۆشنی بکەینەوە کەوا هەلومەرجی سیاسیو عەسکەری لە کوردستانو ناوچەکەدا وای پێویست دەکرد لەدوای بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ دەبوو بە قووڵی بیر لەوە بکرێتەوە خەباتی چەکداری بە ڕێبازی نەگۆڕی ڕزگاری کورد نەمێنێتەوەو هەوڵی لێبڕاو بۆ گۆڕینی قورسایی خەباتەکە لە شاخەوە بۆ شاران درابا، چونکە جگە لە ئاڵوگۆڕی کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسی، خەباتی چەکداریش لەوە زیاتری پێنەدەهاتەدی کە لە بەیانی ئاداردا هێندرایەدی. بەتایبەت ستراتیژی پارتی دیموکراسی بۆ عێراقو ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بوو، بۆ گۆڕینی ئەم ستراتیژەش هەلومەرجی جیهانیو ناوچەییو خەباتی نەتەوایەتی کوردیش لەسەراپای کوردستانی گەورەدا بۆ پارتی لەبار نەبوو، ئەو پێوەندییە سیاسیو عەسکەرییەی شۆڕشی ئەیلوولیش بە ئێرانو ئەمریکاوە، بڕیو مەمر بوونەک پشتیوانی ستراتیژی شۆڕش توانای کەم بێ، کوردستان بەرتەسک کرابێ، ڕژێمە دوژمنەکەی بەهێزتر کرابێ، داهاتو توانای زیاتر بووبێ، پشتیوانی ستراتیژی هەتا سەرکەوتنی بەڕێکەوتنامەی کۆنکرێت مۆر

نەکردبێ، لەناو عێراقدا دیاردەکانی دۆخی شۆڕشگێڕانە نەخەملیبێ، ئیدی شۆڕش کردنەوەی چەکداری چی دەگەیەنێ؟

بۆ ئەوەی ئەم ڕاستیانەش سەبارەت بە باسەکەمان بە بەلگەوە بێ، واچاکە لە بەلگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکاوە چارەنووسی ئەو پێوەندییەو یارمەتیەکانی پێوەندیەکە بخەینە ئارا، چونکە قسە لەسەر پێوەندیەکان زۆرن، بەلام ڕاستیەکان وەکو بەلگەنامەکان ڕۆشن نین، هەتا ئێستاش لێکۆلینەوەیەکی قول لەسەر پێوەندیەکە نەنووسراوە بەلکو زۆربە ی پێوەندیەکە بەنهێنی ماوەتەوە. ئەوەی لێرەدا مەبەستە ئەمەیە کەوا سالی ١٩٧٦ کۆمیتەیەک بۆ لێکۆلینەوە لە چالاکییە نهێنییەکانی دەزگای موخابەراتی ئەمریکی بە سەرۆکایەتی (ئۆتیس پایک) دامەزراو ڕاپۆرتی کۆمیتەکە بەناوی سەرۆکەکەی ناوبانگی بلاوکرایەوە. لەبەرئەوەی دەولەتی ئەمریکا غەدرێکی گەورەی لە بزووتنەوەی کورد کردبوو بۆیە بەهیچ چەشنێ نەیاندەویست ڕاپۆرتەکە بلاوبکرێتەوە، سەرەڕاش، ڕاپۆرتەکە دزەی پێکراوەو لە ڕۆژنامەیەکی ئۆپۆزسیۆني جووتیاراندا کە لە دێی (جرنیش)ی نزیک نیویۆرک بەناوی (دەنگی لادێ) دەردەچێ بلاوکرایەوە، بەلام دەستبەجێ دەزگای ئەمنیەتی ئەمریکا ئەو ژمارەیەیان کۆکردەوەو ڕۆژنامەنووکەشیان دایە دادگا. ئەو بەشەی پێوەندی بە کوردەوە هەیە بەناوی (حالەتی ژمارە:٢ یارمەتی چەک)وەیە.

ڕاپۆرتەکە ساغی کردۆتەوە کەوا لەمانگی ئابی ١٩٧١ (مەلا مستەفای بارزانی) پێوەندی بە سەرکردایەتی موخابەراتی ناوەندی ئەمریکیەوە لەتاران کردووەو داوای کۆمەکی دژی عێراق کردووە، ئەم نامەیە وەلامی نەبووە، لە ئاداری سالی ١٩٧٢دا دیسان داواکە دووبات کراوەتەوە، ئەمجارەیان هەردوو نامەکە ئاراستەی (کۆمیتەی چلی) کراوە کە سەرپەرشتی سەرجەم چالاکییە نهێنییەکانی موخابەراتی ئەمریکا دەکا. ئەوساش کیسینجەر سەرۆکایەتی دەکرد. زانیارییەکە لە ڕاپۆرتی (ئوتیس پایک)دا دوای لێکۆلینەوە ئەوا گەلالە کراوە: (ئەو بەلگانەی لای کۆمیتەکە کۆکراونەتەوە دیسەلمێنن کەوا بڕیارەکە لەپلەی یەکەمدا وەکو دلنەوایی ئێرانی هاوپەیمان دراوە کە دلسۆزانە هاوکاری دەکردین و پێشیان‌وایە لە عێراقی دراوسێیانەوە مەترسی هەڕەشەیان لێدەکا. دوژمنایەتی نێوان هەردووولاش دێرینەیە، لەبنەڕەتیشدا جیاوازییەکانیان ڕێبازی عەقیدەیی نییە بەلام لەهەمان کاتدا پێوەندی بە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە هەیە

.(<٣٤>)

ئەم بەڵگەیە کە کۆمیتەی تایبەتی لێکۆڵینەوەی چالاکیە نهێنیەکانی موخابەراتی ناوەندی ئەمریکی دوای لێکۆڵینەوە بڵاوی کردۆتەوە مایەی لێکۆڵینەوەی سیاسیانەیە هەتا بەرئەنجامی باشیان لێ هەڵبهێنجیندرێ:

١- راپۆرتەکە دوورو نزیک، باش‌و خراپ، راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ئاماژەیان بۆ خۆفرۆشتن یان بەکرێگیراوی یاخود بە دەسیسەو دەسیسەبازی موخابەراتی ئەمریکی‌و پارتی‌و بارزانی ناکا.

٢- بارزانی خۆی داوای یارمەتی کردووە نەک موخابەراتی ئەمریکی پێشتر نەخشەی بۆ بارزانی‌و شۆڕشەکە کێشابێ.

٣- کاتێک بارزانی داوای یارمەتیەکەی کردووە کە جارێ عێراق نەوتی خۆماڵی* نەکردبوو، هەتا بگوترێ پێوەندیەکە بۆ دژایەتی خۆماڵی کردنەکە بە دەسیسەی بێگانە کراوە. قسەش لە جەنگی تشرینی ساڵی ١٩٧٣ لەنێوان عەرەب‌و ئیسرائیلدا ئەوکات نەبووە هەتا بە جەنگیشەوە ببەسترێ.

ئەوە سەبارەت بە گەوهەری پێوەندی پارتی‌و بارزانی‌و ئەمریکا، دەمێنێتەوە سەر ئەوەی ئەمریکاو ئێران بەچ نیازێک‌و لەپێناوی چیدا بڕیاری یارمەتی شۆڕشی کوردیان داوە؟ داخۆ لەپێناوی دیموکراسی‌و نەهێشتنی زوڵم‌و زۆر، یان بەمەبەستی دابینکردنی بەرژەوەندی خۆیان؟ سیاسەتی ئەمریکا دژی ڤێتنام‌و لاوس‌و کەمبۆج لەوکاتەدا کە بڕیاری کۆمەکی کوردیان داوە وەڵامی ئەو پرسیارانەی داوەتەوە کە ئەمریکا بۆچی هاتۆتە مەیدان. خۆشیان لە راپۆرتەکەدا دەڵێن: «ئامانجی وڵاتە یەکگرتووەکان لە یارمەتیدانی کورد بۆئەوە نەبووە بتوانن سەربکەون‌و تەنانەت مافی ئۆتۆنۆمی سەربەخۆش وەربگرن، کورد لەعێراقدا مافی وا وەربگرن بۆی هەیە کاریکاتەسەر کوردەکانی ئێرانیش، ئەمە کێشە بۆ شا دروست دەکا» هەروا دەویسترا رادەی یارمەتیدانی مەلا مستەفا تۆزکمە راپگیرێ کە هەردەم لە ئاستێکی دیاریکراودا وەمێنێ: لە ئاستێکی ئەوتۆدا بتوانێ سوپای عێراق داوەشێنێ‌و چەک‌و سەرکردایەتی‌و هێزەکەی شەکەت بکا، لەهەمان کاتدا لەئاستێکدا بێ نەتوانێ وا سەربکەوێ کە سەربەخۆیی دابین بکاو کاربکاتە سەر کوردی ئێران <٣٥>.

---

* نەوت لە ١٦ی تەمووزی ١٩٧٢ خۆماڵی بەعسیانە کرا

ئەم دەقەش دیڕ بەدیڕی سەلمینەری ئەو ڕاستیەن کەوا ئەمریکاو ئێران بەپێی پیلان هاتوونەتە پێش‌و تەنیا بەرژەوەندی خۆیان لەبەر چاوان بووەو بەس. هەر لەبەرئەوەی سەرکردایەتی شۆڕشیش بەکرێگیراویان نەبووە بۆیە بەڕادەیەکی ئەوتۆ یارمەتیان داوە کە سەرکەوتنی گەورە وەدەست نەهێنێ نەکا کار بکاتە سەر کوردی ئێرانیش. ئەگەر وانەبا واتە ئەگەر سەرکردایەتی بارزانی خۆی بە ئەمریکاو ئێران فرۆشتبا، بێگومان ئەوحەلە بێدرێغ وەکو بزووتنەوە بەکرێگیراوەکان یارمەتیان دەداو لەوەش نەدەترسان کە سەرکەوتنی گەورە وەدەست بهێنێ. چونکە بزووتنەوەو سەرکردایەتی بەکرێگیراو بە ویستی خۆی ناجوڵێ. هەر سەرکەوتنێکیش وەدەست بهێنێ هیچ چەشنە مەترسیەک لەسەر ئاغاکانی پەیدا نەکا.

دواهەشی ڕاپۆرتەکە ڕاستیەکی مێژوویی، یان با بڵێین دانپێدانانێکی غەدر لێکردنە گەورەکەی تێدایە کە ئەمریکا لە کوردی کردووە، بە ڕاشکاوی دەڵێن: «سیاسەتێکی بێ ڕەوشتانەمان بەرامبەر کورد هەبووە، نە یارمەتیمان‌دان‌و نەلێشیان گەڕاین کێشەکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا چارەسەر بکەن هانماندان‌و پاشان وازمان لێهێنان» ‹٣٦›.

ئەم بەشە ڕاپۆرتە کە ئۆبالی غەدر لێکردنی ئەمریکا لە کورد دیاری دەکاو کۆمیتەیەکی بەرزی لێکۆڵینەوەی زلهێزێکی جیهان بە سیاسەتی خۆیان بڵێ (بێ ڕەوشتانە) ئیدی هیچی لەسەر ئەمریکا بۆ کورد نەهێشتۆتەوە پێیان بڵێ* ئەوەی ماوەتەوە پێوەندی بە پارتی‌و سەرکردایەتی پارتیەوە هەیە کە سەبارەت بەو پێوەندییە هێندەی پێوەندییەکە پێوەندی بە ناوەڕۆکی باسەکەی ئێمەوە هەیە، چی بگوترێ. ئەمریکا دەڵێ: (بێ ڕەوشت بووین). ئەدی کورد بەخۆی دەڵێ چی؟

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە پەلوپۆی زۆرن‌و پێویستە مێژوونووسان لە ئایندەدا بتوانن تەواوی ڕاستیەکان ڕۆشن بکەنەوە، بەڵام دەشێ لێرەدا بگوترێ کەوا:

---

‹٣٤ . ٣٥ . ٣٦› هيكل، محمد حسنين. الحل و الحرب، شركة مطبوعات للتوزيع و النشر، بيروت - لبنان، الطبعة الاولى ١٩٧٧، ص: ١٣٨-١٣٩.

* لەدوا سەردانی وەفدی ئۆپۆزسیۆنی عێراق بۆ ئەمریکا لە ١٩٩٢/٧/٢٧دا ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوایەتی ئەمریکا لە وەڵامدانەوەی پرسیارێکی کاک مەسعود بارزانیدا لەسەر کارەساتی ١٩٧٥ گوتوویەتی: «ئەو ـ کارە ـ دووپات نابێتەوە.»

لایەنی کەم دەبوو سەرکردایەتی پارتیو بارزانی بیانزانیبا کە ئەمریکاو ئێران بەچ نیازێک ڕازی بوون یارمەتی شۆڕش بدەن، ئەگەر زانیویانەو سەرەڕاش، سالی ١٩٧٤ بڕیاری شەڕبوونەوەیان داوە بەمەبەستی ئەوەی لایەنی کەم بتوانن مەرجە شۆڤێنیەکانی بەعس بەتاڵ بکەنەوە، ئەوا لە میاندا بە سەرشۆڕی ڕێکەوتنامەی جەزائیر، ڕژێم گرەوەکەی بردەوەو بەم گرەو بردنەوەیەش ئەوە دەسەلمێنێ کە سەرکردایەتی شۆڕش زیاد لە ئەندازە حسابی بۆ ناکۆکی نێوان عێراقو ئێران کردووە، ئەگەر بە وردیش نەیانزانیبێ ئەمریکاو ئێران بەچ نیازێک یارمەتی شۆڕشیان داوە، ئەوا دیسان بڕیاردانەوەی شەڕبوونەوە لەسەر بنچینەی پشتیوانی ئەوان بێ کتومت زانینی نیازەکانیان هەڵدێری هەرەسی کردە بەشمان.

پێشمانوایە لە حاڵەتی زانینو نەزانینی نیازە ڕاستەقینەکانی ئەمریکاو ئێران، باشترین دەستەبەر ئەوە دەبوو کە بە زۆری نەخشەو پیلانەکانی پارتیو شۆڕش لە سالانی ١٩٧٠-١٩٧٤دا پشتی بە جەماوەری گەلەکەمانو گواستنەوەی چەقی شۆڕشو گیانی بەرەنگاری بۆ ناو شارەکان ببەستایە، تەنیا بەم سیاسەتە دەتواندرا شۆڕشو گەلەکەمان هەم لەو غەدرە مێژوویە ڕزگار بکرێو هەم زەمانی پاشەکشەی گەورەش بە ڕژێم بکرێ، بەلاْم نەکرا، چونکە ئەندێشەی خەباتی چەکداری بەپێی خەسلەتەکانی کۆمەلی کوردەواری لەناو سەرکردایەتی پارتیدا زالبووە.

جەماوەری گەلەکەمان ئامادە بوون بە سەدان هەزارین ببنە پێشمەرگەو بچنە ئۆردوگاکانی ئێرانو لەناوچە ڕزگارکراوەکان دانیشن، ئەو جەماوەرە ئەگەر بە تاکتیکو دروشمی شۆڕشگێڕانە لەناو شارەکاندا بۆ خۆپیشاندانو مانگرتنو ڕاپەڕین جۆش بدرانایە هەنگینی دۆخی سیاسی کوردستان دەگۆڕاو پاشەڕۆژێکی باشتر دیاری دەکرا. بەلاْم بەداخەوە نەگۆڕینی ستراتیژی خەباتی چەکدارانەی شاخەکان نەک هەر لە بەرژەوەندی پاشەڕۆژی گەلەکەمان نەبوو، بەلْکو زیانێکی کاریگەریشی ڕێکەوت، وێڕاش سێ ڕاستی لەمێژوودا لەبەردەم بزووتنەوەی ڕەوای گەلەکەماندا ساغ بوونەوە :

١- ڕژێمی عێراق هەرگیز مافی چارەنووسی کورد ناسەلمێنێو لەپێناوی ئەم نەسەلماندنەش، ئامادەیە تەنانەت سەر بۆ ڕژێمێکی کۆنەپەرستی وەکو شاش شۆڕ بکا.

٢- هەموو جۆرە پێوەندیەکی دیپلۆماسیو سیاسیو عەسکەریو ئیداری ستراتیژی

بزووتنەوەی کورد لەگەڵ دەرەوەدا دەبێ مۆرکراو، ڕوونکراو، کۆنکرێتو ساغ کراو بێ دەنا هەموو دەوڵەتێک بۆی هەیە بە ئارەزووی بەرژەوەندییەکانی وازی بە پێوەندیەکە بکا.

٣- ڕژێم ئامادە بوو بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی کورد، سەر بۆ ڕژێمی شا تا ڕادەی دەست هەڵگرتنی لە سنووری دەریایی عێراق هەڵبگرێ، بەلاّم سەرکردایەتی پارتی ئامادە نەبوو دەست لە کەرکوکو خانەقینو ژەنگار هەڵبگرنو ڕازیش نەبوون بچنە ناو (بەرەی نیشتمانی) کارتۆنی بەسەرکردایەتی بەعسی فاشی. ئەگەر بشگوترێ لەڕووی تاکتیکی سیاسیەوە نەرمی پێویستە، ئەزموونی (پارتی کۆمۆنیستی عێراق) لە چوونە ناو (بەرە) لەگەڵ بەعسدا وەکو حیزبێکی سیاسی بێهودەیی تاکتیکی نەرمیشی لەگەڵ ڕژێمێکی فاشی سەلماند، هیچ حیزبێک ناتوانێ لەوە زیاتر نەرم بێ کە (حشع) لەگەڵ بەعسدا نەرم بوو، ئینجا کەوتنە ویزەشیان!

## ٨/٥- دۆخی دوای هەرەس

کە هەرەس بە شۆڕشی ئەیلوول هێندرا، هەل بۆ ڕژێم هەڵکەوت جگە لە هەرەسی عەسکەری، هەرەسی سیاسیو سایکۆلۆژی تەنانەت نەتەوایەتیش بە کورد بهێنێ. کورتیەکەی لەدوای ژێرکەوتنی ڕاپەڕینی چەکدارانەی ئاگریداغ لە کوردستانی بەشی تورکیا (١٩٢٥) هەرگیز ڕۆژگاری وەکو دوای هەرەس دووچاری نەتەوەی کورد نەهاتبوو، نەک گەلو نیشتمانو بنەماڵەو کولتوورو کەلەپورو کەسوکار، بەڵکو هیچ کەسێک لە شەرەفی خۆیشی دڵنیا نەبوو، وەکو چۆن ئاسک دەکەوێتە بەردەمی پڵنگێکی برسی ئاوا کورد کەوتبووە بەر پەلاماری ڕژێمێکی فاشی، لەڕۆژگارێکی وادا، پارتی دیموکراتی کوردستان وەکو هەرەسی عەسکەری ڕاگەیاند، نەخشەی سیاسی دوای هەرەسی عەسکەری نەبوو، پێشمەرگەو خەڵکی سەرپشک کرابوون لە هەڵوێستی سیاسیان، چ مانەوە لە ئێرانداو چ گەڕانەوە بۆ عێراق، ئەودەم جگە لە ڕێکخستنە ئاشکراکانی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق ئەم ڕێکخراوە نهێنیانەش هەبوون:

١- کاژیک کە پاشان کرایە پاسۆک (١٩٥٦).

٢- کۆمەڵەی مارکسی-لینینی کوردستان (١٩٧٠/٦/١٠).

٣- هەروەها کادرە ناسراوەکانی ناو شۆڕش بە ڕێبەرایەتی شەهید ساڵح یوسفی

لەکاتی هەرەسدا بناغەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانیان داڕشتبوو*.

٤- هەندێ پاشماوەی قیادەی مەرکەزی حیزبی شیوعیش چالاکیان هەبوو.

لەدەرەوەی ولاتدا دوای ڕاوێژی نێوان سەرکردایەتی کۆمەڵەو سکرتێری یەکێتی نیشتمانیی کوردستان (جەلال تاڵەبانی) چەندین شێوە حیزبو ڕێکخستن تاوتوێ کرابوو، سەرئەنجام (یەکێتی نیشتمانی کوردستان ١٩٧٥/٦/١) دامەزرا. هەر ئەو دەم پارتی دیموکراتی کوردستان (قیادەی موەقەتە)ش ڕاگەیەندرا. هەڵبەتە لەناو ولاتدا کەمترین دەرفەتی لێکۆڵینەوەی ئازادانەی دۆخی کوردستانو گەلاڵەکردنی ستراتیژێکی نوێ لەدوای هەرەس نەبوو، بەلام لە هەندەراندا دەرفەتی ئازادی نووسین، سمینارو کۆڕبەستن، بلاوکراوەو ڕۆژنامەو گۆفار هەبوو، ئەمە جگەلەوەی لەڕێی تایبەتیو گشتیەوە دۆخی ڕژێمی عێراقو کێشەی کوردو سیاسەتی جیهانیو ناوچەیی دەزاندراو دەشزاندرا کێشەی گەلەکەمان دوای هەرەس چ شوێنێکی سیاسیو یاسایی هەیەو تا چ ڕادەیەک پشتیوانی دەکرێ.

لە ڕۆژگارێکی وەکو هەرەسدا کە کوردستانو دەرەوە لێک دابڕان، پێوەندی ڕۆژانە بەیەکەوە نەبێ، تەنانەت مانگانەش پێوەندی نەدەکرا، دژوار بووە بتواندرێ بە لێدوانی تەسەل دۆخی هەرەسو خەباتی دوای هەرەس لێکبدرێتەوەو سەرئەنجامی وردیان لێبهەڵهێنجێندرێ. ئەم بە وردی لێکنەدانەوەی ڕووداوەکان زیانێکی کاریگەری لە دیاریکردنی ستراتیژی نوێ گەیان، بەڵکو زۆرتر حاڵەتی سایکۆلۆژی نالەباری هەرەسەکەو سیاسەتی شۆڤێنیەتی پڕ مەترسی بەعس، تەحەکومی لە بڕواو بڕیاردانەکان دەکرد، زۆربەی بڕواو بڕیارەکانیش لە دەرەوەو ناوەوەی کوردستاندا، دیسان بۆ بەرپاکردنەوەی بزووتنەوەي چەکداری داڕێژران، هەڵبەتە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ بۆچوونی جیاواز لەمەڕ خەباتی چەکداری نەبووە، هەروا لەسەر چۆنیەتی خەباتە چەکداریەکەو ئامانج لە بەرپاکردنەوەی بزووتنەوەیەکی چەکداری دوای هەرەس بەرامبەر بەعسو لە بوونی ڕێکەوتنامەی جەزائیردا جیاوازی بۆچوون هەبوون، تەنانەت دژایەتی خەباتی چەکداریش هەبوو،

---

* یەکەمین جار ناوی ڕێکخراوەکەیان (بزووتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان) پاشان لەسەر خواستی (مام جەلال) ناوەکەیان گۆڕی بە (بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان) چونکە بۆی ڕوونکردنەوە کە (سۆسیال-دیموکرات) ناوێکی ناپوختەو خیانەتیان لە سۆسیالیزم کردووە.

بەلاَم سەرئەنجام بۆچوونەکان بەشێوەیەکی گشتی لەسەر خەباتی چەکداری لەسەر دوو بنچینەی جیاواز یەکیان پێگیرا:

بنچینەیەکیان: بەدەستەی پێشمەرگەی نهێنی پارتیزانییەوە بۆ هۆشیار کردنی زەحمەتکێشان بەناوی شۆڕشی نوێوە لە دێهات‌و شاخەکانەوە دەست بکرێ بە شۆڕشی درێژخایەن لەپێناوی ڕووخاندنی ڕژێم‌و هێنانە سەرکاری ڕژێمێکی دیموکراتی ئیئتیلافی عێراقی کە ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کوردستان دابین بکات. شۆڕشەکەش ناوبندرێ: شۆڕشی عێراقی لە کوردستانەوە هەڵگیرساو.

بنچینەکەی دیکەیان: پێکەوەنانی هێزێکی چەکداری فراوان لە تەواوی چین‌و توێژەکانی میللەت وەکو خۆپیشاندانێکی چەکدارانە پەسەند دەکرد هەتا فشار بخرێتە سەر ڕژێم مفاوەزات بە زوویی بسەلمێنێ‌و کورد لە مەترسی شۆڤێنیەت ڕزگار بکرێ.

ئەو دوو بۆچوونە، یەکەمیان دەستەی دامەزرێنەری (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان) نوێنەرایەتیان دەکردو دووەمیشیان (بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان) پێڕەویان دەکرد. هەردووکیشیان لەناو یەکێتیدا بەشێوەیەکی گشتی کاریان بۆ هێزی چەکداری یەکێتی دەکرد.

پارتی دیموکراتی کوردستانیش (قیادەی موەقەتە) بە حوکمی ئەوەی لەژێر کاریی سیاسی‌و عەسکەری‌و سایکۆلۆژی هەرەسدا پتر لە لایەنەکانی دیکە کاری دەکرد، بە مەفرەزەی گچکەوە سەرەتا لە کادیرە خوێندەوارو دڵسۆزەکانی خۆیانەوە دەستیان دایە کاری پارتیزانی بەلاَم زۆری نەخایاند پارتیش جەنگی پارتیزانی جەنگی بزۆزی وەکو شۆڕشی ئەیلوول تێکەلاَوکرد.

زۆری نەخایاند سەراپا کوردستان لە مانگی شەشی ١٩٧٦وە بە مەفرەزەی پارتیزانی‌و هێزی گەورەتری خێڵەکانەوە لەناوچە خێڵەکیەکاندا پێشمەرگەو چەکداری هەموو لایەنەکانیان لە ئامێز گرتەوە. کەم کەم چالاکی دەستی پێکردەوەو دەنگو باسی بەرپابوونەوەی سەرلەنوێی خەباتی چەکداری لە جیهانیشدا بیسترایەوە. هەنگێنێ ڕژێم تێگەیشت دەبێ دان بە ڕاستیەکاندا بنێ‌و دەست لە درۆی هەتا هەتایە کۆتایی پێهێنانی گیانی بەرەنگاری گەلی کورد هەڵبگرێ. ئیدی کەوتە جێبەجێ کردنی فراوانترین نەخشەی شۆڕشی چەواشە لە ناوچەکەدا.

لێرەدا هەڵسەنگاندنی ستراتیژی خەباتی چەکداری لەم بزووتنەوە سەر لەنوێ بەرپاکراوەی دوای هەرەس و نەخشەکانی شۆڕشی چەواشەی نوێی ڕژێم پێوەندی ئۆرگانیکی بە گەوهەری باسەکەمانەوە هەیە سەبارەت بە ستراتیژی خەباتی چەکداری و پێویستی گۆڕینی بە ستراتیژی ڕاپەڕین کە دیسان دوای گەورەترین ئەزموون و هەرەس، نەگۆڕدراو سەرئەنجام پاڵەپەستۆی ڕووداوەکان ئەو ستراتیژەیان بابەتیانە خولقاند.

## ٦/٨- زەمینەکانی بەرپاکردنەوە

### أ- زەمینەی سیاسی

لەڕووی سیاسییەوە، میللەتەکەمان خاوەن کێشەیەکی دیموکراسی ڕەوای خۆیەتی، ئەویش مافی چارەی خۆنووسینێتی، ئەم کێشە ڕەوایەش هەتا گەیشتنی بە مافە ڕەواکانی میللەتەکە، لەڕووی سیاسییەوە، هەقانیەت بە هەموو چەشنە بەرەنگاریەک دەدا. چونکە دوژمنی گەلەکەمان بە ئەزموونی دوورودرێژ دژایەتی دیموکراسی و مافی میللی و مرۆیی سەلماوە، ئەمە سەبارەت بە سەرەتاکانی مافی سیاسی میللەتەکە، بەڵام ئەگەر بێت و ئەم پرنسیپە گشتیە لە قالبی بۆچوونی گشتیەوە دەربهاوێن و بەش بەش شیبیان بکەینەوە چ بەرئەنجامێک دەدەن بەدەستەوە؟ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی ئاوا دەمانباتەوە سەر یاسا گشتی و تایبەتیەکانی ڕزگاری گەلان لە ناو چوارچێوەی ستراتیژی چەکداریدا، ئینجا دەشێ حوکمێکی زانستیانە لەسەر چۆنیەتی بەرپاکردنەوەی خەباتی چەکداری دوای هەرەس بدرێ، چونکە هەتا ئەو یاسا گشتیانە نەخەینەوە بەرچاو، یاسای تایبەتی ڕزگاری چەکدارانەی گەلەکەمان لێدەئاڵۆزێ، تایبەت لەسەرەتای بەرپاکردنەوەی جەنگی پارتیزانی ئەم بزووتنەوەیەی دوای هەرەسدا، هەموو لایەک خۆیان لە یاسای گشتی ڕزگاری گەلان و ئەندێشەی چەپیش دوور نەدەزانی.

ئەوەی لەپاش جەنگی دووەمی جیهانەوە، بەتایبەت لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی درێژخایەنی چینەوە بۆ ستراتیژی خەباتی چەکداری-ڕزگاری خراوەتە قالبی یاسای گشتییەوە، ئەم پرنسیپانەن:

١- باری بابەتی؛ بێ ہروایی ڕەهایی خەڵک بە ڕژێم و بێتوانایی ڕژێم لە چارەسەرکردنی تەنگ و چەڵەمەکانی خەڵکدا، ئەمەش کاتێک ڕوودەدا کە ناکۆکییەکی لەچارەسەرکردن نەهاتوو بکەوێتە نێوان هێزی بەرهەمهێنان و

پێوەندیەکانی بەرهەمهێنانەوە.

٢- باری خۆیی، پارتی پێشڕەو، بەرەی یەکگرتووی گەل، شۆڕشی چەکدارانە.

ئەگەر خاڵی یەکەمیان کە (باری بابەتی)یە لەسەر عێراقو کوردستان بپێوینو بگەڕێنەوە بۆ زەمانو زەمینەی دوای هەرەس، ئاوای لێدێ: بەهۆی بوونی بەرهەمی نەوتو کەرەسەی خاوی هەمەچەشنەی زەبەندی عێراقەوە، داهاتی وڵاتەکە زۆرتر پشتی بەو سەرچاوە ئابوریەوە دەبەستو لەو بارەشەوە بۆ زاڵی ڕژێمێکی بۆرژوازی دواکەوتووی وەکو عێراق، توانای ئابوری هێندە هەبووە بتوانێ تەنگوچەڵەمە ئابوریەکانی خەڵک بەشێوەیەکی گشتی لەدابینکردنی کارو مووچە پێدانو خانووبەرەو پێویستی دیکەوە چارەسەر بکا. ئەمەش هۆیەکی هەرە گرنگی کەڵکە نەبوونی ئاستەنگەکانی ئابووری عێراقە هەتا ڕادەی قەیرانی قووڵی ئابووری، کاتێک وڵاتێکیش ئاستەنگەکانی نەگەنە قەیرانی قووڵ، هەڵبەتە مانگرتنو خۆپیشاندانی چینایەتی هەروا کێشە قووڵە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانی ناتەقنەوە، لە حاڵەتی واشدا لەسەر ئاستی عێراقدا، دۆخی شۆڕشگێڕانە هەتا ڕادەی ڕاپەڕینی جەماوەر بۆ ڕووخاندنی ڕژێم یان بۆ پاشەکشە پێکردنی ڕژێم نە ڕەخسابێ، کەواتە: باری بابەتی بە چەمکە زانستیەکەی بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی عێراق هەڵگیرساو لە کوردستانەوە لەبار نەبووە.

ئەو نارەزاییەی لەناو خەڵکو هێزە سیاسیە عێراقیەکانیشدا دژی ڕژێم هەبوون، ناکرێ بکرێنە بنەمای دۆخی شۆڕشگێڕانە بۆ ڕووخاندنی ڕژێم یاخود نارەزاییەکە هەتا ئەو ڕادەیە بووبێ کە بەرپاکردنی شۆڕشی عێراق لە کوردستانەوە زووتری بخەملێنێ. ساڵەهای ساڵ بوونی نارەزایی خەڵکو حیزبە سیاسیە عێراقیە ئاوارەکان لە بوونی خەباتی چەکداری لە کوردستاندا نەیانتوانی تەکانێکی بەرچاو بەو نارەزاییە بدەنو بەرەو دۆخی شۆڕشگێڕانەی بگۆڕن، هەتا پێش ڕاپەڕینی خۆڕسکانەی ساڵی پار خەڵک لە خوارووی عێراقدا تاکە نموونەیەکی خەباتی جەماوەری گرنگ شایەنی کاری هێزە سیاسیە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراق نین.

سەبارەت بە کوردستانیش، لەڕووی نەتەوایەتیو سایکۆلۆژییو سیاسیشەوە زۆربەی جەماوەری کورد دژی شۆڤێنیەتی ڕژێم بوونو ئەمەش دەکرێ بە بەشێک لە خەسڵەتی ڕەخساوی باری بابەتی لە کوردستاندا بزانین، هەر ئەم خەسڵەتە ڕەخساوەی باری بابەتی لە کوردستاندا دۆخی سیاسی تایبەتی کوردستان لە

دۆخی سیاسی گشتی عێراق جوێ دەکردەوە، دەیشیکاتە زەمینەیەکی پتەوی گیانی بەرەنگاری کوردستانی، کەوابێ لێتوژینەوەی ئەم خەسڵەتە تایبەتیەی باری بابەتی کوردستان بۆ گیانی بەرەنگاری رزگاری‌و دیموکراسی کوردستانی چ پێوەندیەکیان بە بنەمای ئابووری عێراقەوە هەیە کە بە داهاتی نەوت قەرەبووی قەیرانەکانی کراوەو باری بابەتی‌و دۆخی شۆڕشگێڕانەی تێدا نەخولقاوە.

ئەگەر پێوەندی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و نەتەوایەتی ناو ولاتان میکانیکیانە بەسترێنەوە بە بنەمای ئابوورییەوە، دەبێ لەسەر بنەمای ئابوری قەیران نەتەقیوی عێراقی، کێشەی دیموکراسی میللەتێکی وەکو کورد نەگاتە رادەی ڕەخسانی باری بابەتی کوردستانی، بەلاّم بەهۆی دوو هۆی ئابووری‌و سیاسییەوە دەردەکەوێ کەوا پێوەندییە ئابوورییەکان میکانیکیانە نین تەنانەت ئەو پێوەرە تیۆرییەی دەیان ساڵ کرابوونە مۆتەکەی ئەندێشەی زانستیانە لەسەر ئەو بنەما ئابوورییە بۆ لێکدانەوەی خەباتی کرێکارانی ولاتانی فرە نەتەوەی وەکو عێراق‌و تورکیاو ئێران‌و سۆڤیەت‌و یوگسلاڤیا، هەروا خەباتی هاوبەشی دیموکراسیان، هەڵدەوەشێتەوەو دیاردەو دەرکەوتەکان هەتا هاتن سەلماندیان کە یاساو ڕێسای ئابووری نەگۆڕ نییە، بەتایبەتی یاساو ڕێسای بنەمایەکی ئابووری کە بە سیاسەتی کۆلۆنیالیزم بنەمای دارێژرابێ‌و بە سوپای داگیرکەرانیش سەپابێ. ئەو دوو هۆیەش ئەمانەن:

١- تەنیا بنەمای ئابووری‌و پێوەندی‌و هێزی بەرهەمهێنانی ئابووری بڕیاری لێبڕاوی دیاردە سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەکانی ژیان‌و پێوەندییە کۆمەڵایەتیەکان نادەن، بەڵکو کێشەی نەتەوایەتی‌و نیشتمانی میللەتان، هەروا خواستە دیموکراسیەکان زۆر جار دەبنە مایەی خەباتی شۆڕشگێڕانە، هەزاران چەشن ڕووداوی نەتەوایەتی‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی قووڵ لە جیهانی سەرمایەداری پێشکەوتوو دواکەوتوودا کە بنەما ئابووری‌و پێوەندییە ئابوورییەکەیان چەقی سەرمایەداریشی بەستووە، لە شۆڕشی بۆرژوازی ئەورووپیەوە هەتا خەباتی رزگاری میللەتانی ژێردەستە، باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستیەن.

٢- کێشەی کورد لە ڕۆژهەڵاتدا لە کێشەی میللەتانی بێ مافی دیموکراسی، ڕەگێکی مێژوویی قووڵتری ئەوتۆی هەیە کە هەرگیز لەناو قاڵبێکی ئابووری سەپێندراودا بە قوتا نابردرێ، بەڵکو هەتا ئەو ڕۆژەی نەتەوەی کورد دەگاتە مافی چارەی خۆنووسینی سەربەستانەی سەربەخۆیی نەتەوەو نیشتمانەکەی

کێشەکە هەمیشە کڵپە دەسەنێ ئەگەرچی جارویار لەم یان لەو بەشی کوردستاندا ڕاپەڕینەکانی سەرکوت بکرێن.
ئەم ڕاستیە نەتەوایەتیە لە هەستی میللیو هەڵوێستی سیاسی میللەتی کورددا، بۆ تەمسێرێکی ما دی ئەوتۆ هەردەم خەسڵەتە تایبەتیەکەی دوور لە بارودۆخی وڵاتانی داگیرکەری کوردستان، خۆیەخۆ وەکو بزووتنەوەیەکی دیموکراسی میللەتێکی ژێردەستە ڕەنگی شۆڕشگێڕانە دەداتەوە.
بەپێی ئەو ڕاستیانەش بێ، بەشێوەیەکی گشتی باری بابەتی سیاسی لە کوردستاندا سەرباری هەرەسو زاڵی ڕژێم لە زەمانو زەمینەی دوای هەرەسدا بۆ بەرەنگاری شۆڕشگێڕانە لە کوردستاندا هەبووە، بەڵام ئاخۆ ڕژێم بەو هەموو توانایەی هەیبوو دەیتوانی ئەو خواستانەی بارە بابەتیەکەی کوردستانیان خەملاندبوو کە ئەویش خواستی دیموکراسیو ئازادی میللەتێکی ژێردەستەیە، دابین بکاو بارە بابەتیەکە بەتاڵ بکاتەوە؟ ئەگەر مەسەلەکە پێویستی ئابووری دابڕاو لە باقی پێویستیە سیاسیو کۆمەڵایەتیو دیموکراسیەکان بێ، ئەوا ڕژێم توانای ئابووری لەدوای هەرسەوە، هەم بەهۆی هەرەسپێهێنانی شۆڕشی ئەیلوولەوەو هەم بە هۆی داهاتی فرەی نەوتەوە، زۆر زیاتر بووە، لە ساڵی ۱۹۷۰دا داهاتی نەوتی عێراق یەک بلیۆنو (۲۳۰) ملیۆن دۆلار بووە بەردەوام هەتا ساڵی ۱۹۸۰ بەرزبۆتەوەو گەیشتۆتە (۲۵) بلیۆن دۆلار، واتە بیست بەرامبەر زیادی کردووە*.
هەربۆیە توانای ئابووری ڕژێم لە ڕادەی دابینکردنی پێویستیەکانی خەڵکدا هەبووە، خەڵکیش سەرەڕای ئەوەی جیاوازیەکی زەق لەنێوان نەتەوەکانی عێراقدا دەکرا بەڵام دیسان لەچاو ساڵانی پێش هەرەس بژێوی ژیانو ژیواریان باشتر دەبوو، بەڵکو لەدوای مـشـەوە توانای دارایی خەڵکو کاروباری بیناو کۆنتراتو بازرگانیو مووچەی باشو ئاڵوێل، هەتا دەهات بە نەخشەی ڕژێم بۆ دروستکردنی فراوانترین بنکەی جەماوەری هوردە بۆرژوازی زیادی دەکردو کەمو کورتیەکانی ڕابردوو کەمتر دەبوون.
ساڵی ۱۹۷٤ فەرمانبەرو هێزەکانی سوپاو کرێکاران ۹-۱۹ دیناریان بۆ زیاکرد، ساڵی ۱۹۷۹یش ۱۰-۱۷.۵ دینار ئەمجارە خانەنشینەکانیشی گرتەوە.

---

* بۆسەرژمێرەکە بڕوانە حرب الخليج، اوهام القوه و النصر ل:۹۱ محمد حسنين هيكل.

داهاتی هاولاتی عێراق بە داهاتی نەوتو دوور لە نەخشەی ئابووری و زانستی و هاوئاهەنگی ڕەوتی چۆن یەک پەرەسەندنی پێویستیە ئابووریەکان و توانای خەلک لەدوای هاتنە سەرکاری بەعسەوە، بەمەبەستی نەخشەی بەعسیانە ئاوای لێهات: سالی ١٩٦٨ لە (١٫٩١) بۆ (٢٦٩٫٤) دینار سالی ١٩٧٤ بەرزکرایەوە بۆ (٦٦٦٫١) دینار سالی ١٩٨١. بەمەش ناوەنجی مووچەی سالانە لە (٤٩٢) دینارەوە سالی ١٩٦٨ بۆ (١٥١٧) دینار سالی ١٩٨١ زیاد کراوە ‹٣٧›.

ئەو نەخشەیەش جگە لەوەی کاری کردە سەر گوزەرانی خەلک، خەلکیشی چەواشەکردو هەر لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە ئابوورییە پشت بەستووە بەداهاتی نەوت ژێر بینای ئابوری عێراق تێکچوو، ڕژێمیش دەیویست بەو جەنگانە کە دژی کوردو دژی ئێران و کوێتیش بەرپای کردن. قەرەبوی قەیرانەکانی بکاتەوە، بەمە دەسەلمێ کەوا بزووتنەوەی میللەتان و کێشە کۆمەلایەتیەکان تەنیا بنەما ئابووریەکان و تەنگوچەلەمەکانی نایانبزوێنن، بەلکو هۆیەکانی دیکەیش: نەتەوایەتی و سیاسی و سایکۆلۆژی، ڕۆلێکی کاریکەر دەگێرن تەنانەت هەتا ڕادەی ڕەخساندنی باری بابەتی بەرەنگاری میللەتانی ژێردەستەش، بۆیە لەدوای هەرەسەوە، سەرەرای قوولنەبوونی ناستەنگە ئابووریەکانی ڕژێم و سەرباری باشتر کردنی ژیانی دارایی و پێداویستیەکانی خەلک، بەهۆی شۆڤێنیەتی بێ ڕادەی ڕژێمەوە گەلی کوردستان لەناو ژانی هەرەسەوە دەبووژایەوەو گیانی بەرەنگاری بە ئاقاری ڕزگاری و دیموکراسیدا دەژیایەوە.

باری خۆیی لە کوردستاندا لەدوای هەرەس و سەرەتای بەرپا بوونەوەی خەباتی چەکداریدا، چەشنی ولاتانی کە خەباتی چەکداریان سەرخست (چین و ڤێتنام و کۆریاو کوباو لاوس) نەبوو، پارتی پێشڕەو بە چەمکە چینایەتیەکەی ئەو ولاتانە، نە زەمینەی کۆمەلایەتیی هەبوو نە توانای چینایەتی و خەباتی سیاسیش لەبار بوو، دروستکردنی (بەرەی نیشتمانی کوردستانی)یش بەهۆی ئالۆزبوونی کێشە کۆنەکانی نێوان (پارتی و یەکێتی) سەرئەنجامی هەرەس و ساڕێژ نەبوونی تەواوی برینەکانی ڕابردووەوە، هەروا ئاکامی ڕوانگەی سیاسی جیاوازی تازەشەوە، نە ت

‹٣٧› التقرير المركزي للمؤتمر القطري التاسع، حزيران ١٩٨٢، ل: ٩٤.

نەهێندرایەدی، بەڵکو کە یەکێتی دامەزراو پارتی بوژێندرایەوە، لایەنی کەمی ڕێکەوتنامەی سیسیشیان لە نێواندا لە خزمەتی چۆنیەتی بەرپاکردنو پتەوکردنی خەباتە چەکدارەکە مۆر نەکرا*. بگرە دژایەتیو گیانی قینەبەرایەتی هەتا دەهات توندتر دەکرا. ئەو دۆخە سیاسییە ناکۆکو دژوارە جگە لەوەی پێویستیەکانی دروستکردنی (بەرەی نیشتمان)یان بەجارێک دواخست، ناکۆکیە لاوەکیەکانیشیان تەقاندەوەو دەرفەتیان‌دا بە دوژمنانی گەلەکەمان زیاتر بکەونە هاندانو دنەدانی زیاتری کێشەکان، ئیدی کارەساتەکانی جەنگی ناوخۆ هاوزای بزووتنەوەی پارتیزانی سەریهەڵداو هەتا سەروبەندی ئەنفالەکانیش درێژەیەکی تراژیدی کێشا کە دەشێ بگوترێ هەموو لایەک بێ جیاوازی، بەرپرسیاری جەنگە ناوخۆکەنو هەموو ئەوانەي بەشداریان لە جەنگەکەدا کردووە، پێ بە پێی پلەکانەی بەرپرسیاریان لەناو بزووتنەوەکەدا لە گەورەوە بۆ گچکە، هەریەکە بەپێی خۆیو توانای سیاسیو عەسکەریەکەی، ئۆباڵی سیاسیو عەسکەری کارەساتەکانی هەڵدەگرێ. هەموو جۆرە خۆ بواردنێکیش لە ئۆباڵەکە درۆیەکی مێژووینە بۆ چەواشەکردنی جەماوەر؛هەڵبەتە لە دادگای حوکمی مێژوودا گەورە بەپێی خۆیو گچکەیش بەپێی خۆی هەڵدەواسرێ.

جگە لە نەبوونی (حیزبی پێشڕەو)و (بەرەی نیشتمانی)، بێتواناییو نەبوونی پشتیوانی ستراتیژیو کێشە تەقێندراوەکانی ناوخۆش، دوایین پێویستی هێزی خۆیی کە دامەزراندنی (لەشکری میللی)یە، شێواندو بە خواروخێچی لەبری ئەوەی هەتا دەهات هێزی پێشمەرگە نزیک بخرێنو یەکبخرێنەوە، لێکدادەبڕانو دەدران بەگژیەکدیدا، ئەمەش هەتا دوای ڕاپەڕینو هەڵبژاردنی پەرلەمانیش درێژەی کێشا، لەناو ڕاپەڕینیشدا زیانی فرە لەشکری وێرای نەبوونی جەنگی ناوخۆ لەیەک ساڵدا لە پشێویو نەبوونی دیسپلینو ئەو هەموو تاڵانی تاوانانەی کران، کەمتر نەبوو لە ساڵانی جەنگی ناوخۆ.

بەوپێیە لە کوردستانی بەشی عێراقدا جگە لە ڕۆژگاری ناڵەباری هەرەسو نەبوونی باری بابەتی وەکو پێویستی هەڵگیرسانەوەي جەنگی پارتیزانی (تەنیا مەسەلە نەتەوایەتيو سیاسیەکە نەبێ) باری خۆییش سەرباری نەبوونی پارتیەکی

* تاقە ڕێکەوتنامەیەکی مەیدانی لەنێوان (پارتیو یەکێتی)دا، ساڵی ۱۹۷۷ مۆرکرا، دوای دوو مانگ هەڵوەشایەوە.

پێشڕەو ( با چینایەتیش نەبێ!) تەنانەت پارتێکی شۆڕشگێڕی دیموکراسیش بە تەنیا یاخود زۆر بەهێزتر لەلایەنەکانی دیکە بۆ پارسەنگدانەوەی کەلێنەکانی باری بابەتی‌و خۆیی کە زۆر پێویستن بۆ شۆڕشی چەکداری، لە ئارادا نەبووەو تێکڕای هێزەکانی کە هەشبوون، کەم‌و زۆر دانیان بە ڕێبەرایەتی یەکدیدا نەدەنا، هەر حیزبێک خۆی‌و هێزەکەی بە پێشەنگ دەزانی‌و حوکمی دەکرد. کەوابێ:

- باری بابەتی وەکو پێویستە نەخەملی بوو.
- باری خۆییش نەڕەخسابوو، بەڵکو ئاڵۆزا بوو.
- پێویستیەکانی خەباتی چەکداریش دابین نەکرابوون.
- ڕژێمیش لە سالی هەرەس زاڵترو بەتواناتر ببوو.

شۆڕشیش سەرەڕا بەرپاکراوە. بەمەش دەبێ ئاوڕێک بدەینەوە لە:

زەمینەی عەسکەری

کاتێک باری بابەتی‌و بەرەنگاری میللەتێکی ژێردەستەی دابەشکراو تا ڕادەیەکی باش ڕەخسابن‌و داگیرکەرەکەیان لەبەر شۆڤێنیەتی دژی خواستەکانی میللەتەکە بێ‌و هەلومەرجی سیاسی جیاواز لەناو یەک ولاتی فرەنەتەوەدا لەگەڵ نەتەوەی سەردەستەو نیشتمانی ئەو نەتەوەیەدا هەبێ، داخۆ هەلومەرجی بابەتی ئاوا ئیستەرەم دەبەستریتەوە بە شۆڕشی چەکداریەوە یاخود ئەگەر هەلومەرجەکەش بەسترابێتەوە بە شۆڕشی چەکداریەوە، ئایا داگیرکەرەکەی کە خواستی سیاسی میللەتەکە دابین ناکا، هێندە لاوازە نەتوانێ بزووتنەوەی چەکداری ئەو میللەتە ببەزێنێ؟ واتە جیاوازی باری بابەتی میللەتێک بۆ گیانی بەرەنگاربوونەوەی نەخشە شۆڤێنیەکانی داگیرکەرەکانی لەگەڵ توانای خەباتی چەکداری میللەتەکەو داگیرکرەکەی چییەو چۆنە؟ بۆ ئەوەی ئەم ڕاستیەش ڕۆشن بکەینەوە وا پێویستە ئاوڕێک لە توانای عەسکەری گەلەکەمان بدەینەوەو لەگەڵ توانستی عەسکەری‌و تەکنۆلۆژی ڕژێمدا بەراوردێکی بکەین پاشان ئاکامی بڕیاردان دیاری بکەین:

کورد، دوای هەرەس بێ‌کەس‌و کەساس لەسەر خاکی نیشتمانەکەی، بەعس کەوتبووە ویزەی. ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاتی ئەم جیهانە پڕ لە لافی سۆسیالیزم‌و دیموکراسیە، دوژمنەکەیان پرچەک دەکردو کوردیان فەرامۆشی بەرژەوەندیەکانی جەنگی سارد دەکرد. جگە لە سوریا کە بە پێی ناکۆکیە سیاسیەکانی ناوچەکەو دوژمنایەتیان لەگەڵ بەعسدا پشتیوانی هێزە سیاسیەکانی عێراق‌و کوردستانی

دەکرد، هیچ وڵاتێک زاتی پشتیوانی کوردی نەدەکرد، لیبیاش لە دوورەوە دۆستی بوو.

میللەتەکە، چەکی نەبوو، پارەی نەبوو، دوژمنەکەی زاڵبوو. ئەوەی هەبوو لەڕووی عەسکەریەوە، تەنیا دەیان یان ئەوپەڕەکەی سەدان پارچە چەکی شاردراوی حیزبە سیاسیەکان بوو لەگەڵ چەکی شاردراوی خەڵکو کەسانی قاچاخچی. تەقەمەنی، دەبوی پێویستیو تۆپو دۆشکەو هیچ چەشنە چەکێکی قورسی نەبوو.

رژێمیش، دوا لوتکەی کوردستانی داگیرکردبوو، تەواوی ناوچە نهێنیەکانی پێشمەرگەی پشکنیبوو. شوێن بە شوێن ئاگای لە وردو درشتی هەبوو، دەیان هەزار کورد ڕاگوێزرا بووە خواروو. سەرەڕای سەرشۆڕییەکەی بۆ رژێمی شا، بەڵام داهاتی نەوتی لەدوای هەرەس، (١٥) بلیۆن تێپەڕیبوو، ئەمە لەکاتێکدا ساڵی ١٩٧. بلیۆنێکو (٢٣.) ملیۆن داهاتی هەبوو. بەو داهاتە توانیبووی سێ بلیۆنو نیو دۆلار ساڵانە تەرخانی سوپاکەی بکات، ژمارەی سوپا گەیشتە (١٩.و...) هەزار بەسەر (١٢) تیپدا، دابەشکرابوون، لەکاتێکدا ساڵی ١٩٧٣ شەش هەتا حەوت تیپی عەسکەری هەبوو.

لە ساڵی دەستپێکی شەڕی ١٩٧٤وە هەتا ساڵی دەستپێکی جەنگی پارتیزانی بەرەنگاری گەلەکەمان توانای تەکنۆلۆژی رژێم ئاوای لێهاتبوو:

- لە ٢٥. فڕۆکەی جەنگینەوە بۆ ٤٥. فڕۆکە.
- لە ٨. کۆپتەرەوە بۆ ٢٥. کۆپتەر.
- لە ..١٤ تانک بۆ دوو بەرامبەر.
- لە ..١٥ نەفەربەر بۆ دوو بەرامبەر.
- لە ..٩ تۆپی عەیار١٢٢ هەتا عەیار ١٨.٥.١٠ بۆ دوو بەرامبەریش پتر.

ئەمە تەنیا ئەو چەکانەن کە لە کوردستاندا بەکاردێن، دەنا چەکی دەریاییو موشەکی زەوی–زەوی نەنووسراون. ئەو چەکانەی ئاشکرا بۆ شێوە جەنگی کوردستان لە جەنگی پارتیزانییەوە بۆ جەنگی هێرشی ستراتیژی عەسکەری بەکاردێن، بەتایبەت کۆپتەرو نەفەربەرو تۆپو تانک، ڕاستەوخۆ چەکی کوشندەی شۆڕشی چەواشەن. ئەو توانا عەسکەریو تەکنۆلۆژیو داهاتە نەوتەی لەبەر دەستی رژێمی عێراقدا بوو دەیتوانی وەکو رژێمێکی ناسیۆنالیستی پانعەرەبی لەناو عەرەبی عێراقدا وەکو نەتەوەی سەردەستو هەتا ڕادەیەکی زۆر لەناو

تەواوی نەتەوەی عەرەبیشدا (جگە لە سوریاو لیبیا) بەناوی پاریزگاری لە نەتەوەی عەرەب‌و دژایەتی ئیسرائیل ختوکەی هەستی ناسیونالیزمی عەرەبی‌و ئیسلامگەری پێبداوو لەناو کوردستاندا دژی کورد بە فراوانی‌و بە حەلالکردنی دژایەتیەکەش لەلایەن زۆربەی ولاتانی عەرەبیەوە بەکاربهێنێ.

کورد لەو دووریانە مێژووییەدا، لەو جیاوازییە بێ رادەیەی عەسکەری‌و بێ پشتیوانی ئینتەرناسیونالیستی‌و جیهانیەدا، کەوتەوە بەر تاقیکردنەوەیەکی نوێ، نوێ لە هەموو بارێکی دوای هەرەسەرە، پێش هەرەس بە (۱۳۰.) هەزار پێشمەرگەو دەیان هەزار بەرگری‌و هەزاران کادری عەسکەری‌و سیاسی‌و ئیداری‌و راگەیاندنی شارەزاوە، بەدەیان دژە ئاسمانی‌و سەدان تۆپ‌و هاوەن‌و ئاربی‌جی‌یەوە لەبەرامبەر هەمان رژێم بەلام لاوازتر لە رووی چەک‌و سوپاو توانای دارایی‌و ئیدارییەوە بە رێکەوتنی جەزائیر هەرەس بە شۆرشەکەی هێندرا.

هەمان میللەت (بەلام بێتواناو لاواز) لەسەر هەمان نیشتمان (بەلام بەبێ بستێک خاکی ئازاد) لەسایەی هەمان رژێمەکانی داگیرکەری باقی بەشەکانی کوردستاندا (بێ گۆرانی یەکێکیشیان)و لەناو بازنەی هەمان نەزمی جیهانی جەنگی سارد (بێ ئەوەی نیشانەکانی گۆرانیشی دەربکەوێ). بەلێ هەمان میللەت کە کوردە،دژی هەمان داگیرکەر کە بەعسی فاشیستە، کەوتەوە بەر دووریانی سەختی هەلبژاردنی رێگای هات‌و نەهات. جەنگی چەکداری یاخود ستراتیژی نوێ؟

- لەدوای بەزاندنی راپەرینی دەرسیم (۱۹۳۷)، هەتا سالی ۱۹۸۵ کە PKK دەستیان کردەوە بە پارتیزانی خەباتی چەکداری لە کوردستانی بەشی تورکیادا بەرپانەکرایەوە (٤٨سال).
- لە دوای دامرکاندنی راپەرینی بارزانیەکان (۱۹٤٥) هەتا شۆرشی ئەیلوول لە کوردستانی بەشی عێراقدا راپەرینی رزگاری بەرپا نەکرایەوە (۱٦ سال).
- لەدوای رووخاندنی کۆماری مەهاباد (۱۹٤٦) هەتا جەنگی پارتیزانی بە رێبەرایەتی مەلا ئاوارەو سولەیمانی موعینی (۱۹٦۷) لە کوردستانی بەشی ئێراندا خەباتی چەکداری دامرکایەوە (۱۹) سال دوای بەزینی ئەمیش (۱۳ سالی) ویست شۆرش بەرپا بکرێتەوە.

بەلام دوای هەرەسی ۱۹۷٥، یەک سال‌و سێ مانگی خایاند دیسان تەقەی پارتیزان دەنگیدایەوە. ئەگەر دوای تێکشانانی هەموو راپەرینێکی چەکدارانەی

کوردستان لە ۱۹۰۰-۲۰۰۰ ساڵی ویستبیٚ ژیلەمۆی شۆڕشی بگەشێنێتەوە، هەتا ڕادەیەکی دیار مەترسیەکەی لە کوردستانی بەشی تورکیادا نەبیٚ، لەباقی بەشەکانی کوردستاندا هەتا هاتنی بەعس، بە حوکمی دواکەوتوویی ڕژێمەکانەوە مەترسیەکانی فەوتاندنی کورد زۆر نەبووە، بەڵام بەعس لەدوای هەرەس بەتایبەتی بە چەشنێک نەخشەی کێشا بوو، بە چەشنێک بەتوانا ببوو کە هەرگیز لە ۱۹۰۰-۲۰۰۰ ساڵیشی نەدەویست گەلی کورد بە دەردێکی شۆڤێنی ئەوتۆدا بەرێ بەیەک سەدەش بێداری نەتەوایەتی نەدەبووەوە، چونکە بەعس ڕژێمێکی خاوەن ئایدیۆلۆژیەتی دیاری سیاسی‌و ناسیۆنالیستی بوو، سیستەماتیکیانە لە هەموو بارێکەوە، لەباری عەسکەریەوە هەتا گچکەترین مەسەلەی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی‌و مێژووییەوە، نەخشەی چەواشەی هەبوو. بە نەخشەی وردیش بەو هەموو توانایەی هەشیبوو، دژایەتی گەلەکەمانی دەکرد، ڕژێمی ئاوا ۱۰۰ ساڵ مۆڵەتی میللەتی شۆڕش هەرەس‌پێهێندراو نادا ڕابێتەوە. بۆیە دەست بەجیٚ بەرەنگاربوونەوەي نەخشەکانی ئەرکێکی چارەنووس‌سازی سیاسی‌و نەتەوەیی بوو، دەنا بەعس کاری خۆی دەکرد. هەڵەیەکی سیاسی گەورەشە وا بزاندریٚ بەهۆی خەباتی چەکداریەوە، بەعس (تەعریب‌و تەهجیرو تەبعیسی) کردووە. یان دێهاتی کاول کردووە. بۆچوونی وا ئەسڵی زانستی نییە. بەڵکو دووریشە لە ناسینی گەوهەری شۆڤێنیەت‌و فاشیەتی بەعس، ئەگەر پاساویش نەبیٚ بۆی!

بەرپاکردنەوەی جەنگی پارتیزانی بۆ ژیاندنەوەی گیانی بەرەنگاری سیاسەتێکی دروست بوو، بەڵام پێویستە قسە لەوە بکریٚ کە ئەو جەنگە پارتیزانییە بەنیازی چ ستراتیژێکی سیاسی بەرپاکراوە؟ هەروا هەڵەکانی بەرپاکردنی جەنگە پارتیزانییە چی بوون؟ لێکدانەوەی ئەو پرسیارانە ئێستا، دوای دەرکەوتنی ڕووداوەکان ئاسانترە لە ساڵانی پڕلە کێشەی ڕابردوو کە لەسایەی حوکمی تفەنگدا چارەنووس دیاری دەکرا.

### ٧/٨- جیاوازی کوردایەتی

بە حوکمی تازە دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری هەموو هێزێکی سیاسی دەیتوانیٚ مەفرەزە پێکەوە بنیٚ‌و دابەزێتە مەیدان، واتا: دیاردەی فرەهێزی‌و فرەلەشکری ناگەڕێتەوە بۆ پێڕەوکردنی سیاسەتی دیموکراسی، بەڵکو بۆئەوە دەگەڕێتەوە هێزی سەرەکی خاوەن کۆنترۆڵی دەسەڵات لە کوردستاندا نەبووە ڕیٚ لە

چ[illegible]ی [illegible]ـەدانی [illegible]یکە بگری. بەم نەبوونەی دەسەلات بواری سەرهەڵدانی ئازادی بڕیارنەدراوی هەڵخست، چەندین هێز کەوتنە چالاکی:

- کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستان*.
- یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (دەستەی دامەزرێنەرـ هێڵی گشتی).
- پارتی دیموکراتی کوردستان (قیادەی موەقەتە).

لەهێزە سەرەکیە ناسراوە چالاکەکانی دەستپێکی دوای هەرەس بوون، پاسۆکیش بە ئەندازەی خۆی لەڕووی سیاسییەوە دەجولاً. پاشان بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانیش ئاشکرا کرا.

پاسۆکی لێدەرچێ کە دوای پەلاماردانی ڕێکخراوەکەیان مەفرەزەیەک پێشمەرگەیان ناردە دەرەوە، باقییان بەبڕیارو بەپێی سیاسەتی ڕاگەێندراوی ئەوسایان، خەباتی چەکداریان یەک لەدوای یەک ڕاگەیاند. هەڵبەتە هەموو لایەکی سیاسی لەو لایەنانە خاوەن بەرنامەی کوردایەتی جیاواز بوون.

- یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان؛ چوارچێوەیەکی نیمچە بەرەی پێشکەوتنخواز.
- پارتی دیموکراتی کوردستان؛ بەرەخنە لەخۆگرتن‌و ڕێبازی پەرەپێدراوی کوردایەتی پرۆژەی نوێی بلاوکردەوە.
- کۆمەڵە؛ مارکسی لینینییەکی پێڕەوی ئەندێشەی ماوتسیتۆنگ*.
- پاسۆک؛ بەرەخنە لێگرتنی ڕێبازو ڕێبەرایەتی کۆنی کاژیک، نوێ ببوونەوە.
- بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان؛ لە بەرنامەدا باوەڕیان بە سۆسیالیزم‌و سیاسەتی ڕیفۆرمیستی هەبوو...هتد.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان توانی جگە لەهێڵی گشتی خۆی، کۆمەڵەو بزووتنەوەی سۆسیالیتیش بخاتە ریزیەوە، پارتی دیموکراتی کوردستان سەربەخۆ کەوتە چالاکی. کە پاسۆکیش هاتە ناو بزووتنەوەکە بێ‌لایەن لەنێوان یەکێتیی‌و پارتیدا هەڵدەسووڕا. هەموو هێزە سیاسیەکان، وێڕای جیاوازی بەرنامەو ڕێبازو ڕێبەراتی‌و ڕابردوویان، دوو پرینسیپ کۆی دەکردنەوە:

---

* دوای ڕووخاندنی ڕژێمی شاو پەرەسەندنی خەباتی چەکداری‌و سەنگین بوونی لێپرسراوێتی میللی لەسەرشانی، ناوی گۆڕدرا بە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)

* کە خەباتی چەکدارانە دەستپێبکرد لەژێر کاریی بیری شەهید ئارام‌دا (ماو)یزم‌و دژایەتی زەقی شوورەوی لەسەر سیاسەتی کۆمەڵەدا بژار کران.

١- دیموکراسی بۆ عیراق‌و ئۆتۆنۆمی ڕاسته‌قینه بۆ کوردستان.
٢- ڕێبازی پارتیزانی‌و ستراتیژی چه‌کداری.
ئالێره‌دا ده‌بێ بکه‌وینه هه‌ڵسه‌نگاندنی ستراتیژی هه‌موو لایه‌نه‌کان‌و له‌به‌ر ڕووناکی ڕاستییه ده‌رکه‌وتووه‌کانی ئێستادا لێکیان بده‌ینه‌وه. جارێ سه‌باره‌ت به دیموکراسی بۆ عیراق‌و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، هه‌مان دروشمی سیاسی پارتییه که له دامه‌زراندنیه‌وه (١٩٤٦) هه‌تا هه‌ره‌سی شۆڕشی ئه‌یلوول به‌رزیکردۆته‌وه. ته‌نیا وشه‌ی (ڕاسته‌قینه) کراوه‌ته پاشگری، ئه‌میش ناوه‌ڕۆکی کۆمه‌ڵایه‌تی‌و گه‌وهه‌ری سیاسی ئۆتۆنۆمی ناگۆڕێ، چونکه ئۆتۆنۆمی کوتومت ڕاسته‌قینه‌که‌یش له کوردستاندا جێبه‌جێ بکرێ هه‌ر چواره‌مین پله‌ی مافی گه‌لانه که دوای (سه‌ربه‌خۆیی، کۆنفیدراڵ، فیدراڵ) به‌درێژایی مێژوو به‌زه‌بر سه‌پێندراوه‌ته سه‌ر گه‌لان*، که‌وابێ: له‌دوای هه‌ره‌س‌و دوای تاقیکردنه‌وه‌ی جۆره‌ها ڕژێمی عیراق، دوای تاقیکردنه‌وه‌ی به‌یانی ئازاریش، هێشتا گۆڕانێکی سیاسی قووڵ به‌سه‌ر ئه‌ندێشه‌ی بۆرژوازیه‌تی کورد دا نه‌هاتبوو، ته‌نیا له‌شێوه‌دا گۆڕان به‌دی ده‌کرا.

> گه‌لی کورد له هه‌موو ڕاپه‌ڕینێکی چه‌کدارانه‌دا، به هه‌ستی خۆڕسکی‌و دڵسۆزی خۆی هه‌میشه چاوه‌ڕێی ئامانجی سه‌ربه‌خۆیی گه‌ل‌و نیشتمانه‌که‌ی بووه، به‌ڵام هه‌موو جارێ نائومێد کراوه، ئه‌مجاره‌یش دوای هه‌ره‌س‌و سه‌رله‌نوێ به‌رپاکردنه‌وه‌ی خه‌باتی چه‌کداری به‌هه‌مان ستراتیژ جۆش‌درایه‌وه. له‌کاتێکدا ده‌بوو چاوێکی ڕه‌خنه‌گرانه به‌و دروشمه‌دا بگێڕدرێ‌و سه‌رله‌نوێ ستراتیژێکی نوێ بۆ بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاریخوازانه‌ی گه‌له‌که گه‌ڵاڵه بکرایه.

ده‌رباره‌ی ستراتیژی خه‌باتی چه‌کداریش... ئه‌گه‌ر شۆڤێنیه‌تی ڕژێم‌و مه‌ترسی تواندنه‌وه‌ی کورد هاوشانی سوننه‌تی مێژینه‌ی خه‌باتی چه‌کداری له‌دوای هه‌ره‌س‌دا، پاساوی به‌ره‌نگاری چه‌کداری له سنوورێکی دیاریکراودا بداته‌وه، ئه‌وا نه‌گۆڕینی ئه‌م ستراتیژه چه‌کداریه له‌دوو باره‌وه هه‌ڵدێرێکی عه‌سکه‌ری ترسناکیان لێکه‌وتنه‌وه:

---

* ئۆتۆنۆمی، له‌مێژوودا داگیرکه‌رانی نیشتمانی میلله‌تان به زه‌بر سه‌پاندوویانه‌ته سه‌ر گه‌لان، که‌چی کورد ده‌یویست به زه‌بری شۆڕشگێڕانه وه‌ری بگرێ‌و نه‌شیان‌دایه.

١- دیاری نەکردنی ئامانجی جەنگی پارتیزانی وەکو شێوەیەک لە خەباتی ناچاری بۆ سازدانی زەمینەی ڕاپەڕینی ناوشارەکان. بەڵکو دیسان خەباتی چەکداری کرایە ڕێبازی سەرەکی سەرکەوتن.
٢- نەبوونی نەخشەی زانستیو بەرنامەی وردی چۆنیەتی بەرپا کردنەوەی جەنگە پارتیزانییەکە،

به نووسینو قسه هەموو لایەک، گرنگی جەنگی پارتیزانی دەکردە ڕێنمای عەسکەری خۆی، بەلام بەکردەوەیش لە یەکەمین مانگەکانی دەستپێکی پارتیزانیدا، چەکداری خێڵەکیو خێڵی چەکدارو ئەندێشەی خێڵخوازی چەکداری زاڵکرانە سەر ڕێبازی پارتیزانی، بێ جیاوازی، هەموو لایەک کەمو زۆر پێڕەوی لەو سیاسەتە عەسکەرییە زیانبەخشە دەکرد.

لەکاتێکدا بزووتنەوەیەکی تازە دەستپێکردوی دوای هەرەس، بێتواناو کەم پشت، بێ چەکو تەقەمەنیو سەرچاوەی دارایی، ئاوا بێ بەرنامەی زانستی تێهەڵدەچێتەوە، هەڵبەتە کێشە کۆنەکانی ناو ئەو میللەتە تێکەڵاوی گرفتە تازەکانی دەبنەوەو ئاژاوەکانی ڕابردوویش بواری تەشەنە سەندنیان دەدۆزنەوە.

ئەوەبوو... جگە لەتێکچوونی شیرازەی جەنگی پارتیزانی، هێزی چەکداری زۆرو بۆر لەناوخۆدا زیانی ئەوەی گەیاند کە گیانی سەپاندنی دەسەلات سەرهەڵبداو هەموو ڕێگایەکی بۆ بگیرێتە بەر، تەنانەت ڕێگای شەڕی ناوخۆیش؛ جگە لە دزیو زوڵمو ڕەفتاری کۆنەپەرستانە، لە دەرەوەی بزووتنەوەکەشدا زۆر کردنی نا ئاسایی بزووتنەوەیەکی پارتیزانی لەبەرامبەر دەوڵەتێکی دەسەلاتدارو بەهێزی زۆرو بۆر، وای کرد ڕژێم بتوانێ سوپا بۆ جەنگی بەرەیی سازبداو هێزی پێشمەرگە پاشەکشە پێبکاو زیانی زۆریش لە ورەی تازە بوژاوی جەماوەر لەڕووی عەسکەریو سایکۆلۆژیەوە بدا. لە هاوینی ساڵی ١٩٧٧ کە جارێ یەکەمین ساڵی شۆڕشی درێژخایەن تەواو نەکرابوو، هەزاران چەکداری خێڵەکی تەسلیم بوونەوەو سەدان کادرو پێشمەرگەی هۆشیاریشیان ڕووخاند، بێ بڕواییشیان هەتا ڕادەیەک لەناو جەماوەردا بلاوکردەوە.

نەبوونی نەخشەی چۆنیەتی بەرپاکردنی جەنگی پارتیزانیو ڕێبازی چەکداری بە ستراتیژ زانینی رزگاری گەلەکەمان، بەدرێژایی دەستپێکی خەباتی چەکداری لەدوای هەرەسەوە هەتا ئەنفالەکان، وێڕای گۆڕانکاری هەمەجۆری ڕووداوەکان:

١-ڕووخاندنی ڕژێمی شاو ڕاپەڕینی گەلانی ئێران.
٢- جەنگی عێراق- ئێران.
٣- ناوبەناو ڕاپەڕینی ناوشارەکان.
٤- سەرهەڵدانی پرۆستریکاو کۆتایی هاتنی جەنگی سارد.
٥- پەیدابوونو بەکارهێنانی چەکی کیمیایی.
٦- مانەوەی بزوتنەوە چەکداریەکە لەناو بازنەی پارتیزانیو جەنگی بزۆزدا.
٧- بێتوانایی لە رزگار کردنو پاراستنی ناحیەیەکی گچکەی کوردستان.
٨- نەبوونی پشتیوانی ستراتیژی.
٩- ڕووندانی گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە لە عێراقدا... هتد.

ئەو هەمەوو دیاردەو دەرکەوتە جیهانیو ناوچەییو عێراقو کوردستانیانە، ستراتیژی خەباتی چەکداریو لەناو خەباتی چەکداریشدا هەڵپەی زاڵبوونو سەپاندنی دەسەلاتی هێزە سەرەکیەکانی گۆرەپانەکە بەدرێژایی ١٣ ساڵی ڕەبەق پێرەو دەکراو دەسەپا بەبێ ئەوەی بیرێکی لێبڕاو لە گۆڕینی ستراتیژی چەکدارانە بکرێتەوە. هەڵبەتە لەو ماوەیەدا، شەڕی زۆر قارەمانانە کران، جەزرەبەی کاریگەر لە داگیرکەر وەشێندران، زیانی زەبەند لە ڕژێم دران، قوربانیەکی بێ ئەندازە بەخشێندران، هەزاران تێکۆشەر لەپێناوی سەرکەوتندا لە شارو شاخاندا دریغیان لە گیانو ماڵیان نەکرد، هەزاران کادرو تێکۆشەری هۆشیار سازدران*... هتد. بەلام هەموو ئەوانە نابێ ئەو ڕاستیانە فەرامۆش بکەن کە خەباتی چەکداری، وێڕای ئەو ڕاستیانە ئامانجی رزگاری کوردستانی نەک نەهێنایە دی، نەک رژێمیشی پێ نەڕووخاو شۆڕشەکەیشی پێ نەبووە عێراقی، بەڵکو دووچاری شکستێکی ترسناکیش لەکاتی ئەنفالەکاندا کرا، ئەم شکستەش لە ڕاستیدا درەنگ کەوت، چونکە:

کە خەباتی چەکداری بەو بێ بەرنامەییەو ئاوا بێ لێکدانەوەی سیاسیو عەسکەری وردو بەبێ بەراورد کردنی ڕابردووی شۆڕشی ئەیلولو توانای ڕژێم

---

* باس نەکردنی دیاردە دزێوەکانی ناو بزووتنەوەکە کە زۆریان بێزیان لێدەکرێتەوە بۆ داپۆشینیان نییە، بەڵکو باسەکە پەیوەستە بە هەڵسەنگاندنی ستراتیژو ناچینە ناو وردەکاری.

لەگەڵ توانای دوای هەرەسی رژێمو گەلەکەمان، بەرپا کرایەوە، لەبەرئەوەی بێ زەمینەی ماتریالیستی لێکدانەوەی داهاتووی رووداوەکان لە قازانجی سەرخستنی ستراتیژی چەکداریدا خەباتە چەکداریەکە بەرپا کرایەوە، دەبوو زووتر تێک بشکایا بەلاّم دوو رووداوی چاوەڕوان نەکراو بوونە مایەی مانەوەو درێژەکێشانی دژواری خەباتە چەکداریەکە، ئەوانیش: (رووخاندنی رژێمی شاو هەلاّیسانی جەنگی عێراق - ئێران)ن، ئەو دوو رووداوە لەهەموو بارێکی سیاسیو عەسکەریو ئیداریەوە توانای درێژەکێشانی بزووتنەوەکەیان رەخساند، دەنا هەتا ئەنفالەکان تەمەنی درێژ نەدەبوو.

لە رووداوی رووخاندنی شاو جەنگی عێراق - ئێراندا، خۆشبەختیەکی گەورە لەناو هەموو هێزەکاندا بلاّوبۆوە کە رژێم بڕوخێ، چونکە جەنگەکە هەتا دەهات گەرمتر دەبوو کەچی بەو جەنگە بێ وێنەیە لەپاش جەنگی دووەمی جیهانەوە، رژێم نەک نەڕووخا بەڵکو لەرووی سوپاییەوە، چەکو توانای جەنگییەوە، تۆکمەتر بوو. لە گەرم بوونی رێڕەوی جەنگەکەداو نە رووخاندنی رژێمی بەعسدا، دەرکەوت کە رژێمەکە بە شۆڕشی درێژخایەنی عێراقی هەڵگیرساو لە کوردستانەوە ستەمە بڕوخێ، ئیدی لەدوا ساڵی جەنگەکەدا کە بە هەزاران جەنگی گەورەو گچکەی جەنگەکە، بە هێرشی ئێرانو هێرشی چەواشە، بە شەڕو شەڕگەکانی کوردستان، بە هاوئاهەنگی عەسکەری هەموو هێزەکانی کوردستانو دەوڵەتی ئێران... بەوانە هەموو رژێم نەڕووخا چونکە توانیبووی لە پەنای سیاسەتی بەرژەوەندبازی جەنگی سارددا لە رۆژهەلاّتو رۆژئاواوە پێویستیەکانی دابین بکاو داهاتی دەوڵەتانی کەنداویش هەڵبلوشێو خەڵکیش بەناوی پاراستنی دەروازەی رۆژهەلاّتی عەرەبو عێراق فریو بدات، ئینجا چارەسەرێک لە بەردەم هێزە چەکدارە سەرەکیەکانی کوردستان (یەکێتی، پارتیو حسیک) نەما، چارەسەرکردنی ناکۆکیە خوێناویەکانیان نەبێ، ئیدی لە ئاخرو ئۆخری جەنگەکەو لەسەرویەندی ئەنفالەکاندا (بەرەی کوردستانی) لەسەر دارو پەردوی پەرپوت کراوی بزووتنەوە چەکداریەکە دامەزرا.

## ٩- ئەنفالەکانو ڕووداوەکان

ئەنفالەکان، بەدناوترینو نەگریس‌ترین پەڵەیە لەمێژووی ڕژێمی عێراقو حیزبی بەعسو شەخسی سەدام حوسێندا، هەروا ئۆباڵێکی سیاسیو مرۆیی گەورەشە لەسەر شانی ئەو وڵاتانەی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا کە لەبەر بەرژەوەندبازی خۆیان لە جەنگی سارد دا ڕژێمی عێراقیان پڕ چەکی کوشندەی کیمیاوی کردو لەکاتی تاوانی بەکارهێنانیشی دژی کورد، تاوانی بێدەنگیان هەڵبژارد، جگەلەوەی دەوڵەتانی عەرەبی (سوریاو لیبیای لێدەربهاوێن) سەرجەم، ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخۆ، پشتیوانی سەدام بوون.

ڕژێم، کاتێک ئێران جەنگی ڕاگرت، خاوەن توانای عەسکەری دەوڵەتێکی هەر بەهێز بوو:

- . . ٩ هەزار سەرباز (٦٣ تیپ).
- ٥٧٤٧ تانک (١.٧٢ تانکی T72ی شورەوی) بوون.
- (. . . ١) مودەرەعەی سوکرەو (. . ١٦)یان پێشخراو بوون
- . . ٣٥ تۆپ، . ٣٣ دانەیان ئۆتۆماتیکی.
- . . . ٣ ناقیلەی باری قورس هەڵگر*.

---

* تەواوی سوپای ئەمریکا (. . ٥) ناقیلەی قورسیان هەیە، واتە ڕژێمی عێراق شەش بەرامبەری ئەمریکا ناقیلەی تانکو پێداویستی قورسی جەنگینی هەبووە.

ئەوتوانا عەسکەرییەی عێراق لەهەموو بارێکەوە (١٠) بەرامبەر توانای عێراقە لە سەرەتای دەستپێکی شۆڕشی ئەیلوولەو (٨) بەرامبەر توانایەتی لە سەرەتای دەسپێکی (١٩٧٦) لە خەباتی چەکدارانەی دوای هەرەسەوە بەعس بە ئەزموونێکی قووڵترو پشتیوانی زیاترو لەخۆڕاپەرموونی عەسکەری دڕندانەتری ڕژێمی عێراق، شۆڕشی کوردیش بە ئەندازەی نیوەی شۆڕشی(١٩٧٤) هێزو توانای نەبوو.

بەهۆی چەکی کیمیاوی‌و ئەنفالەکانەوە، زیاتر لە (٣٠٠) هەزار مرۆی کورد کوژران‌و هەزاران گوندی کوردستان تەختی سیاسەتی سوتماکی فاشیانە کران. سەرباری شکستی بزووتنەوەی بەرەنگاری گەلەکەمان کە لە دوای هەرەسەوە چواردە ساڵی ڕەبەق بەردەوام بوو.

کاتێک ڕژێم لە جەنگی عێراقدا نەبەزی‌و ئێران بەناچاری‌و بێ چاری جەنگی ڕاگرت (ئابی ١٩٨٨) سوپای عێراق بە هەموو چەکە کوشندەکانیەوە کەوتنە ویزەی هێزی پێشمەرگەو دانیشتوانی ناوچە ئازادکراوەکان. لەماوەی مانگێک تەواوی هێزە سیاسی‌و چەکدارو دانیشتوانی کوردستانیان ئاودیوی ئێران‌و تورکیا کرد، بەم سیاسەتەش، هێزی پێشمەرگەی کوردستان، دووچاری کارەساتی گەورەی شکست کراو تەواوی سەرکەوتن‌و دەستکەوتەکانی لە چواردە ساڵی ڕابردوودا لەدەستدران.

شکستەکەش جگە لە زیانە عەسکەرییەکەی زیانی سامان‌و سیاسی‌و سایکۆلۆژی بێ ئەندازەشی بۆ پێشمەرگەو گەلەکەمان هەبوو. نائومێدی عەسکەری‌و سیاسی نەک جەماوەر بەڵکو هێزی پێشمەرگەو هەزاران کادرو سەرکردایەتی هێزە سیاسیەکانیشی گرتەوە، پشێوی‌و پەشێوی هەمووانی تاساند بوو.

لەوڕۆژگارە ڕەشەدا هیچ دەوڵەتێکی ئەم جیهانە پڕ لە ژاوە ژاوی مرۆ دۆستییە، ئامادە نەبوون هەتا ڕادەی ڕەنجاندنی ڕژێمی عێراق لەسەر کورد هەڵبدەن، ئەگەرچی ناڕەزایی بەرامبەر تاوانەکان لە ڕۆژئاواوە بەرز دەبوونەوە "ڕۆژهەڵاتی سۆسیالیست"یش نوزە نوزێکیان دەکردو بەس، چینی ماوتسیتۆنگ‌و یۆگۆسلاڤیای تیتۆو کوبای کاسترۆش، نەک دژی تاوانەکان نەبوون، بەڵکو دژی دژایەتی کردنی تاوانەکانیش بوون. دەوڵەتانی عەرەبیش هەروا (سوریای لێدەربچێ). تورکیا تەنانەت پزیشکە جیهانییەکانیشی لەمەڕ بریندار بوونی کیمیاوی ئاوارەکان بەدرۆ دەخستەوە. بەڵێ کوردی کلۆڵ هەمدیس مۆتەکەی هەرەسێکی دیکە نیشتەوە سەر سنگی، هەرەسێکی ترسناکتر لە هەرەسەکەی پێشوویش!

بەوشێوەیە سەرئەنجامی عەسکەری‌و سیاسی‌و سایکۆلۆژی شکستی ئەنفالەکان

سەلماندیەوە کەوا جەنگی پارتیزانیو ستراتیژی خەباتی چەکداری لەناو بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلەکەماندا. ستراتیژێکی دابڕاو لە باقی پێویستیەکانی خەباتی ناوشارەکان، تایبەت خۆپیشاندانو ڕاپەڕین، هەڵەیەکی ستراتیژی کوشندە بوو. ئەگەر جاروبارێش ئاکامی خۆپیشاندانو ڕاپەڕینی ئەمو ئەو شاری کوردستان، هەوڵدراوە جەماوەری شارەکان هانی شێوەکانی دیکەی خەبات بدرێن بەڵام لەبەرئەوەی خەباتی چەکداری کرابووە ستراتیژو سوننەتی رزگاری کوردو جەماوەر، بەگیانی پشتبەستن بەم ستراتیژە گۆش دەکراو ئومێدی هەرە گەورەیان سەرکەوتنی خەباتی چەکداری بوو، هاوشانی بەردەوامی جەنگی ناوخۆ لەکاتی خۆپیشاندانو ڕاپەڕینەکانی ساڵانی ۱۹۸۲-۱۹۸۶دا نەتوانرا خرۆشانی جەماوەری شارەکان پەرە پێبدرێو ستراتیژێکی نوێ بۆ گەلەکە گەڵاڵە بکرێ. سووربوون لەسەر ستراتیژی چەکداریو لەناو خەباتی چەکداریشدا سووربوون لە جەنگی ناوخۆ، ساڵانی زێڕین لەکیس دران‌و هەڵکەوتی کەم وێنە لە مێژووی ڕاپەڕینە چەکدارەکانی کوردستان بەفیڕۆ چوون. ئەمە لەکاتێکدا هەموو لایەکی سیاسی - چەکداری کوردستان دەبوو پەندی گەورەیان لە مێژووی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکانی ڕابردووی کوردستان وەربگرتایە کە چۆن چۆنی داگیرکەران نەخشەیان بۆ بەزاندنی ڕاپەڕینەکان یەکخستووە؛ ئەمجارە عێراقو ئێران نەک نەیانپەرژایە سەر نەخشەی هاوبەش، بەڵکو لەبەر بلاوترینو پڕ قینترین جەنگیشدا بوون ئینجا قینی ناوخۆو هەوەسی دەسەڵاتی حیزبایەتی لە بری سوود لێوەرگرتنی گەورە لە هەلەکە، زیانی گەورەی گەیاندە خەباتی گەلەکە. ڕووخاندنی رژێم لە جەنگەکەدا وا بەمەسوگەر دەزانرا ئیدی:

- بیر لە گۆڕینی ستراتیژی چەکداری نەکرایەوە.
- جەنگی ناوخۆ ڕانەگیرا.
- شێوەکانی دیکەی خەباتی شارەکان قووڵنەدەکرا.
- بەپێی ڕێکەوتنێکی هاوبەشی بزووتنەوەی کورد تاکتیکی عەسکەری لەکاتی جەنگەکەدا دیاری نەدەکرا.
- بەرامبەر رژێم سیاسەتی هاوبەش نەبوو، لە ڕووخاندنی رژێمەوە هەتا گفتوگۆی نەرم لەگەڵ رژێمدا پێڕەوی دەکرا.

کاتێکیش کار لە کاری هاوبەش ترازاو جەنگەکە لەنێوان عێراقو ئێران دەگەیشتە بنبەست، تازە ئاشتبوونەوەی گشتیو بەرەی کوردستانیو چارەسەرکردنی

کێشەکان دادی بزووتنەوەکەی وەکو پێویست نەداو نەمانی شەڕی ناوخۆیش شکستی بزووتنەوەکەی لە ئەنفالەکاندا دەرباز نەکرد.

## ١/٩- کۆتایی جەنگی ساردو کورد

جەنگی سارد، لە ڕواڵەتدا ساردو لە ناوەڕۆکدا گەرم لە جەنگی دووەمی جیهان بەدواوە هەتا پێرار (١٩٤٦-١٩٩٠) درێژەی کێشا. جیاوازی ئەم جەنگە لەچاو جەنگەکانی یەکەمو دووەمی جیهان ئەوەیە کەوا زلهێزەکانی جیهان لەبری ئەوەی ڕاستەوخۆ دژی یەکدی بجەنگن، لەڕێی وڵاتان، میللەتانو کرێکارانو هێزە چەکدارەکانەوە، ناڕاستەوخۆ جەنگیون. قازانجی جەنگەکەیش لە هەموو ڕووداوەکانی جەنگی ساردا بۆ ماوەیەکی درێژ بۆ زلهێزەکان بوو، لەدوا ئاکامیشدا دەوڵەتانی سەرمایەداری بازاڕی ئازادو ئازادی لیبرالی بەسەر دەوڵەتانی بازاڕ کۆنترۆڵو سیستەم بیرۆکراتدا سەرکەوتن، لە ڕەوەندی دوورو درێژی جەنگەکەشدا گەلانو کرێکارانو دەوڵەتان ئەگەر لە تەنگانەو ئاستەنگێکی سیاسی عەسکەریشدا لەم یان لەو وڵات بەهۆی ناکۆکیەکانی جەنگی ساردەوە یارمەتی عەسکەریو سیاسیشیان چنگ کەوتبێ (بەتایبەت لە شورەویو چینەوە) ئەوا وەکو دوا ئاکام بە کۆتایی جەنگی سارد قازانجی سیاسیو عەسکەریان سەری مایەی خەباتیشی خواردن، زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات، چینو کوباو ئەلبانیا... هتد. دوچاری چەڵمەی ئەوتۆ هاتوون ئەوەی لەسەر ئاستی نزیکدا ڕەچاو دەکرێ لە زیان بەولاوە (زیانی کاریگەریش) ئومێدی دیکە بەدی ناکرێ.

کورد لەو میللەتانە بوو کە یەکەمین جار بەڵکو لەسەرەتای دەستپێکی جەنگی ساردەوە کرایە قوربانی خواستەکانی شورەویو یەکەمین کۆماری مێژووی کوردستان (کۆماری مەهاباد) لەناوبرا. دوای کارەساتی کۆماری مەهاباد ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەمیشە کێشمەکێشی جەنگی ساردی لەسەر بووەو کوردستانیش بێ خەباتو فیداکاری نەبووە، کەچی لەنێو سەدەی ڕەبەقدا کێشەی کورد وەکو کێشەی گەلانی دیکە لەلایەن شورەویەوە گەلاڵەی سیاسی نەکرا، بەڵکو بەزۆری لەگەڵ دوژمنانی گەلەکەماندا دۆستایەتی کراوە، ئەو کەمە دۆستایەتیەی بزووتنەوەی گەلەکەشمان لە شۆڕشی ئەیلولدا هەر زۆر کەم بووە لەچاو پشتیوانی کردنی دوژمنانی.

لەماوەی جەنگی سارد دا، دوای ڕووخاندنی کۆماری مەهاباد لە هەموو

پارچەکانی کوردستاندا حیزبی سیاسی ئالاْ هەڵگری رزگاری کورد هەبووە، حیزبە سیاسیەکانیش شورەویان بە سۆسیالیستو پشتیوانی گەلان زانیوە، هەوڵی دۆستایەتیان لەگەڵدا داوە هانایان بۆ بردووە.

کە شۆڕشی ئەیلوولیش بەرپاکرا، دیسان پارتی خۆی لە بەرەی شورەویدا دەبینیو ١٣ ساڵی رەبەقیش بارزانیو سەدان کەس لە عەشرەتی بارزانیو هاوخەباتەکانی لە شورەویدا بوون، سەرەڕاش بە شێوەیەکی تاکتیکی نەبێ (ئەویش ناو بەناو) هەرگیز کێشەی کورد لەلایەن شورەویەوە نەکراوەتە کێشەیەکی سیاسی گرنگ بەڵکو خەسەکە لێوەدایە کەوا بەپێچەوانەشەوە، لە جەنگی سارد دا رژێمەکانی داگیرکەری کوردستان، پاشایەتی بووبێ (شاهینشایی ئێرانی) یان کۆماری ( عێراقو تورکیا)، هەرکاتێک ویستبیان پێوەندی بە شورەویو دەوڵەتانی ئورووپای رۆژهەلاتەوە بکەن ئەگەر پێشتر پێوەندی بەهێزیشیان بە پنتاگۆنیشەوە بووبێ، شورەوی بە خۆشحاڵیەوە دۆستایەتی کردوون، زۆربەی دۆستایەتیەکەیش دژی کرێکارانو بەرژەوەندی گەلانی ناوچەکە تایبەت هی کورد شکاونەتەوە، بۆیە بەدرێژایی مێژووی جەنگی سارد خراپتر لە جەنگەکانی یەکەمو دووەمی جیهان، دژایەتی کێشەی کورد کراوەو تەواوی زلهێزەکانی جەنگەکە بەرژەوەندیان چۆنی خواستبێ ئاوا لەگەڵ کێشەی کورد دا رەفتاریان کردووە، دوا دیاری کۆتایی جەنگی ساردیش چەکی کیمیاوی زلهێزەکانە بۆ رژێمی عێراق.

– سەرکردایەتی ستراتیژداڕێژی کوردایەتیش بە درێژایی نیو سەدەی جەنگی سارد چاوەڕێ بووە شورەوی بێتە پشتیوانی شۆڕشی چەکداری کوردو بەو ئومێدە لەدوای کۆماری مەهابادەوە شۆڕشی ئەیلوول سەری نایەوە، لەدوای شۆڕشی ئەیلوولیش سەرلەنوێ خەباتی چەکداری هەتا ئەنفالەکان (١٩٧٦-١٩٨٨) بە نائومێدی لە پشتیوانی شورەوی دوچاری نوشستێکی ترسناک هاتو شورەوی تەنانەت بە ئەندازەی فەرەنساش زاتی دژایەتی چەکی کیمیایی بەعسی نەکرد.

– حیزبی دیموکراتی کوردستانی بەشی ئێرانیش ١٢ ساڵی رەبەقە لە خەباتی چەکداریدایەو هەتا پێش هەرەسی بلۆکی رۆژهەلات تەمای پشتیوانیان بوو، بێهودە دەرچووا

– PKKش لە ١٩٨٥وە کە دەستی کردۆتە جەنگی پارتیزانی هەتا پێش هەرەسی شورەوی لەچوارچێوەی بۆچوونەکانی بلۆکی رۆژهەلاتدا هەڵدەسوڕاو ئومێدێکی گەورەی بە پشتیوانی ئەو بلۆکە هەبووا دیسان بێهودە بوو.

- سازمانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران (کۆمەڵە) لەو هێزە سیاسی - چەکدارە شۆڕشگێڕانەیە کە لەسەرەتای خەباتی بەرەنگاری چەکداریدا بێ تەمو مژ بلۆکی ڕۆژهەلاتی دەناسیو بە وردیو زانستیانە هەڵوێستی سیاسیو ئایدیۆلۆژی لەسەر دەردەبڕین، بۆیە هەمبانەی یارمەتی وەرگرتنیشی بۆ شورەوی نەڕستبوو سەرەڕاش هەڵوێستەکەیان دوای هەرەسی شورەوی نەبۆتە مایەی وەرچەرخانێکی چینایەتیو سیاسی گەورە بۆیان، هەروا هەڵپەرستی هێزە ڕاسترەوو ناسیۆنالیستەکانیش لە سەرەتاتکێی سیاسی بۆ شورەویو کلکایەتی کردنی بلۆکی ڕۆژهەلات، دوای هەرەسی بلۆکەکە هەرەسی بەمانیش نەهێناوە، ئەگەر دیاردەو دەرکەوتەکانی پاشو پێش جەنگی سارد بە پێوەری تیۆری داهێراو لە باقی ڕاستیە سیاسیو کۆمەلایەتیەکان بپێوین، دەبوو هەڵوێستی لیبراو دژی بلۆکی ڕۆژهەلات لە دوای هەرەسی بلۆکەکە سودێکی سیاسی کاریگەری بۆ هێزە خاوەن هەڵوێستەکان هەبوایە بە پێچەوانەشەوە دەبوو وابستەکانی بلۆکی ڕۆژهەلات دوای هەرەسی بلۆکەکە بپلیشابانەوە، کەچی هیچیان وا دەرنەچوون، هۆی ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تەنیا پێوانەی تیۆری حوکمی مێژوویی نادا. ڕەوڕەوەی ژیانیش لەمەڕ خەباتە چینایەتیەکەو فەلسەفەی کرێکاران زۆری بە بەرەوە ماوە، کۆتایی جەنگی ساردیش گەلێ ڕاستی نەزاندراوی پێشتری لەسەر دیموکراسیو ئەرکەکانی دیموکراسیو چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەکانی قۆناخی دیموکراسیو پێشخستنی کۆمەلایەتیو شارستانی دەرخست، تێگەڕای ئەو ڕاستیانەش پێویستیان بە ڕامانو ئاوڕدانەوەی قووڵو قاڵبوونەوەی نوێیە لەم سەردەمە. سەردەمی کۆتایی هاتنی جەنگی ساردو تێگەیشتنی وردو درشتی سیاسەتی نوێ داڕێژراوی سەردەمی دوای جەنگی سارد.

دەبێ سەرلەنوێ، لەم دەورانەی ژیان، دەورەی ئابوریو سیاسیو کۆمەلایەتیو تیۆریو فەلسەفی سەرمایەداری هەڵسەنگێندرێنەوەو ڕادەی کاریگەریان بەشێوەیەکی گشتی دیاری بکرێ: بزاندرێ سیستەمی بازاڕی ئازادو ئازادی لیبرالی لە ڕووی ئابوری، سیاسیو کۆمەلایەتیو باسایەوە چۆن نەخشەیان بۆ دەکێشرێو چۆن چۆنی جێبەجێ دەکرێنو بەچ شێوەو شێوازێک، تواناو تەکانێک بازاڕو سیاسەتی جیهانی کۆنترۆڵ دەکرێن.

بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەی کوردیش کە هەمیشە زلهێزەکان پیلانیان لێگێڕاوەو دژی خواستەکانی بوونو پشتیوانی داگیرکەرانی کوردستانیان کردووە، دەبێ ڕابردووی باش لێکبداتەوەو هۆیە جۆراو جۆرەکانی دوژمنایەتی نەتەوەکە

دیاری بکاو بزانیٚ که:
- له جەنگی یەکەمی جیهاندا بۆچی حوکمڕانیتی شێخ مەحموودیان تێکداو پەیمانی سیڤەریان پێشێل کرد.
- له جەنگی دووەمی جیهاندا بۆچی کۆماری مەهابادیان ڕووخاندو مافەکانی کوردیان نەسەلماند.
- له گەرمەی جەنگی ساردیشدا بۆچی پشتیوانی داگیرکەرانی کوردستانو دژایەتی شۆڕشی کورد دەکرا.

ئەو قۆناخە سیاسییە جیهانیانە هەریەکەیان بۆ زلهێزەکانی جیهان هۆی ئابوری، هۆی سیاسیو عەسکەریو کۆمەلأیەتیان هەیە: ئابوری سەرمایەداریو سیاسەتی ئیمپریالیستی له جەنگی یەکەمدا لەسەر بناخەی سەرکەوتنی جەنگو چەمکی کلاسیکی سەرمایەداری داڕێژرا بوون، دوای جەنگی دووەم ئەو بناخەیە گۆڕاو سیاسەتی سەرمایەداری پەرەی پێدرا بۆ مۆنۆپۆلی کۆمپانیا فرە ناسنامەکانو له بەرامبەریشدا کامپی شورەوی سیاسەتی کۆنترۆلی بازاڕە وابەستەکانو تیژی گەشەکردنی ناسەرمایەداری دەسەپاندو جیهان بەشێوەیەکی گشتی کەوتبووە مەنگەنەی ئەو دوو سیستەمە، ئێستا جەنگی سارد بە سەرکەوتنی جەمسەری سەرمایەداریو بەزینی سۆسیال - بۆرژواکان کۆتایی هات. سەراپا جیهان کەوتۆتە بەردەستی ولأتانی سەرمایەداری گەورەو پێشەنگیشیان ئەمریکایە، ئەم سەرکەوتنەش سەرئەنجامێکی کتوپڕ نەبووە، بەلْکو دەمێکە دەبیٚ ڕەچاو کراوە، ئیدی لەمەودوا سەرانسەری جیهان دەخرێتە قالْبێکی نویٚ چەشنی سەرمایەداری کە بنەماکانی ئابوری جەنگی دووەمو دوای ئەوەیش، سیاسەتی ئابوری پەرەپێدراوی ئابوری سەرمایەداری گەرمەی جەنگی ساردیش دوای سەرکەوتن له جەنگی سارد دا دادی سەرمایەداری نادا، چونکە گۆڕانو گۆڕانکاریەکانی جیهان، خواستو داخوازیەکان، کۆکیو ناکۆکیەکان، دۆستایەتیو ململانێکان، دیاردە چینایەتیو ئابوریو کۆمەلأیەتیو پێوەندی جیهانیو جیهانبینیە هاوچەشنەکان تێکڕا گۆڕاوون، چۆن جیهانی دوای جەنگی دووەم بە جیهانی دوای جەنگی یەکەم نەمایەوە، ئاوا جیهانی دوای جەنگی ساردیش بە جیهانی نیو سەدەی دوای جەنگی سارد نامێنێتەوە.

## ٥١- گۆڕانەکانی جەنگی سارد

ئەگەر بنەمای ئابووری‌و سیستەمی سیاسی دوای جەنگی دووەم هەمان بنەماو سیستەمی دوای جەنگی یەکەم بان، بێگومان کێشەکان دەتەقینەوەو زووتر ئاستەنگەکان پەنگی قەیرانیان دەخوارد. ئێستایش ئەگەر بنەمای ئابووری‌و سیستەمی سیاسی لە جیهاندا وەکو دەهەیەک لەمەوبەریش بمێنێتەوە بێگومان قەیرانەکان زووتر دەتەقنەوە، ئەوپەڕەکەی بە خۆشباوەڕی تیۆری پێمانخۆش بیٚ قەیرانەکان بتەقنەوە، گرنگترین پرسیار ئەوەیە قەیراندکان کە دەتەقنەوە چۆن بقۆزرێنەوە؟ دیارە قۆزەرەوەی قەیرانی قووڵی جیهانی بە ئەڵتەرناتیڤی جیهانی دەکریٚ، ئەڵتەرناتیڤی جیهانیش بە ئابووری جیهانی‌و بە چینی جیهانی‌و بە سیاسەتی جیهانی‌و بە شارستانێتی جیهانی دەکریٚ نەک بە ئارەزووی تیۆری، کاتێک ئەڵتەرناتیڤی پێویستیەکانی جیهان وەکو پێشبینیەکی دڵنیاکەر جاریٚ لەئارادا نەبن یاخود هەتا ئەو ئەڵتەرناتیڤە جیهانییە دێتە ئارا ڕێڕەوێکی دیکە لەبەردا هەبیٚ، کەواتە دەبیٚ مەودای ڕێڕەوەکە بزانین‌و چۆنیەتی خەبات کردنیش لەناو پرۆسەی پێویستیەکانی ڕێڕەوەکەدا دیاری بکەین، مادام ئەڵتەرناتیڤ نەبیٚ، کەواتە شۆڕشی سۆسیالیستی ڕەچاو ناکریٚ کە گۆڕانکاری قووڵ بەمانای شۆڕشی سۆسیالیستی هەتا مەودایەکی دیکە لەپاش جەنگی سارد ڕەچاو نەکریٚ بەڵکو دوورنییە ڕووداوەکانی داهاتوو کاریگەنە سەر ڕەوتی خەباتی سۆسیالیستی‌و چۆنیەتی بەدیهێنانی سۆسیالیزمیش، کەوابیٚ: سیستەمی سەرکەوتووی دوای جەنگی سارد مەیدانەکانی لەبەردەمدا باشتر لەجاران کراوەتەوە نەخشەکانی بچەسپێنیٚ. بەڕاستیش نەخشەکانی دەچەسپێنیٚ چونکە تەنانەت کۆسپەکانی لەمەوبەریشیان لەبەردەمدا نەماوە، جا سەرمایەداری بەو هەموو ناکۆکی‌و ململانێیەی لەبەرامبەریدا هەبوو سەرکەوتبیٚ، ئێستا بە تەختبوونی ئاقاری سیاسەتەکانی ئاسانتر سەردەکەویٚ، ئەو ناکۆکییە چینایەتی‌و سیاسیانەی دژیشی هەشن جاریٚ زۆر زۆریان ماوە مەترسی بخەنە سەر نەخشەکانی سەرمایەداری، بەڵکو زۆریان ماوە بارێکی بابەتی چینایەتی شۆڕشگێڕانە بخوڵقێنن.

خسڵەتێکی هەرە گرنگی دیاردە تازەکانی سەرمایەداری، لەبەریەک ترازانی یاساو ڕێسا ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسیەکانی سایەی جەنگی ساردە. هەروا سەرهەڵدانی دەرکەوتەی کۆمەڵایەتی نوی‌و دیاردەی شارستانی نوی‌و ڕووداوی سیاسیی نوێشە:

١/١- شورەوی‌و ئەورووپای ڕۆژهەڵات پاشەکشەیان کرد.
٢/١- ئەڵمانیاو ئەورووپای ڕۆژئاوا کاریگەرتر هاتنەپێش.
١/٢- چین‌و هیندی‌چینی کشانەوە.
٢/٢- ژاپۆن‌و دەوڵەتانی ئاسیای ڕۆژهەڵات گەشانەوە.
١/٣- شۆڕشی چەکداری درێژخایەن تێکشکا.
٢/٣- ڕاپەڕینی بەردەوام سەرخرا.
١/٤- ڕژێمە دیکتاتۆرو (دیموکرات شۆڕشگێڕەکان) ڕووخان.
٢/٤- پارلەمانی بۆرژوایی بوژانەوە.

سەرهەڵدانی ئەو دەرکەوتەو دیاردەو ڕووداوە نوێیانە وەکو هەموو مەسەلەیەکی دیکە لایەنی چاکەو خراپەیان تێدایە، لایەنە خراپەکانی خۆی لە چەوسانەوەی چینایەتی‌و جیاوازی میللی‌و ڕەگەزی‌و شارستانی‌و پیشەسازی‌و پێشێلی ئازادی‌و بوونی هەزاران تۆڕی جاسوسی‌و نا عەدالەتی‌و زوڵم‌و زۆری هەمەچەشنەیە، لایەنە چاکەکەیشی ئەوەیە کەوا: تەواوی ڕاستیەکان زاندران‌و سەردەمی چەواشە کۆتایی هات. ئیتر نە بەناوی سۆسیالیزمەوە مافی دیموکراسی‌و مرۆیی پێشێل دەکرێ‌و نە بەناوی سەرمایەداریشەوە ڕژێمە دیکتاتۆرو فاشیستەکان دەشێ پشتیوانی بکرێن.

جارێ سەرەتای قۆناغی دوای جەنگی ساردە زۆربەی ڕێسا کۆنەکان هەڵوەشان‌و گەلانی بەزۆر پەستێنراوی ناو قەڵەمڕەوەکان ڕابوون‌و سەربەخۆییان وەرگرت، یان لەڕێی سەربەخۆیی وەرگرتندان، خەسڵەتی هەرە زەقی سەرخستنی سەربەخۆیی ئەوگەلانە لەدوای جەنگی سارد دا ئەوەیە بەبێ شۆڕشی درێژخایەن بە ڕاپەڕین‌و ڕابوونی ناو شارەکان، لەماوەیەکی کەمدا سەرکەوتن. بەم سەرکەوتنانەش ئیدی بە ئەزموونی چەندین میللەت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات‌دا سەلما کەوا سەردەمەکە مژدەی گۆڕانکاری سیاسی کاریگەری بەخشیوەتە گەلان‌و مافە دیموکراسیەکان، هەرە گرنگیان ماڵئاوایی کردنە لە شۆڕشی درێژخایەنی پڕ لە زیان‌و بەزینی چەکداری‌و پێشوازی کردنە لە ڕاپەڕینی کەم خایەن‌و زووتر سەرکەوتن بەدیهێنەری گەلان.

بەمەش، واتا: بە کۆتایی سەردەمی جەنگی ساردو سەرهەڵدانی سەردەمی دوور لە ناکۆکیەکانی جەنگی سارد، نەک هەر خەباتی چەکداری لە ڕووی عەسکەرییەوە سەرکەوتنی ستەمە، بەڵکو لەڕووی سیاسیشەوە درێژەپێدانی شۆڕشی چەکداری وەکو ڕێبازی ستراتیژی سەرخستنی گەلانی ژێردەستە، زۆر دژوارە، چونکە ئەگەر لەگەرمەی جەنگی سارد دا لەناو ئەو هەموو ناکۆکیو کەلێنانەی لایەنەکانی ناو جەنگی سارد لایەک ئاوڕی سیاسی لە کورد نەدابێتەوە، ئەوا لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی سارد دا شۆڕشی چەکداری چەخت ناهێنێ.

لەبەشەکانی کوردستاندا شۆڕشی چەکداری ئێستاش باوە، کوردستانی بەشی ئێران خەباتی پارتیزانی هەیە بەلاَم خەباتێکی پارتیزانی پاشەکشەپێکراو بۆ پشتی سنوور، بەو شێوەش هێزە چەکدارەکانی کۆڕەپانەکە:

- حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.
- سازمانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران (کۆمەڵە).
- حیزبی دیموکراتی کوردستان (ڕێبەرایەتی شۆڕشگێر).

لایەنی کەمی بەرنامەی سیاسیو پێشمەرگەیی هاوبەشیان وەکو نییە، خراپتر لەوەش بارەگایەکیان لە کوردستانی بەشی ئێراندا جارێ پێ ناپارێزرێ کەچی سالَهایە دوچاری شەڕی براکوژی بوونو چارەسەرێکی بنەڕەتییان بۆ نەدۆزیوە. ئێستاش شەڕی (دیموکراتکوشتن!) لەنێوان هەردوو باڵەکەی دیموکراتدا بەردەوامە*.

لە کوردستانی بەشی تورکیاشدا، حەوت ساڵی ڕەبەقە جەنگی پارتیزانی بە ڕێبەرایەتی PKK و ڕێپێنەدانی لایەنەکانی دیکە بەردەوامە ئەو حەوت ساڵە کۆتایی جەنگی ساردو سەرەتایی دوای جەنگی ساردە، بەلاَم جارێ تاقە بارەگایەکی رزگارکراویان لەناو خاکی کوردستانی بەشی تورکیادا نییە.

دوازدە ساڵ جەنگی پارتیزانی لە کوردستانی بەشی ئێرانو حەوت ساڵیش لە کوردستانی بەشی تورکیا بەبێ ئەوەی شێوەی خەباتەکە لەپارتیزانییەوە بۆ جەنگی بزۆز (الحرب المتحرکە) گۆڕدرابێ، لایەنی کەم دەکرێ بڵێین لەو دوو بەشەی کوردستاندا بزووتنەوەی پارتیزانی لەناو بازنەیەکدایەو کردنەوەی ئەو بازنەیەش لەڕووی عەسکەرییەوە ئەگەر لەسەردەمی جەنگی سارد دا هەتا ڕادەیەک لەبارببوبێ

---

* ئەوشەڕە بێهودەیە لەنێوانیاندا لەکاتێکدا بەردەوامە کە هەموو لایەکیان باش ئاگادارن کەوا لە کوردستانی بەشی عێراقدا ئەو شەڕە چۆن گەیشتە بنبەستێکی خوێناویو بەناچاریش شەڕەکە ڕاگیرا

ئەوا دوای جەنگی سارد خزاوەتە بنبەست؛ تاقە ڕێگای شۆڕشگێڕانە (جگە لە ستراتیژی پارتیزانی) بۆ دەرچوون لە بازنەی داخراوی پارتیزانی گۆڕینی ستراتیژی چەکداری ڕزگاری کوردستانە لە شاخەکانەوە بۆ شارەکان: لە خەباتی چەکداریەوە بۆ ڕاپەڕین. جگە لەم ڕێگەیە مەگەر ڕێکەوتی جیهانیو ناوچەیی تەرازووی هێزی نێوان بزووتنەوەی پارتیزانیو دەوڵەتەکانی ئێرانو تورکیا بگۆڕێ دەنا مەحاڵە بەو بزووتنەوە پارتیزانییە لە کوردستانەوە ڕژێم بڕوخێ یان داگیرکەر ڕابماڵدرێ.

چارەیەک لەبەردەم هێزی پارتیزانی لەو دوو بەشەی کوردستاندا نییە جگە لەوەی ئەو توانا پارتیزانییەی هەیانە لەچوارچێوەی ستراتیژی دەربهاوونو بیکەنە ئامرازێکی عەسکەری تاکتیکی بۆ خزمەتی ستراتیژی ڕاپەڕین؛ ڕاپەڕینی بەردەوام لە شارەکانەوە. ئەمیش جگە لە ستراتیژی گەڵاڵە کراوی ڕاپەڕین، تاکتیکو دروشمو سیاسەتی وردی هەمەلایەنەی ڕاگەیاندنو ئیداری، تیۆری، سایکۆلۆژیو جەماوەری هەمەچەشنەی گەرەکە. هاوکاریو هاوپەیمانی، جموجۆڵی فراوانی جیهانیو ناوچەییو ئێرانیو تورکیاییو کوردستانی بێوچانی گەرەکە، دەبێ ڕکو کینەی ڕابردوو، هەڵەکان، کەموکووڕییەکان، دۆگمی خەباتی چەکداریو عەقڵیەتی خێڵەکی عەسکەری تێکڕا دەبێ بگۆڕدرێنو ڕۆژانە کار بۆ ئەوە بکرێ کە ستراتیژ کراوەتە ڕاپەڕینو بەو گیانەش جەماوەر گۆشی بەردەوام بکرێ.

## ٢/٩- ڕاپەڕینی کوردستان

ستراتیژی چەکداری ئەگەر لە هەرەسی شۆڕشی ئەیلوولدا لە هەموو بارێکی جیهانیو ناوچەییو عەسکەریو سیاسییەوە لە کوردستانی بەشی عێراقدا نەگەیشتبێتە بنبەستی سەرکەوتنو بارو بواری سەرلەنوێی خەباتی چەکداری، لەدوای هەرەسدا هەتا ڕادەیەک لەڕووی سیاسیو نەتەوایەتیەوە لە کوردستانی بەشی عێراقدا مابێتەوە ئەوا دوای ساڵەها خەباتی چەکداریو لەناو گەرمەی جۆرەها ڕووداوی گەورەو گچکەی جیهانو ناوچەکەو کوردستان هەژێن کە نەتواندرا ئەو بەشە خەباتە چەکدارییەی لەدوای هەرەسیش توانای کارپێکردنی مابوو بخرێتە خزمەتی ستراتیژی ڕاپەڕینی ناو شارەکان، خەباتە چەکداریەکە سەرباری هەڵکەوتنی چەندین ڕووداوی گەورە بۆ سەرکەوتنی (ڕووخانی ڕژێمی شاو جەنگی عێراق-ئێران) دوچاری شکستی پڕ لە گەورەترین قوربانی نەتەوەکانی سەر زەوی، شکستی ئەنفالەکان بوو.

لەدوای ئەنفالەکان، سیمای بزووتنەوەی چەکدارانەی گەلەکەمان سەراپا گۆڕدراو سەرجەم حیزبەکانی چەکداری کوردستان دوچاری کارەساتێکی ئەوتۆ بوون تاقە هیوایان ئەوە بوو لە ڕێی فشاری نێونەتەوایەتیو دیبلۆماسیەوە بتوانن دوای کۆتایی هێنانی جەنگی عێراق-ئێران ڕێ لە ڕژێمی عێراق بگیرێ کوردستان سەراپا ڕانەگوێزێ یان مفاوەزاتێکی نەرمیان لەسەر کەمترین خواستەکانی (بەرەی کوردستانی) لەگەڵدا بکا.

کورتییەکەی لەدوای ئەنفالەکانەوە هەتا داگیرکردنی کوێت، هەوڵی سیاسیو دیپلۆماسی هەرە گرنگی هێزەکانی بەرەی کوردستانی گەڕانەوە بوو بۆ ڕۆژگاری پاش هەرەسی ١٩٧٥ کە بەشێک لە سیاسەتمەدارانی ئەوسای کورد دروشمی (ڕزگار کردنی ئەوەی ڕزگار دەکرێ- انقاذ مایمکن انقاذە)یان بەرز کردەوە، ئینجا ڕژێم ئاوڕی لە هیچ لایەک نەدەدایەوە، بەڵکو خراپتر لە ١٩٧٥ی سەردەمی ڕێکەوتنامەی جەزائیر ڕەفتاریشی کرد چونکە لەو ڕێکەوتنامەیەدا ڕژێم لەڕووی عەسکەریەوە تێکشکاو بەناچاری سەری بۆ شای ئێران شۆڕ کرد، بەڵام لە ئەنفالەکاندا، دوای ڕاگیرانی جەنگی عێراق-ئێران، ڕژێم خۆی بەسەرکەوتوو دەزانی بۆیە دروشمی ناوبراو لەکاتی لاوازی ڕژێمی عێراقدا ١٩٥٧ قەبووڵ نەکرابێ، هەڵبەتە لەکاتی بەناو سەرکەوتنی عەسکەریو لەوپەڕی توانای عەسکەری فاشیەکاندا بەو هەمگە چەکە کیمیاوییەی هەیانبوو، دیار بوو ڕژێم ئامادەی کەمترین ڕێکەوتنی سیاسی نەبوو بەتایبەتی بەوپەڕی ڕقی فاشیانە سەیری پێوەندی هێزەکانی بەرەی کوردستانیو دەوڵەتی ئێرانیشیان دەکردو بە گەورەترین خیانەتی نیشتمانیان دەزانی، لەکاتێکدا واش نەبوو، بەڵکو گەورەترین خیانەت، ئەو جەنگە بێ ئامانە بوو کە ڕژێم دژی ئێران هەڵیگیرساند*.

ئەگەر بەراوردێکی شکستی عەسکەری ئەنفالەکان (١٩٨٨) لەگەڵ سەرجەم شکستەکانی مێژووی نەتەوەی کورد بکەین، بەهۆی گۆڕانکاریەکانی زەمینەو زەمانی ئەم شکستە لەچاو شکستەکانی ڕابردوو، شکستی ئەنفالەکان ترسناکترە.

---

* هەڵبەتە دەکرا تاکتیکی عەسکەریو سیاسی کاریگەرتر لەکاتی جەنگی عێراق - ئێراندا پێڕەو بکرابا، ئەمیش بەبێ یەکێتیو هاوکاری تەواوی هێزەکانی کوردستان مەحاڵ بوو.

لەدوای هەموو شکستێکی عسکەری ڕاپەڕینە چەکدارەکانی ڕابردوو لە سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا شۆڕشی ئەیلوولیش‌و بڕیاری بڵاوپێکردنی ڕاپەڕینەکان ڕاگەیێندراوە. لە شکستی ئەنفالەکاندا ئەگەرچی هەموو هێزە سیاسیە چەکدارەکانی کوردستان جگە لەهەڵەی ستراتیژی چەکدارییان بەدرێژایی ساڵانی پڕ لە ڕووداوی خەباتە چەکداریەکەی دوای هەرەسی ١٩٧٥ هەتا شکستی ئەنفالەکان، جگەلەوە سەرەڕای تەواوی تاوان‌و تاڵانەکانی درێژایی بزووتنەوەکە هەر لە جەنگی ناوخۆوە هەتا ڕەفتاری قێزەوەنی ناو خەڵک‌و زوڵم‌و زۆری ئاشکرای دزە دزێوەکانی پایە بەرزی ناو بزووتنەوەکە هەتا دژایەتی ڕاستەوخۆی ئازادی‌و دیموکراسی، سەرەڕای ئەوەی هەموو ئەو ڕاستیانە پەڵەی ڕەش ڕەشن لەم بزووتنەوە چەکداریەدا، وێڕاش دەبێ چەند ڕاستیەکی عسکەری‌و سیاسی هەن فەرامۆش نەکرێن‌و نەکرێنە خۆراکی ئارەزووی تیۆری چونکە هەتا ڕاستیەکان بەچاک‌و خراپیانەوە بابەتیانە تەتەڵە بکرێن هەنگی بەرپێی خەباتی داهاتوو ڕووناکتر دەکرێ. ڕاستیەکانیش ئەمانەن:

١- بۆرژوای کورد سەرەڕای شکستەکان‌و بەرپرسیاریان لە سەرجەم شەرمەزاری خۆیی بزووتنەوەی چەکداری ڕزگاری کورد لە شۆڕشی ئەیلوولەوە هەتا ئەنفالەکان، سەرەڕای ئەوەی ستراتیژی سیاسی‌و عسکەری ناو بزووتنەوەکەشیان لە زۆر ڕووەوە هەڵە بوو، بەڵام بە درێژایی ئەو ساڵانە بەردەوام بوون لەسەر داکۆکی لێکردنی ئامانجەکانی چینایەتی خۆیان، بەکردەوەش لە مەیدانەکەدا لەپێناوی ئەو ئامانجانە ڕەنجیان دەداو ژیانی خۆشیان دەخستە مەترسیەوە. لەکاتێکدا زۆربەی چەپەکان لەوان پاکتر بوون‌و بەرپرسیاری کەمترین تاوانیش نەبوون، بەڵام دووریان لە بزووتنەوەی پراکتیکی خەڵک‌و خولانەوەیان لە شەوارەی تیۆریدا، وای‌لێکردن سەرمایەی پاکیان بۆ نەبێتە سەرکەوتنی سیاسی، هەروا بەشێک لەو کەس‌و گروپانەی لەسەر چەپ بەناهەق ماڵ بوون، نیو چارەکی بۆرژوای کورد ئامادە نەبوون لەخۆیان ببوورن‌و گیانی خۆیان بخەنە مەترسیەکانی کۆڕی خەباتەوە.

٢- بەهێزبوونی‌هێزە بۆرژواکانی کورد سەرەڕای تەنگوچەڵەمە شکستەکانیان‌و لاوازتر بوونی چەپی کوردستانیش سەرەڕای کەمتر شکست‌خواردن‌و کەمی تەنگوچەڵەمەی سیاسیان، هۆیەکانی تەنیا بۆ تواناو پشتیوانی هێزە بۆرژواکان ناگەڕێتەوە، بەڵکو گرنگتر لەوانە، هۆیە ڕاستەقینەکانی ئەو ڕاستیانە دەگەڕێتەوە بۆ زەمینەی کۆمەڵایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی میللەتێکی ژێردەستە: بۆرژوا بزووتنەوەی بڵاوی جەماوەری میللی هەیەو چەپیش ئەوەی نییە.

٣- بۆرژوازی میللەتانی ژێردەستە لەسەرئاستی جیهانیشدا ڕێنسای ئابوری چینایەتی جیهانیان هەیە لەکاتێکدا کرێکاران‌و زەحمەتکێشان ئەوەیان نییە ئەوەی بەناوی ئەمانیشەوە هەشبوون، بەپێچەوانەوە دەرچوو!
٤- دوای شکستی ئەنفالەکان وا ڕەچاو دەکرا کەوا هەرەسێکی سیاسی‌و عەسکەری دیکە ڕابگەیەنرێ، بەڵام نەکرا. ڕانەگەیاندنی هەرەسەکەیش‌و درێژەپێدانی خەباتی پارتیزانی لەو ڕۆژگارە دژوارە کەموێنەیەی دێهاتی چۆڵ‌و هۆڵی کوردستاندا یەکێکە لە کارە باشەکانی (بەرەی-کوردستانی). هەموو ئەو مەفرەزانەی دوای ئەنفالەکانیش ئەرکەکانی ڕانەگەیاندنی هەرەسیان لە ترسناکترین ڕۆژگاردا ڕادەپەڕاند، ڕۆڵەی جوامێری گەلەکەمن*.

هەڵبەتە مانەوەی بەرەنگاری چەکداری دوای ئەنفالەکان لەپەنای پاشماوەی ناکۆکیەکانی عیراق-ئیران‌و سەرەتای سەردەمی نەمانی جەنگی سارد بوو کە ئیدی فشار دەخرایە سەر ڕژێمە دیکتاتۆرو فاشیەکانی وەکو عیراق. ڕژێمی عیراقیش لەپێشەوەی ڕژێمە فاشیەکان، کەوتبووە بەر ڕەخنە. دووریش نییە سیاسەتی مەزنخوازی‌و بەرنامەی عەسکەری بەعس‌و سەدام دوای کۆتایی جەنگی عیراق ئیران خرابێتە ژێر زەرەبینی لێکدانەوەی چۆنیەتی دابینکردنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵات‌و کەنداو دا.

ئەو خۆڕاگرتنەی (بەرەی کوردستانی) ئەگەر قازانجی سیاسی ئەوەی تێدا نەبوو ڕژێم ئاوڕی مفاوەزاتیان لێبداتەوە، ئەم قازانج نەکردنە نەک بە زیان نەگەڕایەوە بەڵکو بەڕاستی بوو بە گەورەترین قازانج‌و دوای داگیرکردنی کوێت بەرەی کوردستانی بەهۆی ڕاپەڕینەوە کردی.

ڕاپەڕین بەشێوەیەکی گشتی ڕاپەڕینێکی خۆڕسکی جەماوەری دژی فاشی بوو، هیچ لایەکی عیراق، کوردستانی، چەپ‌و ڕاست‌و ناوەڕاست، ڕاستەوخۆ بە نەخشەی سیاسی‌و ستراتیژی ڕاپەڕین، ڕاپەڕینەکەی بەرپا نەکردو دوای بەرپا بوونی ڕاپەڕینەکەیش ڕاپەڕینەکە ڕاستەوخۆ لەلایەن هیچ لایەکەوە ڕێبەرایەتی نەدەکرا.

حیزبە عیراقیەکان لە تەراوگەدا (مەنفا) بە زۆری لە ئیران‌و سوریادا چاوەڕێی ڕووخاندنی ڕژێمی عیراق بوون لە جەنگی کوێت‌دا هەتا هەر لایەکیان بە پشتیوانی

* دوای ڕاپەڕین هەندێ لەو پێشمەرگانەی پارتیزانی ئەنفالەکان، بێ بایەخ کران‌و لەسەر شانی ئەوان هەلپەرستەکان بەرزکرانەوە!

سووریا یان ئیران بینەوە ولات. (بەرەی کوردستانیش) بڕیاری بەرپا کردنی ڕاپەڕینی نەبووە بە زۆری ئومێدی بە ڕووخاندنی ڕژێم لە جەنگەکەدا هەبوو بەڵکو دۆخی جەنگەکەیان بە ترسێکی ئەوتۆ دەزانی تەنانەت لەکاتی گەرمەی جەنگەکەشدا کە ڕژێم تێکدەشکا پاشماوەی هێزەکانی بەرەی کوردستانی کە ئامادە کرابوون پەلاماری ڕژێمیان لە هیچ شارۆچکەیەکیش نەدەدا، ئەمیش هەم لەترسی دووبارە بوونەوەی کارساتی هەڵەبجەو هەم لەترسی مانەوەی ڕژێمو مفاوەزات کردن لەگەڵیدا لە پاش جەنگەکەدا، بەڵام ئەم سیاسەتەی بەرەی کوردستانی ئەوە ناگەیەنێ خۆیان بۆ هەلی دیکە ساز نەدەدا بەتایبەتی ئەگەر ڕاپەڕین بەرپا ببێ بەڵکو حیسابیش بۆ ڕاپەڕین کرابوو. کە ڕژێم بەزینی ئاشکرا بوو، ناڕەزایی هەناوی خەڵک هەتا دەهات زەقتر دەبوو. بەڵکو نیشانەکانی خرۆشانو ڕاپەڕین دەردەکەوتن. ئەودەم ئیدی ڕاگەیەندنەکانی (بەرەی کوردستانی) ئاشکرا خەڵکیان هانی ڕاپەڕین دەدا بەڵکو ... ... هێزەکانیان لە شارەکانیش نزیک کەوتنەوە. لەو هەموو بگرەو بەردەیەدا کە ... ... اوی جیهان بەهۆی جەنگەکەوە هەژا بوو، هێشتا ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی مشتومڕی ئەوەیان بوو کۆنگرە ببەستن یان نەبەستن!؟

کە ڕژێم بە تەواوەتی بەزیوجەماوەر ڕاپەڕین ئەوسا بۆ لەدەست نەدانی هەلەکە هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن بڕیاری بەستنی کۆنگرەی (بیروت)یاندا بەڵام کۆنگرەیەکی لاوازی بێ بەرنامە، پڕ لە ناکۆکی بێ سەروبەر، تەنانەت لە کۆنگرەکەدا ڕێکخراوو سیاسی ئەوتۆ قوت کرابوونەوە مەگەر نوێنەرایەتی خۆیان کردبێ دەنا هێلانەی چۆلەکەشیان لە عێراقو کوردستاندا نەبووە چ جای ڕێکخستنو جەماوەر!

## ٥٢- شکستی کاتیو... ئازادی

ڕاپەڕینەکە لەبەر ئەوەی خۆڕسکی بوو، بۆیە پڕ لە کەمو کووڕیش بوو. گەورەترین کەمو کووڕی ڕاپەڕینەکە نەبوونی بەرنامەی ڕاپەڕین بوو لەلایەن ئۆپۆزیسیۆنەوە، نەبوونی ئەم بەرنامەیە، ڕاپەڕینە خۆڕسکیەکەی دوچاری چەڵەمەی سیاسیو ڕاگەیاندنو ئاڕاستەی ڕۆژانە کردبوو، ئەو کەمو کووڕیانەش لەناو ڕاپەڕینێکی ڕێکخراودا ترسناکن چ جای بۆ ڕاپەڕینێکی خۆڕسکی. ئەمە جگە لە هەڵوێستی خراپی ئەمریکاو ڕۆژئاوا لە گەرمەی ڕاپەڕینەکەدا. دەتوانین بڵێین ناکامی سیاسەتی فاشیانەی ڕژێم لە هەناوی خەڵکدا دوای بێ هیوا بوون لە خەباتی چەکداریو نەڕووخاندنی ڕژێم لە جەنگی عێراق ئێراندا، باوەڕی ڕاپەڕین دروست

بوو بەڵام باوەڕێکی تازە سەرهەڵداوی موتوربە نەکراو بە بیری ڕاستی ڕاپەڕین و سەرکردایەتی شۆڕشگێڕی ڕاپەڕین. ئەم بیرە تازە سەرهەڵداوەی ڕاپەڕین لەبری ئەوەی لەناو پرۆسەی خۆیدا لە قۆناغی دوای شکستی خەباتی چەکداری نەشونمای سروشتی بکاو پێبگاو بە تەواوەتی بخەملێ، جاری پرۆسەکەی مابوو گەشە بکاو دۆخی شۆڕشگێڕانەی بخوڵقێ، داگیرکردنی کوێت و بەزینی ڕژێم لە جەنگەکەدا تەوژمێکی گەورەی دایە بیری تازەی سەرهەڵداوی ڕاپەڕینەکە لەناو خەڵکدا بەتایبەتی سووربوونی ڕژێم بۆ نەکشانەوە لە کوێت و سووربوونی دەوڵەتانی هاوپەیمانیش بۆ بەزاندنی ڕژێم، خەڵکی لە عێراقدا باوەڕ پێهێنابوو کە ڕژێم هەر دەڕوخێ. ئەم باوەڕە بە دیتنی لەشکری بەزیوی پاشەکشە پێکراوی عێراق ئاگری بەردایە باروتی قینی خەڵک دژی فاشیەکان، بەزوویش ئاگرەکە مەڵبەندە شیعە نشینەکان و کوردستانی گرتەوە.

شیعە؛ لەسەردەمی کەربەلای داستانی حوسێنی کوڕی ئیمام عەلیەوە باوەڕیان بە ڕاپەڕینی چەکدارانە هەیە. کوردیش خەباتی چەکداری کردۆتە سوونەتی ڕزگاری کوردستان. هەردوولاش دوای ڕاگیرانی جەنگی عێراق ئێران خەباتی چەکداریان شکستی خواردبوو، کەوابێ: ستراتیژی خەباتی چەکداری لەهەردوولادا نەگۆڕابێ و بەرنامەی ڕاپەڕین گەڵاڵە نەکرابێ، ڕاپەڕینەکە هەل بووە بەهێز بێنەوە مەیدانەکە بۆ بەدیهێنانی ستراتیژی چەکداریان. هەروەکو گوترا بەتایبەتی ڕووخاندنی ڕژێم لە دەستپێکردنی جەنگ لە کوێتدا بە مسۆگەر زاندرا، ئا لێرەدا لەم بە چەک دابەزینە مەیدانەی شیعەکان لە مەڵبەندە شیعە نشینەکان و هێزەکانی (بەرەی کوردستانی)ش لە کوردستاندا، دیسان ڕێبازی چەکداری زاڵکرایە سەر ڕاپەڕین بەڵکو ڕاپەڕین و ڕاپەڕینی چەکداری و خەباتی چەکداری بەچەشنێ تێکەڵاو کران ئیدی جیاوەر خرایە سەر ئەو باوەڕە کە بە خەباتە چەکداریەکە پاشماوەی سوپای بەزیوی عێراق تەفروتونا دەکرێ. ئەم زاڵکردنەی خەباتی چەکداریش بەسەر ڕاپەڕینەکە گەورەترین هەڵەی عەسکەری و سیاسی شیعەکان و (بەرەی کوردستانی) بوو لە گۆڕینی ڕێبازی ڕاپەڕین وەکو ڕێبازێکی شۆڕشگێڕانەی شارەکان.

ڕاپەڕینەکە خۆڕسکی بەرپاکراوە، بەرنامەی نییەو سەرکردایەتی دیارو دروشمی ناوەندی و ڕاگەیاندنی یەکگرتووی نەبوو، ڕێبەرایەتی قاڵبووی ناو ڕاپەڕینەکە دەرنەکەوتبوو، جاری ڕاپەڕینەکە مابووی تەواوی شارە گەورەو ناوەنجییەکانی عێراق بەتایبەتی (بەغداو موسڵ)و شارە نزیکەکانی بەغدا بتەنێتەوە؛ زۆربەی

هەرە زۆری خەڵک تێکەڵاوی ڕاپەڕینەکە نەبوون، هەروا هەڵگەڕانەوەی گەورە لە سوپای عێراقدا ڕووی نەدابوو کە ئەمەش مەرجی گرنگی ئیفلیج کردنی ڕژێم بوو، جارێ ئەو پێویستیانە تێکڕا مابوویان لەبری ئەوەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیو کوردستانی هەوڵبدەن ئەو پێویستیانە بە خزمەت کردنی ڕاپەڕینەکە بهێننەدیو کەمو کوڕییەکانی خۆڕسکی ڕابەڕینەکە هێندەی دەکرا قەرەبوو بکەنەوە، کەچی نەک ئەوەیان نەکرد بەڵکو دیسان بە عەقڵیەتی خەباتی چەکداری هاتنەوە مەیدان، لەکاتێکدا وەکو بۆ ڕاپەڕین بەرنامەیان نەبوو دوای شکستی عسکەری ئەنفالەکان لایەنی کەمی بەرنامەی عسکەری هاوبەشیش لەنێوان ئۆپۆزیسیۆنی عێراقیدا نەبوو، بەڵکو هەتا ڕاپەڕین (بەرەی کوردستانی)ش هیچ جۆرە گەلاڵەیەکی عسکەری هاوبەشیان نەبوو، هەرلایەک بەپێی سیاسەتی خۆی مەفرەزەی دەناردو دەهێنا!

زاڵکردنی خەباتی چەکداری بەو فراوانییەوە بەسەر ڕاپەڕیندا لەبری ئەوەی خەباتی چەکداری بخرێتە خزمەتی پەرەپێدانی ڕێبازی ڕاپەڕین، ئەگەر لەڕووی عسکەرییەوە دژی سوپای عێراق لێرەو لەوێ جەزرەبەیەکی لە ڕژێم دابێ، ئەوا لەدوو ڕووەوە زیانی کاریگەری گەیاند:

١- پەرەسەندنو فراوانکردنی ڕاپەڕین لەناو زۆربەی جەماوەرو لە زۆربەی شارەکانی عێراقو کوردستاندا ڕاگرتو خەڵک لەبری پشتبەستن بە بەردەوامی ڕاپەڕین، ئومێدیان بە سەرکەوتنی هێزی چەکداری لەڕووی عسکەرییەوە بەستەوە، ئەمە لەکاتێکدا گەوهەری سەرخستنی ڕاپەڕین لەوەدایە پەیتا پەیتا دەبێ جەماوەر لە دەوری بئاڵێو هەوڵیش بدرێ سوپاو دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم یان بهێندرێنە ڕیزەوە یان بێلایەنی بکرێن.

٢- زاڵکردنی خەباتی چەکداری بیانوی دایە ڕژێم سوپاو دەزگاکانی بەناوی دەستتێوەردانی بێگانەو داگیرکردنی وڵات تیژ بکاو بیانداتەوە بەگژ ڕاپەڕیواندا.

جگەلەم مەسەلەیەی خەباتی چەکداریو ڕاپەڕین، هەندێ مەسەلەی سیاسیو دیبلۆماسیو ڕەفتارو هەڵەی جۆراوجۆری دیکە ڕژێم قۆزتنیەوەو بەوپەڕی ڕەقەوە کەوتە دامرکاندنەوەی ڕابەڕین، لەوانە:

- بڕیاری ئەمریکا بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ ڕژێمدا لەوپەڕی شکستی ڕژێم لە ١٩٩١/٢/٢٨ کارێکی سایکۆلۆژی زیانبەخشی گەیاندە وورەی خەڵکو ڕژێمیشی والێکرد ڕاپەرموێ دڕایەتیەکەی بژیێنێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا خەڵک چاوەڕێ بوون

دەوڵەتانی هاوپەیمان هەتا رووخاندنی رژێم جەنگەکە رانەگرن، رژێمیش باش دەیزانی لە رۆخی چ دۆخێکی ترسناکدایە بۆیە لەو گفتوگۆیەدا هەرچی ئەمریکا گوتی رازی بوون!

- نواندنی راپەرینی خەڵکی خوارووی عێراق بە راپەرینێکی (شیعە ـ ئیسلامی) رۆژئاوای لە دووپات بوونەوەی ئەزموونی ئێران سڵەماندەوە، تایبەت رۆژئاوا جاری پێوەندیەکی ئەوتۆیان بە ئۆپۆزیسیۆنی عێراق و کوردستانیەوە نەبوو، هێزە لیبراڵی و مەزهەبییە دۆستەکانی خۆیشیان لاواز بوون.

- وەکو خەباتی چەکداری زاڵکرایە سەر راپەرین، بەرنامەیەکی عەسکەری رێکوپێک نەبوو هێرشێکی عەسکەری بەردەوام بکرێتە سەر هێزەکانی رژێم و مەترسی بخرێتە سەر بەغدا. بەپێچەوانەوە دوای چەندین سەرکەوتن بەتایبەتی لە کوردستاندا سیاسەتی بەرگری (نێگەتیف) گیرایەبەر، رژێمیش بە ئارەزوو لە کوێت کشایەوە و خۆی گرتەوە و پشێوی نەبوونی بەرنامەی عەسکەری قۆزتەوە و کەوتەوە پەلامار، قسابخانەی لە خوارووەدا نایەوە و لە کوردستانیشدا کارەساتی کۆچ رووی دا بەبێ ئەوەی سەدان هەزار چەکدار بتوانن بە ئەندازەی دوا شەرە قورسەکانی ئەنفالەکانیش بەربەرچی عەسکەری بدەنەوە!

- هەڵسوکەوتی دزێوی هێزە چەکدارەکان لە: دزی، رەفتاری ناشۆرشگێرانە، رێکنەخستنی جەماوەر، نەبوونی بەرنامەی خزمەتگوزاری و پەروەردەی سیاسی و دژایەتی چەپەکان.

- پێوەندی رێکنەخراوی ئۆپۆزیسیۆن و دەوڵەتانی دراوسێ و هەوڵیان بۆ پیادە کردنی نەخشەکانیان لەکاتی راپەریندا دژی رژێم.

ئەو راستیانە تێکرا لەناو راپەرینی خۆرسکیدا، راپەرینەکەیان وەکو راپەرینێکی ئازادیخوازانە نەکردە راپەرینی بەردەوام هەتا دوا ئامانجەکانی خەڵکی عێراق بەگشتی و گەلی کوردستان بە تایبەتی، ئەویش رووخاندنی فاشیەکان و هاتنە سەرکاری ئەڵتەرناتیڤێکی دیموکراسی کە بێ مەرج مافی چارەی خۆنووسینی کورد بە مافی جیابوونەوە و دامەزراندنی کۆماری سەربەخۆی کوردستانیش بسەلمێنێ.

سەرەرای دامرکانی راپەرینی سەراپای عێراقی، بەڵام لەم دەورانەی ژیانیشدا هەمدیس گەلی کورد لە کوردستاندا خەسڵەتی کوردستانی خۆی گەشاندەوە و توانی دوای نوچدانێکی کاتی و دوای کۆچەکە زۆربەی کوردستان ئازاد بکاتەوە و ئەو ئازادییەش جگە لە (کەرکوک و خانەقین و زەنگار...) لە زۆربەی کوردستاندا لە

سایەی دۆخێکی نوێی جیهانی سەردەمی جەنگی سارد لە ڕۆژهەڵاتدا، پارێزراوەو کراویشەتە سەنگەرێکی چارەنوس‌ساز دژی ڕژێم. بەکردەوەش سەلما کەوا ڕاپەڕین قۆناخێکی نوێیەو قۆناخەکەش درێژەی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و یاسایی هەیە.

## ٩/٥- کۆچ‌و مفاوەزات‌و پارلەمان

کاتێک ڕاپەڕین دامرکایەوە بە زەق‌و ڕەقی دەرکەوت کە تەواوی هێزە عێراقی‌و کوردستانیەکان بەو هەموو چەک‌و خەڵکە چەکدارەی لە دەوریشیاندا کۆبوونەوە، توانای تێکشکاندنی عسکەری سوپای بەعسیان نەبوو کە لە جەنگی کوێت‌دا بە خراپیش تێکشکێندرا بوو. ئەم ڕاستییە عسکەرییەش دوای سەپاندنی ڕێبازی عسکەری بەسەر ڕاپەڕیندا، دووەمین تۆباڵی مێژوویە لەسەر هێزە چەکدارەکان کە سیماو گەوهەری ڕاپەڕینەکەیان گۆڕی بە بەرەنگاری چەکداری‌و بۆ ئەم بەرەنگارییەش لایەنی کەمی بەرنامەی عسکەرییان نەبوو. دیسان ئەوەش دەردەخات کە هەموو لایەنەکان پێیان وابوو ڕژێم دەروخێ بۆیە خاترجەم بوون لە سەرکەوتن! ئەوە بوو گەورەترین کارەسات ڕوویدا، لە خوارووەدا زیاتر لە (٧٠) هەزار قەلاچۆ کران‌و لە کوردستانیش‌دا کۆچی گەل، کۆچی جێ‌هێشتنی کوردستان بەرەو سنوورەکان وەکو تراژیدیایەکی دەگمەنی مێژوو لە مێژووی گەلاندا... ڕوویدا.

کۆچی گەل لە کوردستاندا دوو هۆی ڕاستەوخۆی هەبوو:

یەکەمیان: دڕندایەتی فاشیەکانی عێراقە کە خاوەن شەرمەزاری وەکو هەڵەبجەو بازی‌و گوندە کیمیا باران کراوەکانی کوردستانە.

دووەمیان: بێ بڕوایی خەڵکە بە (بەرەی کوردستانی) کە بتوانێ بەر سنگی سوپای بەزیوی عێراق بگرێ.

ئاکامی ئەو دوو بڕوایە گەلی کورد بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کۆن‌و نوێدا بە گەلە کۆچ شارەکان‌و گوندەکانی بەجێ‌هێشت‌و لە گەرمەی کۆچەکەشدا، لە ڕۆژانە مردنی هەزاران منداڵ‌و دژواری بێ ئەندازی ژیانی خەڵکدا، میللەت هەموو هێزەکانی لە مەحەکی عسکەری‌و سیاسی‌و ئیداریدا! مەحەکەکەش دەریان خست سەرجەم هێزەکان جگە لە تێکشکاندنی عسکەری، جگە لەوەی دیسان پەنایان بردووە بەر هەواری وێرانی مفاوەزاتێکی سەیرو سەمەرە! لە ڕووی ئیداری خەڵکەکەشەوە زۆر کەم توانا بوون. لە هەفتەی یەکەمی کۆچەکەدا جەماوەر لە مەیدانی ئەزمونی نوێی کۆچدا زوو تێگەیشت کەوا (بەرەی کوردستانی) تەنیا

مفاوەزاتی بەدەستەو مفاوەزاتەکەیش ئاشکرا بوو کە رژێم دەستخەرۆیان دەکا.
دەنگو باسی مفاوەزاتەکەش لەسەر ئاستی دونیادا نەک پشتیوانی نەکرا بەڵکو
رای گشتی خۆرئاوای جیهانو دەوڵەتانی ئەوروپای رۆژئاوا پێیان سەیر بوو،
سەرکردایەتی (بەرەی کوردستانی) لەگەڵ بێزراوترین رژێمی جیهان بەو شێوەیە
مفاوەزات دەکا.

دیاربوو هەلومەرجەکە گۆڕانکاری سیاسی دیکەی بەدەمەوە بوو بۆیە کۆچەکە لە
کارەساتێکی گەورەوە گۆڕدرا بە پشتیوانیەکی خەیاڵی. بێ بڕوایی بە رژێمو
دەرکەوتنی بێ توانایی (بەرەی کوردستان)و زانینی سەرەتای هەڵوێستی پشتیوانی
لێکردنی کێشەی گەلەکەمان لەلایەن رای گشتیەوە، کاریان کردە سەر هەستو
هەڵوێستی جەماوەر؛ لەکاتێکدا وەفدەکانی (بەرەی کوردستانی) لە پایتەختدا بە
نەخشەی بەعسیانە دەهێندرایە سەر تەلەفزیۆنو گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکراو مژدەی
سەرکەوتنی بەو تریکانەی مفاوەزاتەکەیان لەگەڵ بەعسو (سەرۆک سەدام!)دا
رادەگەیاند، جەماوەری دڵسۆز، جەماوەری قاڵبووی راپەڕین، لە شارەکاندا کەوتنە
پەلاماردانی رژێمو بە هەزاران سەربازی بێ وەرەو بەزیویان بە چەپڵەو چەپۆک
دەگرتو زۆربەی شارەکانی کوردستانیان ئازاد کردەوە. هەمدیس (بەرەی
کوردستانی) هاتەوە مەیدانو زۆر جار پێشمەرگەی زەحمەتکێش بێ بڕیاری
سەرکردایەتیان پەلاماری رژێمیان لەگەڵ خەڵکەکەدا دەدایەوە، بەڵکو لەم
دەورانەشدا هەندێ لە لێپرسراوانی (بەرە) رقی خەڵکەکەیان دادەمرکاندەوەو
پێشیان لێدەگرتن پەلاماری دەزگای رژێم نەدەنەوە، تەنانەت تاوانباری گەورەی
رژێمیشیان لەدەست جەماوەر رزگار کرد! سەرئەنجامی گەرم بوونی پشتیوانی
جیهانیو هاتنی سوپای (هاوپەیمان) بۆ سنووری کوردستانو سوور بوونی جەماوەر
لەسەر دەرپەڕاندنی رژێم، ئیدی (بەرەی کوردستانی) گەڕانەوە شارەکانو دەستیان
بەسەردا گرتنەوە. بەمەش، لەماوەی دوو مانگدا دوو جار کوردستان کەوتە بەر
(بەرە) دووەمین جار ئاشکرا بوو کەوا رژێم وەکو جاری یەکەم ناتوانێ بێتەوە سەر
کوردستان چونکە بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان رێی نەدەدا. بۆیە دەبوو (بەرە)
یەکەمین کاریان بەڵکو ئەرکی هەرە گرنگیان بەپێی توانا دابین کردنی ئاسایشو
پاراستنی سەرو سامانی کوردو کوردستان بوو. هاوشانی چەسپاندنی دیموکراسیو
ئازادی. بەلام لە مانگی پێنجی دوای کۆچەوە کە کوردستان ئازادکرایەوە هەتا
بڕیاردانی پارلەمان دەکرێ بگوترێ لە رووی سیاسیو ئیدارییەوە، لە رووی پێوەندی

سیاسی‌و پاراستنی سامانی نیشتمان‌و میللەتەکەوە، لە ماوەی یەک ساڵی ڕەبەق‌دا دۆخی کوردستان لە نموونە خراپەکانی ئازادی میللەتان بوو: دزی، بێ‌سەروبەری، تاوان‌و تالان، مشەخۆری (چینی چەتە!) تەشەنەیان سەند، ئەمە لەکاتێکدا دەبوو بە پێچەوانەوە بوایە چونکە هێزەکانی (بەرەی کوردستانی) لەمێژووودا هێندە ژاراوی ژێرکەوتنیان چێشتبوو پێویست بوو ئەو دەستکەوتە وای لێکردبان بە دڵو گیان بە کردەوەو خزمەت کردنی خەڵک پەرۆشی پاراستنی بن.

لەگەڵ هەمو و ئەوانەش، زیانی کاریگەری سیاسی لەوەدا بوو کە قۆناخی دوای ڕاپەڕین وەکوو قۆناخێکی نوێ جارێ لای زۆربەی هێزەکان لێکنەدەدرابەوەو ئەرکەکانی نەدەزاندران، بگرە بە عەقڵیەتی شۆڕشی چەکداری ڕەفتاریان دەکردو خەڵکیان بەرێ دەبرد: گومرگی زۆر، سەیتەرەی بێ ژمار، هەزاران بارەگا، دیاردەی چەکداری، گوێ پێنەدانی دادگاو داوەری، گۆشەگیری حیزبایەتی... تاد. لە دیاردە زەقەکانی زۆربەی هێزەکانی (بەرە) بوون. ئیدی ئەرکە سیاسی‌و ئیداری‌و یاسایی‌و ڕۆشنبیریەکان تێکرا چارەکی پێویستیش ڕەچاو نەکران. ئەو دیاردانەش تێکڕا لەناو پرۆسەی پێویستیەکانی قۆناخی سیاسی نوێی دوای ڕاپەڕیندا هەتا دەهات زیانیان دەگەیاندە ڕاپەڕین‌و جەماوەرو شایەنی سیاسی گەلەکەمان لەناو ڕای گشتیدا. تەنانەت لەسەر مفاوەزات‌و دیاردە سیاسییە نوێکانی جیهان لەناو جەماوەرو هێزە سیاسیەکانیشدا ناکۆکی لەبنبەست نزیک دەکەوتن. واتە: لە خەتەری جەنگێکی ناوخۆی دیکە! جەماوەر دەپرسی:

- هەتاکەی پاشاگەردانی سیاسی؟
- هەتا کەی یەکنەخستنی هێزی پێشمەرگە؟
- هەتا کەی تالان‌و تاوان؟
- هەتا کەی هەڵنەبژاردنی دەسەڵاتێکی دیموکراسی‌و... هەتا کەی درێژەدانی مفاوەزاتێکی نەزۆک لەگەڵ ڕژێمێکیش‌دا کە بیست‌و دوو ساڵ بە جۆرەها مفاوەزات تاقیکراوەتەوە؟

ئەو هەموو پرسیارانە فشاری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و سایکۆلۆژی بوون بۆ سەر (بەرەی کوردستانی)و (بەرە)ش، لەناو خۆیاندا، تایبەت لەناو (یەکێتی)و پارتی)دا، دیدی ناکۆکیان هەبوو، لە دەرەوەی (بەرە)ش چەپ‌و غەیرە چەپیش توانای بڕیاری کاریگەریان نەبوو؛ چونکە، جگە لەوەی توانایان کەم بوو، بەو کەم توانایەش لەسەر لایەنی کەمی بەرنامەی هاوبەشیان ساغ نەدەبوونە. لایەنەکانی

دیکەی ناو (بەرە)ش، لەنێوان پارتی‌و یەکێتیدا، تەراتێنی پاراستنی بەرژەوەندی حیزبەکانیان دەکرد. ئەگەر پێشنیاری باشیشیان پێشکەش کردبێ گوێیان لێگیراوەو گوێیان نەدراوەتێ!

دوای ئەوەی کێشەکان خەریک بوون لە ڕۆخی دۆخی خەتەر بترازێن جگە لە فشاری جەماوەرو ترسی ناکۆکیەکان، پاڵەپەستۆی دەرەکیش بایی خۆی کاری کردە سەر هەڵوێستی سیاسی (بەرە)و دوا ئەنجامیش،بڕیاری هەڵبژاردنی پەرلەمان درا.

هەڵبژاردنی پەرلەمان، وەکو پرۆسەی هەڵبژاردن، وەکو پرەنسیپی هەڵبژاردن، وەکو ئەزموونێکی نوێی دیموکراسی لەناو گەلەکەماندا، یەکێکە لە دەستکەوتە سیاسیە دیموکراسیە بێ وێنەکانی میللەتانی ڕۆژهەلات. کەم میللەت هەیە بەو شەوق‌و پەرۆشییە بەپیر دیموکراسیەوە چوبێ، تایبەت لەناو میللەتانی دواکەوتوودا، بەڵام مخابن ئەو ئەزموونە کەم وێنەیە لەسەرەتاوە بە سەپاندنی ڕێژەی ٧٪ بۆ هەڵبژاردنی هێزە سیاسیەکان پەلەی کەمکردنی گیانی پەرۆشی دیموکراسی لکاندە پرۆسەی هەڵبژاردنەکە؛ ئەمە جگە لە (گزی‌و فزی) کردن لەکاتی هەڵبژاردندا بۆ بردنەوەی زۆربەی دەنگەکانیش هەتا ڕادەیەک هەڵبژاردەکەیان دزێو کرد... هەڵبەتە ئەمیش پێوەندی بە میللەتەکەوە نییە. سەرەڕای ئەوانەش پەرلەمانەکە سەرخراو ڕوو بە ڕووی ئەرکی سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌و دیبلۆماسی نوێ بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی ڕاپەڕین کرایەوە، ئەگەر ڕاگەیاندنی کوردستانی فیدراڵو بڕیاری دارشتنی بناخەی یەکخستنی هێزی پێشمەرگەو ڕێگرتن لە تەقینەوەی جەنگی ناوخۆ لەنێوان (پارتی)و (یەکێتی)دا لە کارە باشەکان بێ، ئەوا هێشتا ئەرکێکی ڕانەپەڕێندراوی زۆر لە بەردەم پەرلەمان‌و ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستاندا ماوون:

- ئابوری کوردستان نابوتەو ڕادەی بەرهەمهێنانی گشتی نزیکە لە سفر.
- بێکاری بۆ میللەتێکی وەکو کورد ڕەنگە بەرزترین ڕادە بێ لە ناوچەکەدا؛ کرێکارو زەحمەتکێشان لە هەموان زیاتر لە نەهامەتیدان.
- پاراستنی سنوورەکان لە جاسوس‌و پیاوخراپ‌و دز جارێ دابین نەکراوە.
- کۆنترۆل کردنی تەواوی پێویستیەکانی بەڕێوەبردنی کوردستان زۆری ماوە.
- تەندروستی نزمەو باقی پێداویستیەکانی خەڵک: ئاو، کارەبا، پاکی‌و خاوێنی، موچە، جادەو بان، پردەکان... هتد. هێشتا زۆریان ماوە.
- دێهاتی کوردەواری ١٠٪شیان وەکو پێویستە نەبوژاوون.
- نەخشەی خوێندن‌و پەروەردەی زانستی‌و نەهێشتنی نەخوێندەواری‌و بەرنامەی

کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری... هتد. گەلاڵەی دوای ڕاپەڕین نەکراوون... هتد.
هەڵبەتە جاریٚ ماوەی هەڵبژاردنی پەرلەمان زۆر نییە، بەڵام وێڕای دەکرا هەندیٚ لەو ئەرکانە جیٚبەجیٚ بکرێنو دەشبیٚ باقی ئەرکەکان بە خەباتی بێوچان بهێندرێنەدی.
لە ئەستۆگرتنی ئەرکی پەرلەمانو ئەنجومەنی وەزیران پێوەندی بە ڕادەی جیٚبەجیٚ کردنی بەرنامەی پەرلەمانەوە هەیە. هەمرو لایەکیش لە گەرمەی هەڵبژاردندا جۆرەها پەیمانو بەڵێنی داوەتە جەماوەر؛ دەبیٚ بشزاندریٚ ئەو جەماوەرەی سەرەڕای کێشەکانی ڕابردوو بڕوای بەخشیوەتە لایەنەکانی پەرلەمان چاوەڕوانە پێویستیەکانی بهێندرێتەدی. دەنا جەماوەر ئامادە نییە بەبیٚ بەدیهێنانی خواستەکانی لەسەر بڕوای پێشووی بمێنیٚ. ژیانی سیاسی ناو شار لەگەڵ خەباتی چەکداری شاخەکان جیاوازە؛ ئەگەر لە شاخەکاندا لە ترسی هێرشەکانی ڕژێمو چارەنووسی کورد جەماوەر زیاد لە ئەندازە بەرگەی کێشەکانی گرتبیٚ، هەروا ئەگەر لەناو شاریشدا بە حوکمی مانی بەعسو مەترسیەکانەوە، دیسان جەماوەر سۆزی سیاسیو نەتەوایەتیو خزمەتی ڕابردووی لەبەرچاو گرتبیٚ بەڵکو هەرچی چۆنی بووە لە مەترسی ڕژێم ڕزگاریان بیٚو بڕیٚ لە گرفتەکانیان چارەسەر بکریٚ، دەبیٚ بزاندریٚ وردە وردە بڕوای بەخشیندراوی جەماوەر بەو هێزانە، وێڕای بەدیهێنانی خواستەکانیان کەمتر دەبێتەوە. چونکە لەناو شاراندا ڕاستیەکان زووتر دەردەکەوونو ... هۆشیاریٚ جەماوەریش باشترە، شاخ ئەرکی شاخی هەبوو. شاریش ئەرکی شاریٚ هەیە، هەمیشەش گیروگرفتی خەڵک لە دوای ئازادی زۆرترین لە گیروگرفتی ڕێگای بەدیهێنانی ئازادیەکە.
هەروا... دەبیٚ بشزاندریٚ کەوا: هەڵبژاردنی پەرلەمانو ئەنجومەنیٚ وەزیران، یەکەمین تاقیکردنەوەی حکومەتی کوردستانی نین، حوکمڕانێتی شێخ مەحموودو کۆماری مەهاباد دوو ئەزموونی گۆست خراری پێشتری نەتەوەکەمانن. هەروا ئەم پشتیوانیە جیهانیەش لە کێشەی کورد یەکەمین جاری نییە لە مێژوودا، پەیمانی سیڤەرو پشتیوانی کۆماری مەهاباد لەلایەن شورەویەوە جاریٚ زیندوون... ڕاستە زەمانو زەمینە سیاسیو جیهانیو ناوچەییەکە گۆڕاون، ڕاستیشە ڕووداوەکانی مێژوو کەومت دووبات نابنەوە، بەڵام جگە لەو ڕاستیانە، ڕاستیەکی دیکەی چارەنووس‌ساز هەیە پێویستە هەردەم لەبەرچاو بیٚ... ئەویش ئەوەیە...
چارەنووسی میللەتان، بەدەست میللەتان خۆیانەوە، هەر میللەتێکیش هەڵکەوتی

وەکو ئەمەی کوردستانی بۆ هەڵکەوتبێ ڕێبەرەکانی نەیانتوانیبێ بە خزمەتو دەستکەوتو دیموکراسیو پێشکەوتن... دەستبەری ژێرنەخستنی هەڵکەوتەکە بکەن... ئاوا مێژوو لە هەر قۆناخێکدا بێ، زەمان هەرچی چۆنێ گۆڕدرابێ... مەترسی گەورە لەسەر ئەو میللەتە هەر هەیە... بەتایبەتی میللەتانی وەکو کوردی گەمارۆدراو.

١٩٩٢/١٢/٣

# پاشکۆی «١»

## بزووتنەوە چەکدارییە سەرکەوتووەکانی ساڵانی جەنگی دووەم بەدواوە

| میللەت | ساڵی هەڵگیرساندن | دژی | ساڵی سەرکەوتن |
|---|---|---|---|
| چین | ١٩٢٧ | ناوخۆ، ژاپۆن | ١٩٤٩ |
| ڤێتنامی باکور | ١٩٤٦ | فەرەنسا، ئەمریکا | ١٩٥٤-١٩٧٥ |
| لاوس | ١٩٤٦-١٩٦٠ | فەرەنسا، ئەمریکا | ١٩٥٤-١٩٧٥ |
| ڤێتنامی باشور | ١٩٤٦-١٩٦٠ | فەرەنسا، ئەمریکا | ١٩٥٤-١٩٧٥ |
| کۆریا | ١٩٢٧ | ژاپۆن، ئەمریکا | ١٩٥٢ |
| جەزائیر | ١٩٥٤ | فەرەنسا | ١٩٦٢ |
| کوبا | ١٩٥٦ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٥٩ |
| کامیرۆن | ١٩٥٧ | فەرەنسا | ١٩٦٠ |
| کاتانگا | ١٩٦٠ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٦٤ |
| ئەنگۆلا | ١٩٦١ | پرتوگال، ئەفریقای باشور | ١٩٧٥ |
| گینیا ب | ١٩٦٣ | پرتوگال | ١٩٨٣ |
| مۆزەمبیک | ١٩٦٤ | پرتوگال | ١٩٧٤ |
| گواتیمالا | ١٩٦١-١٩٦٨ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٨٠ |
| کامبۆج | ١٩٦٥ | ئەمریکا | ١٩٧٥ |
| نامیبیا | ١٩٧٠ | ئەفریقای باشور | ١٩٧٩ |
| رۆدیسیا | ١٩٧٢ | ئەپارتایت | ١٩٧٩ |
| نیکاراگوا | ١٩٧٢ | ئەمریکا | ١٩٧٩ |
| چاد | ١٩٧٦ | فەرەنسا | ١٩٨٠ |

## پاشکۆی «٢»

### بزووتنەوە چەکدارییە بەردەوامەکان

| میللەت | ساڵی هەڵگیرساندن | دژی |
|---|---|---|
| فیلیپین، پارتی کۆمۆنیست | ١٩٥٧ | رژێمی دیکتاتۆر |
| ئەریتیریا ........................ | ١٩٦١ | ئەسیوپیا |
| فەلەستین ........................ | ١٩٦٥ | ئیسرائیل |
| ئۆگاندا ........................ | ١٩٢٤ | ئەسیوپیا |
| لوبنان ........................ | ١٩٧٥ | ناوخۆ، ئیسرائیل |
| باسک (تیرۆر) ........................ | ١٩٧٥ | ئیسپانیا |
| ئیرلەندای باکور ........................ | ١٩٦٨ | ئینگلستان |
| کوردستان (عێراق) ........................ | ١٩٧٦ | بەعسی عێراق |
| سلڤادۆر ........................ | ١٩٧٦ | ناوخۆ، ئەمریکا |
| کەمبۆج ........................ | ١٩٧٨ | ناوخۆ، ڤێتنام |
| ئەفغانستان ........................ | ١٩٧٩ | ناوخۆ، شورەوی |
| کوردستان (ئێران) ........................ | ١٩٨٠ | کۆماری ئیسلامی ئێران |
| کوردستان (تورکیا) ........................ | ١٩٨٥ | رژێمی تورکیای |
| پیرۆ ........................ | ١٩٨٥ | ناوخۆ، ئەمریکا |
| تامیل ........................ | ١٩٨٦ | ناوخۆ، هیند |
| پۆلیساریۆ ........................ | ١٩٧٥ | مەراکش |

## پاشکۆی «٣»

### بزووتنەوە چەکداریە بەزێندراوەکان

| میللەت | ساڵی هەڵگیرساندن | دژی | ساڵی بەزین |
|---|---|---|---|
| ئیسپانیا (کۆماریەکان) | ١٩٣٩ | فەلانژیستەکان | ١٩٥١ |
| یۆنان | ١٩٤٧ | ناوخۆ، ئینگلستان | ١٩٤٩ |
| کوردستان ـ عیراق (بارزانیەکان) | ١٩٤٣ | رژێمی پاشایەتی | ١٩٤٥ |
| کوردستان ـ ئیران (کۆماری مەهاباد) | ١٩٤٦ | رژێمی شا | ١٩٤٦ |
| ئازەربایجان | ١٩٤٦ | رژێمی شا | ١٩٤٦ |
| تبت | ١٩٥٥ | چین | ١٩٥٩ |
| مالیزیا | ١٩٤٨ | ئینگلستان | ١٩٥٧ |
| کۆنگۆ | ١٩٥٨ | بەلژیک | ١٩٦٠ |
| پاراگوای | ١٩٥٩ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٦١ |
| دۆمینیگ | ١٩٥٩ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٦١ |
| سۆماترا | ١٩٥٧ | جکارتا | ١٩٥٨ |
| کۆلۆمبیا | ١٩٦٠ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٦١ |
| بەرازیل | ١٩٦١ | ناوخۆ | ١٩٧٠ |
| کوردستان ـ عیراق | ١٩٦١ | رژێمی عیراق | ١٩٧٥ |
| پیرۆ | ١٩٦٢ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٦٣ |
| ئیکوادۆر | ١٩٦٢ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٦٣ |
| ڤەنزوێلا | ١٩٦٢ | ناوخۆ، ئینگلستان | ١٩٦٧ |
| لۆئاندا | ١٩٦٣ | ناوخۆ | ١٩٦٤ |
| تانزانیا | ١٩٦٤ | ناوخۆ، ئینگلستان | ١٩٦٤ |
| کینیا | ١٩٦٤ | ناوخۆ، ئینگلستان | ١٩٦٤ |
| گابۆن | ١٩٦٤ | ناوخۆ، فەرەنسا | ١٩٦٤ |
| بۆلیڤیا | ١٩٦٥ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٦٧ |
| کوردستان ـ ئیران (مەلائاوارە ـ موعینی) | ١٩٦٧ | رژێمی شا | ١٩٦٨ |
| ئۆرگوای | ١٩٦٥ | ناوخۆ، ئەمریکا | ١٩٧٢ |
| زەفار (عەمان) | ١٩٦٨ | عەمان، ئینگلیز، ئیران، ئوردون | ١٩٧٦ |
| بۆروندی | ١٩٧٢ | ناوخۆ | ١٩٧٢ |
| ئەرژەنتین | ١٩٧٢ | ناوخۆ | ١٩٧٢ |
| بلوجستان | ١٩٧٣ | پاکستان | ١٩٧٧ |

## پاشکۆی «٤»

## ئەو دەوڵەتانەی قارەی ئاسیا لەپاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە خەباتی چەکداریان تێدا هەڵگیرساوە (٣٨ دەوڵەت)

| سەرکەوتووەکان | بەردەوامەکان | بەزێندراوەکان |
|---|---|---|
| ١- چین | ١- فیلیپین | ١- ئەندەنوسیا |
| ٢- ڤیێتنام | ٢- کەمبۆج | ٢- مالیزیا |
| ٣- کۆریای باکور | ٣- فەلستین | ٣- کوردستانی عێراق |
| ٤- لاوس | ٤- کوردستانی عێراق | ٤- بلوجستان ـ پاکستان |
| ٥- یەمەنی باشور | ٥- لوبنان | ٥- زەفار ـ عمان |
| ٦- کەمبۆج | ٦- کوردستانی ئێران | ٦- کوردستان ـ ئێران |
| | ٧- کوردستانی تورکیا | ٧- ئازەربایجان ـ ئێران |
| | ٨- سریلانکا ـ تامیل | |
| سەرجەم: | | |
| ٦ | + ٨ | + ٧ = ٢١ |

واتە لە کۆی (٣٨) دەوڵەتی ئاسیا، ٢١یان بەزێندراون و ٨یش بەردەوامن چارەنووسیان نازاندرێن، (٦)یشیان سەرکەوتوون کە کەمەکانیان.

## پاشکۆی «٥»

## ئەو دەوڵەتانەی قارەی ئەفریقا پاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە خەباتی چەکداریان تێدا هەڵگیرساوە (٥٢ دەوڵەت)

| سەرکەوتووەکان | بەردەوامەکان | بەزێندراوەکان |
|---|---|---|
| ١- جەزائیر | ١- ئەسیوپیا ـ ئەریتیریا | ١- بوورووندی |
| ٢- ئەنگۆلا | ٢- بوورووندی | ٢-تانزانیا |
| ٣- ئۆگەندا | ٣- پولیساریۆ ـ مەغرب | ٣- رۆئاندا |
| ٤- چاد | ٤- تەیموری رۆژئاوا (ئەندەنوسیا) | ٤- کۆنگۆ |
| ٥- زامبیا | ٥- ئۆگادان | ٥- مەغرب، مەراکش |
| ٦- زائیر | | ٦- کینیا |
| ٧- زیمبابوی | | ٧- کامیرۆن |
| ٨- ساحلی عاج | | |
| ٩- گینیا | | |
| ١٠- کینیا | | |
| ١١- گینیا بیساو | | |
| سەرجەم: ١١ | + ٥ | + ٧ = ٢٣ |

واتە لە کۆی (٢٥) دەوڵەتی ئەفریقا، لە (٢٢)یاندا خەباتی چەکداری بەرپاکراوە، (١١)یان سەرکەوتوون، (٥)یان بەردەوامە، (٧)یش بەزێندراون

## پاشکۆی «٦»

## ئەو دەوڵەتانەی ئەمریکای ناوەندی لەپاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە خەباتی چەکداریان تێدا هەڵگیرساوە (١٨ دەوڵەت)

| سەرکەوتووەکان | بەردەوامەکان | بەزێندراوەکان |
| --- | --- | --- |
| ١- کوبا | ١- سلڤادۆر | ١- جامایکا |
| نیکاراگوا | | ٢- دۆمینیکان |
| | | ٣- کۆستاریکا |
| | | ٤- گواتیمالا |
| | | ٥- هایتی |
| | | ٦- هیندۆراس |

سەرجەم: واتە لە کۆی (١٨) دەوڵەتی ئەمریکای ناوەندی لە (٩)یاندا خەباتی چەکداری بەرپاکراوە، (٢)یان سەرکەوتووە، (١)یان بەردەوامە، (٧)یش بەزێندراوە.

## پاشکۆی «٧»

### ئەو دەوڵەتانەی ئەمریکای باشور لە پاش جەنگی دووەمی جیهانییەوە خەباتی چەکداریان تێدا هەڵگیرساوە (١٢ دەوڵەت)

| سەرکەوتووەکان | بەردەوامەکان | بەزێندراوەکان |
|---|---|---|
| | ١- پیرۆ | ١- ئەرژەنتین |
| | | ٢- ئیکوادۆر |
| | | ٣- ئۆرۆگوای |
| | | ٤- بەرازیل |
| | | ٥- بۆلیڤیا |
| | | ٦- پاراگوای |
| | | ٧- کۆلۆمبیا |
| | | ٨- ڤەنزەوێلا |
| سەرجەم: + | ١ + | ٨ = ٩ |

واتە لە کۆی (١٢) دەوڵەتی ئەمریکای باشور لە (٩)یاندا خەباتی چەکداری بەرپاکراوە، هیچیان سەرنەکەوتوون، یەکێکیان بەردەوامە، (٨)یشیان بەزێندراون.

## پاشکۆی «٨»

### تەتەڵەی خەباتی چەکداری هەرچوار قارەکەی گۆی زەوی لەپاش جەنگی دووەمی جیهان بەدواوە :

| قارەکان | ژمارە | سەرکەوتوو | بەردەوام | بەزیوو |
|---|---|---|---|---|
| ئاسیا | ٤٨ | ٦ | ٨ | ٧ |
| ئەفریقا | ٥٢ | ١١ | ٥ | ٧ |
| ئەمریکای باشور | ١٢ | . | ١ | ٨ |
| ئەمریکای ناوەند | ١٨ | ٢ | ١ | ٦ |
| سەرجەم: | ١٢. | ١٩ | ١٥ | ٢٨ |

سەرنج:

لەو ئامارانەدا بە کردەوە بۆ چەندو چوون دەردەکەوێ کە خەباتی چەکداری پارتیزانیو شۆڕشی درێژخایەن، ئەگەرچی لەنیو سەدەی ڕابردوودا هەوڵدرا بکرێتە یاسای نەگۆڕی میللەتانی داگیرکراوو ژێردەستەی ئیمپریالیزم، بەڵام لەناو (١٩)یاندا سەرکەوتووە، لە (٢٨)یاندا کە زۆرترە لە سەرکەوتووەکان، ژێرخراوە، لە (١٥)شیاندا بە چارەنووسێکی نەزانراو بەردەوامە لەناو باقیەکەیاندا کە ٥٨ دەوڵەتن توخنی خەباتی چەکداری نەکەوتوون. بۆ قارەی ئەوروپاش دوای بەزینی شۆڕشەکانی یۆنانو ئیسپانیا، خەباتی تیرۆری باسکەکانی ئیسپانیاو ئیرلەندییەکانی لێدەرچێ، هیچ کام لە تیۆرسینەکانی خەباتی چەکداری لەم قارەیەدا لایەنگری بەرپاکردنی شۆڕشی چەکداری نەبوون، بۆیە دەوڵەتەکانی نەخراونەتە ناو نەخشەکان واتە لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا بە زۆری شۆڕشی چەکداری سەرکەوتون، کەمتر لە ناوچەیەکاندا بەردەوامنو لەپێش خراوەکانیشدا بەزیون.

سەرجەم شۆڕشەکانیش (٤٠)یان ناوخۆو دژی بێگانە بوون. (١٨)یان دژی ئەمریکاو (٧)یان دژی ئینگلیزو (٦)یان دژی فەرەنساو (٢)یان دژی ژاپۆن بوون.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوەی عەرەبی:


● ادغار ستو، النجم الاحمر فوق الصين، المراحل الاولى من تاريخ الثورة الصينية، ترجمة: كمال ابوالحسن و كمال ابو العزة.

● احمد نوري النعيمي، الدكتور، تركيا و حلف الشمال الاطلسي، المطبعة الوطنية، اردن ١٩٨١.

● اوليا نوفسكي ـ بافلوف، آسيا تختار، دار التقدم ـ موسكو.

● التقرير المركزي للمؤتمر القطري التاسع، حزيران ١٩٨١.

● جان اسمين، الثورة الثقافية الصينية، ترجمة: ذوقان قرقوط.

● جان بابي، القوانين الاساسية للاقتصاد الرأسمالي، ترجمة: لجنة من، شريف حتاتة، محمد خليل قاسم، سعد كامل، حليم طوسون.

● جان اللنشتين، تأريخ الظاهرة الستالينية، ترجمة: جوزيف سماحة.

● روجية دوبرية، ثورة في الثورة، ترجمة: الياس سحاب، الطبعة الاولى، كانون الثاني ١٩٦٨.

● كارل ماركس ـ فردريك أنجلس، البيان الشيوعي، دار دمشق للطباعة و النشر.

● الماركسية و حرب العصابات، ترجمة: ابراهيم العابد و ماهر الكيالي، المؤسسة العربية للدراسات و النشر ـ بيروت.

● ماوتسي تونغ، المؤلفات المختارة، المجلد الثاني، دار النشر باللغات الاجنبية، بكين ١٩٦٩.

● محمد حسنين هيكل، الحل و الحرب، شركة مطبوعات للتوزيع و النشر، بيروت ـ لبنان الطبعة الاولى ١٩٧٧.


## سەرچاوەی فارسی:


● آدينه، ژماره: ٢٩، آبان ١٣٦٧.

● ادوارد كرانشكاو، خاطرات سياسى خروشوف، مترجم: محمد رفيعى مهرآبادى.

● ارتور كند، يالتا يا تقسيم جهان، مترجم: محمد طلوعى، چاپ اول، پائيز ١٩٦٥.

● ارنستو چەگوارا در انقلاب (يا دو مقاله چاپ نشده) انتشارات مرواريد، مترجم: م.أ.رهجو.

● از لينين تا گورباتچف، مترجم: نگارش محمود طلوعى، سازمان انتشارات هفته، چاپ اول ١٣٦٧.

● ژارژ شاليان ـ ژان پيراژو، اطلس استراتيژيک جهان، ترجمه: د.ابراهيم جعفرى، انتشارات

